# گەشتەکەی زینۆفۆن

**ریکس وارنەر**

لە یۆنانی وەرگێڕاوە بۆ ئینگلیزی

**محمد مسعود محمد**

لە ئینگلیزی وەرگێڕاوە بۆ کوردی

**چاپی دووەم**

XENOPHONE
THE PERSIAN EXPEDITION
By Rex Warner

Translated to Kurdish by;
Mohamed M. Jalizada
jalizada@yahoo.com

وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر



ناوی کتێب: گەشتەکەی زینۆفۆن
وەریگێڕان لە یۆنانی بۆ ئینگلیزی: رێکس وارنەر
وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردی: محمد مسعود محمد
هەڵەچنی: ئامانج شاکەلی
نەخشەسازی بەرگ: ئامانج ئال ئەمین
چاپی دووەم ، چاپخانەی رۆشنبیری – هەولێر/ ٢٠١٢
چاپی یەکەم ٢٠٠٧،

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٣١٢) ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە

# پێشەکیەکەی ریکس وارنەر

تێگەیشتنی چیرۆکەکەی زینۆفۆن دەربارەی ئەو هەڵمەتە بۆ نێو وڵاتی فارس و گەڕانەوە بۆ یۆنان شتێکی ئاسانە و چێژی زۆرە، داستانێکە لە داستانەکانی سەرکێشی و توانای جەنگاوەرانە و کەسایەتیی جیاجیای پیاوان. بەڵام ئەگەر خوێنەر بنج و بناوانی ئەو سەردەمە بزانێت ئەوسا چێژێکی باشتر وەردەگرێت.

بەسەرهاتەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی چوارەمی پێش زایین. زینۆفۆن گەنجێکی ئەتینی بوو، و ئەگەرچی ئەتینا[1] تازە بە بەدەست سپارتا بەزیبوو[2] واش هەر مەڵبەندی سەرەکی بوو بۆ کولتووری یۆنان و تەنیا پێش ماوەیەکی کورت ئەتینا گەورەترین ئیمپراتۆرییەتی هەبوو لە بەشی خۆرهەڵاتی دەریای سپیدا. ئیتر سەردەمە زێڕینەکەی پێرکلیس و ژیانی نەرم و باوەڕبەخۆبوون و ئەوشتانەی ئەتینا یەکجاری بەسەر چوبوون. لەراستیدا ئەو تێگەیشتەی کە زینۆفۆن و خەڵکی ئەتینا هەیانبوو دەربارەی کەوا سیستەمی دیمۆکراسی بگێڕن و لەهەمان کات دەسەڵاتێکی ئیمپراتۆرییان هەبێت، ئەم خەونە نمونەیە باوی نەمابوو بەڵکو سەردەم سەردەمی ئەوە بوو کە رابەر، مرۆڤی شارەزا و پسپۆڕ و هەرکەس بەگوێرەی زیرەکایەتیی خۆی هەوڵ بدات. ئەگوڕانێك لەئارادا بوو، هەندێکی میراتی فیکریی جەنگە درێژەکەی ناوەخۆ مابۆوە کە ببوو بە مایەی سەرشێواندن و ئاڵۆزی، بیروباوەڕی ئەخلاقی و دینی و نیشتیمانی هەژابوون واش هەر لەو گێژاوەدا بناخەی فەلسەفە سەری هەڵدەدا. کێشەی نێوان شارە یۆنانیەکان هەر مابوو

---

[1] لە چاپی یەکەمی ئەم کتێبەدا (ئاراس- ٢٠٠٧) ناوی ئەم شارەم بە (ئەسینا) نووسی بەڵام لەم چەند ساڵەدا زانیم کەوا خودی خەڵکی یۆنان بە پایتەختەکەیان دەڵین (ئەتینا) بۆیە گۆڕیم. هەروەها ناوەکانی فارس و میدیم بەشێوازێکی کوردانە نووسی. سەبارەت بە ناوی (CYRUS) لە بەرگی یەکەمدا نووسیبووم (کۆڕش) بەڵام کە زانیم فارس پێی دەڵێن (کۆرووش) منیش ئەم شێوازەم پەسند کرد چونکە وەك چۆن حەز ناکەم بێگانەیەك دەستکاری وشەیەکی کوردی بکات، پێویستە ئێمەش دەستکاری وشەکانی ئەوان نەکەین.

[2] جەنگی ناوەخۆی یۆنان، ناسراو بە جەنگی پیلۆپۆنیز (٤٣١- ٤٠٤ پ.ز).

کەچی ژمارەیەکی زۆر لە بیرمەندەکان خەریکی لەوە بوون هۆیەکانی ئەو لاوازییەی شێوەژیانی هێلینی[1] بکۆڵنەوە. دەهات تێبگەن کە سەربەخۆبوونی شار و ناوچەکان بەگران لەسەریان دەکەوێت. دەیاندیت کەوا لەکاتێکدا ئەتینا و سپارتا خەریکی خۆبەخۆیی بوون تەنیا ئیمپراتۆریەتی فارس بە یەکگرتویی و بە هێز مابۆوە. پرسیاریان دەکرد ئایا ناکرێ یۆنانیەکانیش وەکو سەردەمی جەنگی ئازادی[2] پێکەوە بە یەکگرتویی بوەستن کەوا لە شەڕەکانی و سالامیس و پلاتێ و ماراتۆندا فارسیان بەزاند؟

لەو سەردەمەدا ئەوکەسانەی کە بیریان لە یەکیەتی دەکردەوە بەناچاری چاویان لە دەستی سپارتا بوو کە رابەرایەتیان بکات. سپارتی بالادەست ببوون و حوکمەتەکەی سپارتا دەسەڵاتی بەسەر تێکڕای کۆنە لایەنگرانی ئەتینادا سەپاندبوو. ئەو سەرکەوتنە گەورە سپارتای کردبوو بە هێزێکی بێ چەشن و دەرفەتێکی گەورەی هەبوو، کەچی سپارتا بەهیچ شێوە نەیتوانی سودی لێ وەربگرێت. خەون و ئومێدی یەکخستن و بەزاندنی وڵاتانی خۆرهەڵات دواتر لە بەختی مەکەدۆنییە مەیلەو خێڵەکیەکان بوو لەسایەی، فیلیپ و ئەسکەندەردا، بەڵام ئەوسا کێ باوەڕی

---

[1] هێلینی و هێلینیەکان واتە خەڵکی نێو یۆنان وێڕای ئەو خەڵکانەی کە خۆیان بە یۆنانی دەزانی بەڵام لە ناوچەکانی دەرەوەی یۆنان دەژیان، بۆنموونە گریکەکانی تورکیای ئەمڕۆ. لەراستیدا ناوی نەتەوەیی یۆنان هەر (گریك) بووە. لە عەرەبی پەتیدا گوتوویانە (اغریق) و میسرییەکان ئێستا دەڵێن (ئەگریك) بەڵام ئەم وشە تەنیا خەڵکی نێو یۆنانی دەگرتەوە، بۆیە وشەی (هێلین) واتایەکی فراوانتری هەیە.

[2] یۆنانی ئەوسا وەکو کوردستان بریتی بوو لەدەیان ناوچە. سێ لەهجەی سەرەکیان هەبوو (ئایۆنی، ئایۆلی، دۆری) هەر ناوچەیەك پایتەختێکی بچووکی هەبوو و کەس دڵی بەکەس نەدەدا. ساڵی ٥١٠ پ. ز. داریووش (شای فارس) هەڵمەتێکی گەورەی کردە سەر یۆنان. سەرکردەی لەشکری فارس پیاوێك میدی بوو بەناوی (فراوەرتیس) ناوبراو سیاسەتی ئەدەزانی و بەبێ سێ و دوو پەلاماری هەموووو شارە یۆنانیەکانی دەدا. ئەم هەڵەیە وای کرد زۆربەی شارە یۆنانیەکان پشتی ئەتینا بگرن کە لە هەموووویان پتر دژایەتی فارسی دەکرد، بەمەش توانیان یۆنان رزگار بکەن و ئەتینا لە ٤٨٧ پ.ز. بوو بە شاری سەرەکی وڵاتەکە. بەڵام هەندەی نەبرد کێشە ناوخۆیەکان دووبارە سەریان هەڵدایەوە تا لە ٤٣١ پ.ز کە جەنگی پیلۆپۆنیز بەرپا بوو. شایانی گوتنە کە دوو شاری زۆر گرینگ پشتی سپارتایان گرت دژی ئەتینا ئەمانەش کۆرەنت (لە خۆئاوای ئەتینا) و تیبە (پایتەختی بۆیۆتیا بوو لە باکووری ئەتینا). ئیتر لەو سەردەمەدا ئەتینیەکان هەستیان بە گومڕاهی و نائومێدی دەکرد.

دەکرد کە لەدوارۆژدا لەوهای لێ دێت؟ زینۆفۆن هەر ئەوەندەی دەدیت وا ئەتینا پشتی شکاوە و سپارتا هەستاوەتەوە. زینۆفۆن لایەنگری سپارتا بوو کەوا هەندێك لە ئەتینییەکانی سەر بە سۆکراتی فەیلەسوف ئەو رەوتەیان تێدا بوژابۆوە و بەچاوی بەرزەوە سەیری رەوشتی رەند و ئەریستۆکراتیانەی سپارتایان دەکرد. زینۆفۆن گەنجێکی ئاروزومەند بوو دەشیزانی کە ئەگەر دژ بە دەسەلاتی سپارتا بجولێتەوە ئەوا ئارەزووەکانی نایەنە دی. لەکۆتاییشدا لە ئەتینا شاربەدەر کرا و ژیانی لە پارچە ملکێك بەسەر برد کە سپارتی پێیان بەخشی، لەوێدا راوی دەکرد و خەریکی نووسینەوەی یاداشتەکانی خۆی بوو دەربارەی هەلمەتەکەی ولاتی فارس و دەربارەی تێگەیشتنی خۆی سەبارەت بەوەی کە پاشا دبێ چۆن بن (کەوا کۆرووشی کردبوو بە نمونەی هەرە بەرز) هەروەها دەربارەی توانا و تاکتیکە سەربازیەکان، لینجا دەربارەی ئەو رێزە گەورەی کە بۆ سۆکراتی دانابوو، ئەم شتانە لە نووسینەکانیدا رەنگیان دەدایەوە.

زینۆفۆن ئەگەرچی مەیلی بۆ سپارتا هەبوو بەلام لەناخدا ئەتینییەکی تۆخ بوو. لەمیانی ئەو گوتارانەدا کە بۆ جەنگاوەرکانی هاورێی خۆی دەگوت هەست دەکەین زینۆفۆن هەم حەزی لە گالتە دەکرد، و هەم حەزی لە پایەداری بوو. کاتێك کە روداوەکانی شیتەلْ دەکردەوە پێ دەگەشایەوە. لەلایەکی دیکەوە زینۆفۆن تێگەیشتن و زیرەکایەتییەکی هەمەلایەنیی هەبوو بەرانبەر بەو پیاوانە چونکە سەرکردە سپارتییەکان لەم بوارەدا زۆر بێباك بوون.

ئێمە نازانین ئایا چۆن دواتر لە سپارتییەکان نائومێد بووە و زانیویەتی کەوا سپارتا چارە بۆ گرفتەکانی ناوەکی و دەرەکی یۆنان ناکات (پابەندکرلی ناوەوە و بەزاندنی دەرەوە). گومان نیە کەوا سەرکردە سپارتییەکان لەبەر چاوی زینۆفۆن دابەزیبوون و هیچیان لەو نمونە نەبوون کە لە خەیالی زینۆفۆندا لەخشابوو دەربارەی (سەرکردە) کەوا دەبێ نەك هەر بەدەسەلات بێت بەلکو دەبێ بەجەرگیش بێت و دەبێ نەك هەر بە دەست و بازو بێت بەلکو دەبێ دەستپاکیش بێت. ئەم وێنە نمونەییەی خەیالی زینۆفۆن بەرانبەر بە (سەرکردە و رابەری) خۆی لە کۆرووشدا دۆزیوەتەوە (کۆرووش کە داواکاری تەختی پاشایەتیی فارس بو). دیارە ناوبراو کەسایەتییەکی وای هەبوە بای ئەوەی کە خەیالی گەنجێکی وەك زینۆفۆن پڕ بکاتەوە، زینۆفۆنێکی ئەوها کە

تەلەبەی سۆکراتی فەیلەسووف بوو و لە مشتومڕی سیاسی بێزار ببوو، ئیتر بەدوا خەیاڵی پاڵەوانەتی و هیواکانی خۆی کەوتبوو.

هەروەها مەسەلەی قەبارەی ئیمپراتۆرییەتی فارس، کەوا لە هیندستانەوە تا میسر و، لە قەفقاسەوە تا کەنداوی فارس پەلی کێشابوو، ئەم راستییە توشی شاگەشیی و سامی کردبوو. خۆ ئەگەر زینۆفۆن ئەتینی نەبایە رەنگبوو بگوترێ ئەو رایانەی بەرانبەر بە فارس بەهۆی مەیلی دڵییەوە گوتراون. هەروەها رەنگبوو بگوترێ ئەوە چونکە حەزی لە شکار بووە و لەگەڵ فارسەکان پێکەوە راویان دەکرد بۆیە شاگەشکەی دەسەلآت بوو و چاوی راستیەکانی نەدەدیت!. بەلآم هەرچۆنێك بێت، زینۆفۆن زانیارییەکی تەواوی دیار خستوە لەو خیانەتەی کە تیزافەرنە کردی[1] و تێگەیشتنێکی پوختی هەبوە کەوا ژیانی بنەماڵەی شاهەکانی فارس ببوو بە زنجیرەیەك کوشتن و پلانکێشی و ئیغتیال، حوکمیش لەژێر پەردەدا لەدەست ژناندا بوو، واش هەر دووبارە و سێبارە مەدحی فارس و رەوشتی رەندایەتی فارسی دەکرد و مەدحی ئەو هەستەی دەکرد کە فارسەکان هەیانبوو بەرانبەر شەرافەت و پیاوەتی، و مەدحی توانای شازادەکانی فارسی دەکرد. ئیتر کەسایەتی کۆڕووش لە خەیاڵی زینۆفۆندا پایەیەکی بەرزی گرتبوو.

کۆڕووش (ئەو شازادە فارسەی کە زینۆفۆن هەندە مەدحی دەکات) ئەمە برا بچووکی ئەرتەکسەرکیس (شاهنشای فارس) و لە هەمان کاتدا کوڕە نازدارەکەی پەریزاد (پەریزاد) بوو کە دایکی هەردووکانە. کۆڕووش بەوە ناسرابوو کە هۆگری چەکدارە یۆنانیەکان و سیستەمی سەربازیەکانی یۆنانی بوو بەتایبەتیش پیادەکانی هۆپلیت (Hoplites پیادەی زرێ قورس) و باوەڕی وابوو کە ئەوانە باشترین پیادەی جیهانن. پەلتاستەکان (Peltasts پیادەی سووك) کە لەسەر باڵەکانی هۆپیلیتەکان شەڕیان دەکرد، ئەم سیستەمە جەنگییە داهێنانێکی تازە بوو کەوا یۆنانیەکان لە جەنگی ناوخۆدا پەرەیان پێ دابوو و لە مەیدانەکانی شەڕی زەمینیدا گەیشتبوونە ئاستێکی بەرز.

---

[1] تیزافەرنە (سەرلەشکری فارس) کەسایەتیەکی زۆر گرینگی ئەم بەسەرهاتەیە.

کۆرووش زانیویەتی کە لە لەشکرکێشیدا توانای براکەی نیە، بەلام بیری کردۆتەوە ئەگەر تیپی یۆنانی بەکار بێنێت ئەوسا دەرفەتێکی گەورەی دەبێ بۆ سەرکەوتن. لە راستیشدا کۆرووش هەندەی نەمابوو سەرکەوێت و پسپۆڕانی مێژوو هێشتا مسۆگەریان نەکردووە ئایا شەڕەکەی کوناکسا Cunaxa چۆن بووە، بەلام هەرنەبێ دەزانین کە لەو شەڕەدا یۆنانیەکانی هێزە فارسەکانی بەرانبەر خۆیان بەزاندووە و هەندەی نەمابوو سەرکەوتنەکەیان ببێتە سەرکەوتنێکی یەکجاری. دواتریش سەلێندرا کەوا لە هیچ بەرەنگاریەکی راستەوخۆدا فارس نەیانتوانیوە پیادە یۆنانیەکان ببەزێنن. لەلایەکی دیکەوە لەشکری کۆرووش و یۆنانیەکان هێزی سوارەیان کەم بوو، ئەمە خالێکی لاوازی بوو کە زینۆفۆن باسی کردووە و ئومێدی دەکرد کە چارە بکرێت.

هەرچۆنێك بێت، خۆی تا سەردەمی ئەسکەندەر رۆژێك نەبوو یۆنانیەك بتوانێ سوپای فارس ببەزێنێت، لێرە ئەگەر زینۆفۆنێك و خیریسۆفۆسێك بە خۆ و بە پەلجا سوارێکەوە بچن بەگژ هێزی سوارەی فارسدا بچنەوە! ئەمە یاریەکی یەکجار ترسناك بوە. بەڵێ پیادە یۆنانیەکان هێزێکی نەبەز بورن، بەلام پیادە دەبێ هەمیشە خۆراك و پێداویستییان بۆ دابین بکرێت و هەمیشە مەترسی ئەوە لە ئارا دابوو کە پیادەکان دوا بکون یان دابڕێن و گەمارۆ بدرێن. ولاتی میسۆپۆتامیا لەشکرکێشی و هێزی پیادەی زۆر گەورەتری بەخۆوە دیتوە کە هەم ژمارەیان گەورەتر بووە و هەم جولەیان سووکتر بوە، بەلام گەڕانەوەی هێزێکی دەهەزار کەسی لە ناوچەی بابلەوە بۆ دەریای رەش، بە یەکپارچەیی و لەسەر شێوەی هێزێکی جەنگاوەری یەکگرتوو، ئەمە هەر لەخۆیدا ئینجازێکی گەورەیە.

نووسینەکەی زینۆفۆن ئەگەرچی هەلمەتێکی هەرە گەورەی جیهانی تێدا تۆمار کراوە، بەلام زینۆفۆن تەنیا ئەمەی نەنووسیوە و تەنانەت ئەمە لە کتێبە هەرە گرینگەکانیشی نیە. ئەم تۆمارە زیاتر بە یاداشتنامەیەکی رۆژانە دادەنرێت کەوا سەربازێکی لەشکرەکە تۆماری کردووە. لەم تۆمارەشدا تێگەیشتەی یۆنانیەکان دەبینین سەبارەت بە فەرمانڕەوایەتی و رەوشتبەرزی کە چۆن لەسەر زەمینەی راستیدا خورد دەکرێنەوە. دیار دەبێ کەوا لەکاتی تەنگانەدا پیاوە شایستەکان بۆ پایەی بەرپرسێتی هەلدەبژێردران و دەسەلاتیان پەسند دەکرا کەچی بەنەمانی مەترسییەکان مەسەلەی یەکگرتوویی یەکسەر دەپوکایەوە و دیسان کێشە و خۆبەخۆیی پەیدا دەبوونەوە. واتە

هەستە باشەکان تەنیا لەکاتی شکست و مەترسیدا خۆیان دەسەپاند. لەشکرەکەش لەشکرێك بوو لە تێکڕای خەڵکی یۆنان، زۆربەیان خەڵکی پیلۆپۆنیز بوون وەکو ئاخەیی و ئەرکادی[١]، بەڵام هەستێکی نیشتیمانیی گشتییان تێدا باو نەبوو بەڵکو ناوچەگەری توند و وێڕای هەستیارییەکی ترسناك سەبارەت بە سنوری هەر تاکە کەسێکی ئەو لەشکرە. یەك لەوانە، هەستێکی تەواو بە هەڵوێست و کەسایەتیی کاپتن ئاگاسیاسی ستیمفالی[٢] دەکەین کە زینۆفۆن باسی کردووە چۆن ناوبراو وێرایەتی سەرکردەیەکی سپارتی تووڕە بکات ئەو کاتەی کە نەیهێشتوە پیاوێکی خۆی بەدەستی ئەفسەرێکی سپارتی بگیرێت، ئەوەش چونکە ئاگاسیاس ئەفسەرەکەی بە ناپیاو دەزانی و ئەفسەرەکەش (ناپیاوەکە) سپارتی بوو بە ناوی دراکۆنیۆس Draconius[٣] کە لەکاتی خۆیدا پیاوێکی لەدەست کوژرابوو و ئیتر ئاوارە کرابوو و هەندێك گەتنی تریشی کردبوو. زینۆفۆن ئەو هەموو پێهەڵگوتنەی هەیە بۆ پیاوی پایەدار، کەچی لەهەمان کاتدا هەست و تێگەیشتن و وەسفێکی وردی هەیە بەرانبەر پیاوی ئاسایی. دیارە کە بە بەلاش نەگوتراوە "*هۆگری سەربازە ئاساییەکان بوە*".

زینۆفۆن هەر لەخۆیدا کەسایەتیەکی هەیە کە هەستت دەبزوێنێت، لەلایەکەوە خۆی بە بچووك گرتووە و لەلایەکی دیکەوە خۆی بە کەس نەداوە. ئایا بارەکەی بۆ خۆی قۆستۆتەوە کاتێك کە پرۆکسینۆس (برادەری خۆی بوو) لەگەڵ جەنەراڵەکانی دیکە کوژران؟ ئایا چ

---

[1] ئاخیا (Achaia) و ئەرکادیا (Arcadia) دوو ناوچەی گرینگ بوون لە باکووری سپارتا. وەك چۆن ئەمڕۆ ناوچەی گەرمیان یاخود بیتوێن و پشدەر جەگداریان زۆرە ئەوانیش بە هەمان شێوە بوون و هەریەك لە ئەتینا و سپارتا دەیانویست بەلای خۆیاندا رایانکێشن.

[2] مایەی سەرنجە کە یۆنانی وەکو کورد خۆیان بە شار و ناوچە دەناساند هەروەکو ئاگاسیاسی ستمفالی و زینۆفۆنی ئەتینی و هتد. تەنانەت کەس بە ناوی باوکی باس ناکرێت بەڵکو هەموووویان بەگوێرەی شار و ناوچەکانیان ناودەبرێن. ئەم دیاردە هێشتا لە کوردستان و عیراقیش بەگشتی زۆر زەقە کە دەگوترێ (فلان قەرداغی و فلان دۆسکی و فلان کۆیی) و هتد؟!!!

3 لێرەدا وارنەر هەڵەیەکی کردووە. چونکە ئەو ئەفسەرە سپارتییەی کە زینۆفۆن و برادەرەکانی رقیا لێ بوو ناوی (دێکسیپۆس Dexipus) بوو نەك دراکۆنیۆس. دواتر دەبینن کە زینۆفۆن زۆر بە خراپە باسی دەکات.

گوتارێکی زیرەکانەی خوێندۆتەوە و چ زیپك و توانایەك دیار خستوە؟ ئەدی چۆن بە دوودڵییەوە رابەرایەتی رەت دەکاتەوە؟ ئایا ویسعویەتی شارێك بدۆزێتەوە لەسەر دەریای رەش؟ کەواتە دەبێ بیزەنتەی بەدڵ نەبووبێت بۆیە بە نەرمی داوای لێبووردنی کردووە کە رابەرایەتی پێ ناکرێت بۆیە خۆی کشاندۆتەوە؟ هەروەها پێش ئەوەی بگاتەوە شوێنی خۆی هەندە دەستکورت بووە کە بەناچاری ئەسپەکەی فرۆشتوە، ئینجا پلانێکی زیرەکانەی دارشتوە و توانیویەتی گوزەرانێك بۆخۆی پێك بێنێت. هەرچۆنێك بێت زینۆفۆن ورد‌بین و زیرەك و (دینداریش) بووە و یەکێکە لە کسایەتیەکانی کە قسە و باسەکانی وا دەکەن شارەزاییەکی باشمان هەبێت دەربارەی خۆی و ژیانی. ئیتر سەیر نیە ئەگەر نوسەرێکی بەشی مێژووی زانکۆ کامبریج مەگەر هەر لەمە فێر بێت چۆن بەسەرهات و رووداوی مەزن بگێڕێتەوە.

## تێبینی دەربارەی وەرگێڕان.

پێویستە هەندێك زانیاری بخەمە رو لە چۆنەتیی وەرگێرانی ئەم کتێبە. من تا پێم کرابێت وشەی ئینگلیزیم بەکار هێناوە لەباتی وشەی یۆنانی و فارسی. بۆنمونە وشەی (پەرەسەنگ، Parasang)[1] ئەمەم کردۆتە میل (Mile) چونکە لەراستیدا پەرەسەنگ بەگوێرەی سروشتی زەوی و بەگوێرەی رۆژمێری بوە، جا لە شوێنێك بۆ شوێنێك دەگۆڕا.

وشە یۆنانییەکانی (هۆپلیت، Hoplete) و (پەلتاست، Peltast) لەمانەم وەکو خۆیان بەکار هێناوە چونکە ببوون بە بەشێکی گرینگی بابەتەکان. ئەم لیستەی خوارێش هەندێك وشەی ئەسڵی نووسینەکەن کەوا هاوتایەکی پڕبەپێستیان نیە لە ئینگلیزیدا بۆیە وەکو خۆیان بەکار هێنران.

بولیمیا، Bulimia: ناوی جۆرە نەخۆشییەك بە یۆنانی وا پێدەچێ بە کەسانێك گوترابێت کە توشی برسیاتی و سەرمایەکی تیژ دەبوون و توانای جوڵیان نەدەما. داریك، Daric: دراوێکی

1 واتە (فەرسەخ) کە هەموووو جیهانی ئیسلامی لە فارسیان وەرگرتووە و منیش بەباشم زانی هەمان وشە بەکار بێنم.

فارسیی زێڕین بووە. وەك چۆن شا لویس و ناپۆلیۆن ناوی خۆیان لە دراوەکان ناوە، ئەمش ئەوهایە[1]. نرخی داریك ئەوسا بەرانبەر پاوندێك ستەرلینیی ئەمڕۆ بووە.

ئیفۆر، Epher:

هۆپلیت، Hoplete: پیادەی زرێپۆشی قورس.

مینا، Mina: دراوێکە نرخی لەدەوری چوار پاوند بووە.

ماگادیس، Magadis: جۆرە زورنایەکی گەورە.

ئۆبۆل Obol: دراوێك بووە بە نیو نرخی داریك.

ستاتەری سیزیکۆس، Stater of Cyzicus: دراوێکی یۆنانی نرخی یەك پاوند بوە.

پەلتاست، Petast: پیادەی زرێپۆشی سووك.

تالەنت، Talant: وەزنەیەك بووە لە زیو نرخی ٢٤٤ پاوند دەبێت[2].

ریکس وارنەر

ئەتینا–١٩٤٦

[1] ئەم ناوە لە داریووش (دارا) هاتووە، وەك چۆن لەسەردەمی عوسمانیدا لیرە مەجیدی و لیرەی مەحموودی و ئەو شتانە هەبوون ئەمەش (داریك-دارایی) بە ناوی (دارا) لێدراوە.

[2] تالەنت قورساییەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سۆمەری و لە یاسا کۆنەکان پێرەو کراوە.

## چاپتەر -١-
# کۆرووش لەشکر پێک دێنێت

دارا و پەریزاد[1] دوو کوڕیان هەبوو، ئەرتەکسەرکیس[2] کوڕی گەورە و کۆرووش کوڕی بچووك. کە دارا نەخۆش کەوت و هەستی کرد کاتی هاتووە بەدوا کوڕەکانیدا نارد. ئەرتەکسەرکیس لەوێ بوو بەڵام کۆرووش دەبایە بەدوای دا بنێرن لەو هەرێمەی کە تێدا کرابوو بە شارەوان[3]. کۆرووش هەم شارەوان بوو هەم فەرماندەی گشتی هێزەکانی هەرێمی کاستۆلۆس Castolus بوو کە تێدا فەرمانڕەوایی دەکرد.

کۆرووش بەرەو پایتەخت بەڕێ کەوت بەیاوەری تیزافەرنە کە بە هاوڕێی خۆی دەزانی. ٣٠٠ هۆپلیتیان لەگەڵ بوو (پیادەی قورس) لەژێر فەرماندەیی زینیاسی پەرهاسیا. کە دارا دەمرێ، تیزافەرنە دڵی ئەرتەکسەرکیس لە کۆرووش کرمێ دەکات گوایە دەیەوێ تەختی باوکی

---

1 زۆربەی ناوەکان بە یۆنانی پاشگرێکی پێوەدەنێن و دەبێتە داریۆس و پەریزاتیس، و لە چاپی یەکەمدا بەهەمان شێوەم تۆمارم کرد، بەڵام لەم چاپەدا بە پێویستم زانی کە هەرنەبێ ناوە ئێرانیەکان وەکو خۆیان تۆمار بکەم. بۆ ئاگاداری خوێنەران.

2 ئەرتەسەرکیس (Artaxerxes) لە مێژوودا بە زۆر شێوە تۆمار کراوە. باوەڕم وایە ناوەکە بریتیە لە دوو برگە (ئەرت) بەواتای نرخدار بوو. بۆنموونە لە فارسی ئەمڕۆدا وشەی (ارجمند) و (ارزنده) بە واتای (بەهادار). جا دیارە لە کۆندا گوتوویانە (ئەردەشێر) واتە شێری پایەدار و بەهەمان شێوە ناوەکانی ئەردەوان و ئەردۆغان ئەرتەپاتا وهتد. برگەی دووەم (Xerxes) بەڕای من هەر دەکا (خوسرەو) چونکە پیتی X لە کۆندا بەرانبەر خ دەهات. ئیتر وشەکەش بە ئێوازی ئەمڕۆ دەبێتە (ئەرتەخوسرەو). شایانی گوتنە ناوی (زینۆفۆن-Xenophon) ئەمەش رەنگە لەئەسڵدا (خینۆفۆن) بووبێت بەڵام دواتر کراوەتە (ئێکسینۆفۆن) و ئینجا بەشێوازی ئینگلیزیی ئەمڕۆ X ی سەرەتایی دەکرێتە (ز) بۆیە ئەوهام نووسی.

3 وشەی (شارەوان) بەرانبەر وشەی Satrap بەکارم هێناوە، یۆنانی لە وشەی (شەهرەبان) ی فارسیی کۆنیان وەرگرتووە. کەواتە با خوێنەران لێیان تێك نەچێت لەنێوان (شارەوان) ی ئەمڕۆ و (شەرەبان) ی ئەوسا کە بە واتای (والی) دەهات.

بگرێتەوە. ئەرتەکسەرکیسی کۆرِرووشی دەستبەسەر کرد بە نیازی کوشتن بەلاّم دایکیان بۆی پاڕایەوە و گەڕاندییەوە سەر هەرێمی خۆی. پاش ئەو مەینەتە کۆرِرووش بریاری دا هیچی تر نەکەوێتەوە بەر دەسەلّتی براکەی و ئەگەر بکرێ شوێنی بگرێتەوە. دایکیان لەمێژ بوو کۆرِرووشی خۆشتر دەویست ئیتر پشتی گرت و هانی دا. کۆرِرووش دەسەلاّتی خۆی بەکار هێنا تەنانەت ئەو بەرپرسانەی کە لە پایتەختەوە دەهاتن وای لێ دەکردن پشتی بگرن، بایەخیشی بە خەلّکی دەوروبەری خۆی دەدا بۆ لەوەی بەنهێنی هێزی ناوچەیی[1] رێك بخات.

فەرمانی بە سەرلەشکری شارە جوداکانی هەرێمەکەی دا کە زۆرترین و باشترین چەکداری پیلۆپۆنیزی بەکرێ بگرن[2]. دیاربوو تیزافەڕنە خەریکی ئەوە بوو هێرش بۆ شارەکانی سەر بە کۆرِرووش بکات. شارەکانی ئایۆنیا Ionia[3] پێشتر لەژێر دەستی تیزافەڕنە بوون بەلاّم دواتر هەموو لای کۆرِرووشیان گرت تەنیا شاری میلەتۆس Miletus نەبێت. تیزافەڕنە خەلّکی میلەتۆسی ترساندبوو کە بەدوا کۆرِرووش نەکەون، هەندێك لە پلانگێڕکانی کوشتبوو و هەندێکی تری ئاوارە کردبوو. کۆرِرووش ئاوارەکانی وەرگرت و میلەتۆسی گەمارۆ دا و نیازی هەبوو لایەنگرەکانی خۆی دامەزرێنێتەوە. ئەمەشی کردە بیانگەیەك بۆ کۆکردنەوەی لەشکرێکی زۆرتر و نامەی بۆ براکەی نارد کەوا بەبۆنەی ئەوەی کە برایەتی، دەبێ دەسەلاّتی ئەو هەرێمە بدرێتە خۆی نەك بۆ تیزافەڕنە. لێرەدا دایکیشیان رۆلّی خۆی گێڕا و دەرەنجام شا نەیدەزانی چ

---

1 وشە (ناوچەیی) بەرانبەر (Natives) بەکار هێنراوە. ئینگلیز کە ولاتێکی زۆریان داگیر کردووە، بەخەلّکی نیشتەجێی ئەم ولاتانەیان گوتوە ناتیفەکان. دیارە یۆنانییەکانیش لەکاتی خۆیدا وشەیەکی تایبەتییان بەکار هێناوە بەرانبەر خەلّکی نا یۆنانی. لەم کتێبەدا وشەی (ناوچەیی، ناوچەیەکان) زۆر بەکار دێت بەرانبەر میدی و فارس و ئەنەدۆلّییەکان و... هتد. بۆ ئاگاداری خوێنەران.

2 نیمچە دورگەی پیلۆپۆنیز Peloponnese یەکێکە لە بەشە گرینگەکانی ولاّتی یۆنان. شاری سپارتا لەناوەندیدا بوو، باکورەکەشی بە ناوچەکانی ئاخایا و ئەرکادیا ناسرابوون کە چەکداریان زۆر بوو و پاش جەنگی ناوەخۆی یۆنان زۆربەیان بێ کار ببوون.

3 واتە بەشی خۆرئاوای ئەنەدۆلّ. لە راستیدا وشەی یۆنان لە (ئایۆنان-ئایۆنیا) وەرگیراوە دەنا یۆنانی و ئەوروپایی بە یۆنان دەلّێن گریس.

لەئارا دایە، وای دەزانی ئەو لەشکرەی کۆڕووش دژی تیزافەرنە کۆ کراوەتەوە بۆیە هەندە بایەخی پێ نەدا. هەرنەبێ کۆڕووش باجی شارەکانی بۆ پایتەخت دەنارد، کەچی کە تیزافەرنە فەرمانڕەوا بوو باجەکەی بۆ خۆی گل دەدایەوە.

هێزێکی تر بۆ کۆڕووش لە ناوچەی خەرسۆنیز، ئەوبەری رووباری ئەبیدۆس، ساز کرابوو. ئەمەش چۆن ساز کرا؟ کلیرخۆسی سپارتی[1] ئاوارە کرابوو. کۆڕووش کلیرخۆسی دیت و بەدڵی بوو، هەستا داریکی پێ دا. کلیرخۆس بەم پارە لەشکرێکی لە خەرسۆنیز ساز کرد بۆ شەڕی تراکیەکان لە باکووری هێلیسپۆنت Helespont[2] لەو شەڕەدا یۆنانی سەرکەوتن و لەئەنجامدا یۆنانیەکانی شارەکانی هیلەسپۆنت لەخۆڕا پارەیەکی زۆرتریان پێشکەش بەم هێزە نوێیە کرد. بەوەش لەشکرێکی تر بۆ کۆڕووش رەخسا کە کەس گومانی لێ نەبوو ئایا سەر بە کێیە؟

ئەریستۆپۆسی تێسالی[3] برادەری کۆڕووش بوو، کێشەی لەگەڵ تاقمێکی دیکەی ناوچەی خۆی هەبوو. ناوبراو هاتە لای کۆڕووش و داوای ٢٠٠٠ چەکدار و مووچەی سێ مانگی لێ کرد کە پێشەکی بیدرێتێ بۆ ئەوەی نەیارەکانی خۆی ببەزێنێت. کۆڕووش هەستا ٤٠٠٠ چەکدار و پارەی شەش مانگیشی پێ بەخشی و داوای لێ کرد کە بەهیچ جۆرێك لەگەڵ

---

1 کلیرخۆسی سپارتی کەسایەتیەکی زۆر گرینگی ئەم بەسەرهاتەیە. هەمووو تەمەنی لە جەنگ بەسەر بردبوو، ئیتر کە جەنگ ناوەخۆی یۆنان وەستا نەیدەزانی چۆن ژیانی شارستانیی بەسەر ببات و لە خۆڕا شەڕێکی دەدۆزیەوە و دواتر بە بەدەستی تیزافەرنە کوژرا.

2 تراکیا دەکاتە ولاتی بولگاریای ئەمرۆ. ئینگلیز دەڵێن Thrace عەرەبیش پێیان گوتوە (تراقیا). یۆنانی بە ناوچەیەکی عەشایەریی دواکەوتویان دەزانین.

3 تێسالیا Thesalia ناوچەکەی شاری سالۆنیك لە باکوری ئەتینا. یۆنانی بە دوو شێوە ناوی دەبەن. (سالۆنیك) یان (تێسالونیکی). دیارە ئەمەیان رەسەنترە کەوا ئاماژە بە ناوچەکەی خۆی دەکات (تێسالیا). هەروەها هیلەسپۆنت دوورگەیەك بوو لە زارکی دەربەندی دەردەنیل.

نەیارەکان ئاشت نەبێتەوە تا ئەو پێی دەڵێت. ئیتر لە تێسالیاش لەشکرێکی تر بە نهێنی بۆ کۆرِووش ساز کرا.

کۆرِووش فەرمانی بۆ برادەری خۆی پرۆکسینۆسی بۆیۆتی[1] ئاردبوو کە بە خۆ و بە هەرچی چەکداری هەیەتی بێتە لای گوایە هەڵمەتێك دەکاتە سەر پیسیدیەکان کەوا دەمێکە کێشەی بۆ دروست دەکەن. هەروەها بەدوا سۆفەینەتۆسی ستیمفالی و سۆکراتی ئاخەییدا نارد گوایە دەیەوێ یارمەتیی ئاوارەکانی شاری میلەتۆس بدات دژی تیزافەرنە. پرۆکسینۆس و سۆکراتی فەرمانەکەیان بەجێ گەیاند.




---

[1] پرۆکسینۆسی بۆیۆتی ئەو کەسە بوو کە بەدوا زینۆفۆنیدا نارد بۆ ئەوەی لەم هەڵمەتەدا بەشداربێت بەئومێدی ئەوەی کە هەندێك پارەی دەست بکەوێت، دەنا زینۆفۆنێکی ئەتینی گەنجێك شارستانی و مەیلەو هەژاریش بوو و هیچ ئەزموونێکی ئەوتۆی نەبوو لە جەنگ و سەربازیدا.

## چاپتەر -٢-
## لە ساردیس بۆ تەرسووس

کۆرووش کە زالی کاتی هەڵمەت هاتووە، وای نواند گوایە دەیەوێ ناوچەی پیسیدیا سەرکوت بکات و ئەگەرچی ئەوان هاوولاتیی هەرێمی خۆی بوون، کۆرووش لەشکری ناوچەکانی خۆی و لەشکری یۆنانیشی کۆکردەوە. فەرمانی بە کلیرخۆس دا کە بە هەموو هێزەکەیەوە ئامادە بێت و فەرمانی بە ئەرستیپۆس دا کە لەگەڵ نەیارەکانی ئاشت بێتەوە و خێرا بێتەوە لای. زینیاسی ئەرکادی، فەرماندەی هێزە بەکرێگیراوەکانی شارەکانی خۆی بوو، فەرمانی پێ دا کە هەموو هێزەکانی کۆ بکاتەوە و ئەو هێزانەی کە شاری میلەتۆسیان گەمارۆ دابوو با هەموویان بانگ بکاتەوە و ئەوانەی کە ئاوارە کرابوون هانی دان کە رەگەڵی[1] بکەون و بەڵێنی دا کە پاش هەڵمەتەکە دانەنیشێت هەتا شارەکەیان دەگرێتەوە و دایاندەمەزرێنێتەوە. بەناچاری باوەریان بە کۆرووش کرد و لەگەڵ هێزەکانیان هاتن بۆ شاری ساردیس. ئیتر زینیاس بە ٤٠٠٠ هۆپلیتی شارەکانەوە گەیشتە ساردیس. پرۆکسینۆس ١٥٠٠ پەلتاستی هێنا، سۆفەیلەتۆسی ستیمفالی بە ١٠٠٠ هۆپلیتەوە و سۆکراتی ئاخەیی بە ٥٠٠ هۆپلیتەوە هاتن. پاسیۆنی مەگەریانی و سۆکرات ٣٠٠ هۆپلیت و ٣٠٠ پەلتاستیان هەبوو لەو هێزەی کە شاری میلەتۆسیان گەمارۆ دابوو.

لێرەدا تیزافەرنە هەستی کرد کە ئەو هەموو هێزە تەنیا بۆ ئەوە نیە پیسیدیا سەرکوت بکەن، ئیتر خێرا بە ٥٠٠ سوارەوە خۆی گەیاندەوە لای شا. کە شا قسەی تیزافەرنەی بیست یەکسەر خۆی بۆ بەرەنگاری ساز کرد.

کۆرووش و هێزەکانی لە ساردیس بەرێ کەوتن. کۆرووش بە سێ رۆژ ٦٦ فەرسی بری و گەیشتە رووباری مەیەندەر، رووبارەکە ٢٠٠ پێ بەرین بوو و پردێکی دار لەسەر هەفت بەلەم دروست کرابوو و بەنێو رووبارەکەدا رایەڵ کرابوو. پاش ئەو رووبارە بە یەک رۆژ ٢٤

[1] رەگەڵ ، واتە (التحاق) یان Join.

فەرسەخی بڕی تا گەیشتە شارە گەشەکەی کۆلۆسای (پایتەختی ناوچەی فریجیا) و هەفت ڕۆژ لەوێ مایەوە. مێنۆنی تێسالی بە ١٠٠٠ هۆپلیت و ٥٠٠ پەلتاستەوە گەیشتە وێ، و چەکدارەکان خەڵکی دۆلۆپ و ئەنیان و ئۆلینتیا بوون. ئینجا لەوێوە بە سێ ڕۆژ ڕێپێوانێکی ٦٠ فەرسەخی کرد تا شارە گەشەکەی سێلێنێ کە لەوێدا پارک[1] و سەرای گەورەی هەبوو پڕ لە ئاژەڵی کێوی. کۆڕووش ئەگەر حەزی لە شکار بایە، لەوێ خۆی و ئەسپەکەی ڕادەهێنا. ڕووباری مەیەندەر بەنێو پارکەکەدا دەڕوات و هەندێك کانیاو لەنێو سەراکە هەڵدەکوڵێن. ڕووبارەکە بەنێو شارەکەشدا دەڕوات، سەرایەکی شا هەر لەو شارەدا هەیە کەوا لە شوێنێکی بەرز و قایم دروست کراوە و ڕووباری مارسیاس لەبن قەلاتەکە هەڵدەکوڵێت. ئەم ڕووبارەش هەر بەنێو شاری سێلێنێدا دەڕوات و لە ڕووباری مەیەندەر دەکاتەوە. ڕووباری ماسیاس ٢٥ پێ بەرینە. شایانی گوتنە کە ئەو چیرۆکەی کە دەڵێ (خواوەند ئەپۆلۆ کە گرەوی خۆی لە مەیدانی حیکمەت و ژیریدا بردۆتەوە) چیرۆکەکە دەڵێ گوایە ئەپۆلۆ لێرە بەسەر ڕووباری مارسیاسدا فڕیوە و کەوڵەکەی لەم شوێنە هەڵواسیوە کە کانگەی ڕووبارەکانی لێیە، بۆیە ڕووبارەکە پێی دەگوترێ مارسیاس. هەر لێرەشدا سەرکیس Xerxes کە لە یۆنان بەزیوە هاتۆتەوە ئێرە و ئەم قەلات و سەرایەی دروست کردووە بۆ خۆی.

کۆڕووش ٣٠ ڕۆژ لەوێ مایەوە. کلیێرخۆس، ئاوارە سپارتییەکە، بەخۆ و بە ١٠٠٠ هۆپلیت و ٨٠٠ پەلتاست و ٢٠٠ تیرەندازی کریتی گەیشتە جێ. هەروەها سۆسیسی سیراکۆزی بە ١٠٠ هۆپلیتەوە و سۆفەینەتۆسی ئەرکادی بە ١٠٠٠ هۆپلیتی ترەوە گەیشتن. جا لێرەدا کۆڕووش سەرژمێرێکی یۆنانییەکانی کرد. ژمارەی کۆتایی گەیشتە ١١٠٠٠ هۆپلیت و نزیکەی ٢٠٠٠ پەلتاست.

لێرەوە بە دوو ڕۆژ ٣٠ فەرسەخی بڕی تا شارە ئاوەدانەکەی پێلتای، سێ ڕۆژ لەوێ مایەوە تا زینیاسی ئەرکادی زەماوەندی وەرزشە لیکایان Lycaean بگێڕێت. کۆڕووش بەخۆی ئامادە بوو و تارای زێڕینی پێ بەخشی. لەوێوە بە دوو ڕۆژ ٣٦ فەرسەخی بڕی تا گەیشتە بازاڕی

---

[1] پارك Park لێرەدا بەواتی باخچە و ملکێکی گەورە هاتووە، بۆنموونە گوندێك بە هەمووو زەوییەکانیەوە پێی دەگوترا پارك.

قاپکەران Poters، شارێکی ئاوەدانە و ئاخیر شارە پێش ئەوەی کە بگاتە سنوری میسیا Mysia. لێنجا بە سێ ڕۆژ ٦٠ فەرسەخی بڕی تا گەیشتە کایستەر Cayster، ئەمەش هەر شارێکی ئاوەدانە.

پێنج ڕۆژ لەوێ مایەوە و بەگوێرەی خۆی دەبایە مووچەی سێ مانگ بدات، جا خەڵکەکە دەچوونە لای ڕەشماڵەکەی و داوای مووچەیان لێ دەکرد. ئەوسش ناچار دەبوو دڵیان ڕابگرێت و بەڵێن بدات، دیاریش بوو کەوا بەم حاڵە پەست بووە. بێگومان کۆڕووش لەو کەسانە نەبوو پارە گل بداتەوە. لەم کاتەدا ئەپیاکسا ژنی سیانەس، پاشای کیلیکیا Cilicia، هاتە سەردانی کۆڕووش. گوتیان ئەم ژنە پارەی هێنابوو بۆیە کۆڕووش یەکسەر مووچەی چوار مانگی بە لەشکرەکە دا. ئەم ژنە پاسەوانی کیلیکی و لەسپەندیی لەگەڵ بوو و دەشڵێن شەو لەگەڵ کۆڕووش نوستووە.

لێرەوە دوو ڕۆژ ڕێپێوانی ٣٠ فەرسەخی گەیاندی بە شارە ئاوەدانەکەی تیمبریۆن Tymbrion. لەوێ لە تەنیشت ئاوەکە نافورەیەك هەیە ناوی لە میداس، شای فریجیا، وەرگرتووە. لەوێوە بە دوو ڕۆژ ٣٠ فەرسەخی بڕی تا گەیشتە کیلیکیا، شارێکی ئاوەدانە. لەوێ شاژنەکە داوای لە کۆڕش کرد پاڕادێك[1] بە لەشکر بکات. کۆڕووش هێزی یۆنانی و ناوچەیی ساز کرد کە بەپێشیدا ڕێپێوان بکەن و دەبایە هەر یەك لە ئەفسەرەکان بەپێش سەربازی خۆی بکەوێت. چەکدارەکان بە چوار چوار ریز بوون. مێنۆن و پیاوەکانی لەسەر باڵی ڕاست و کلێرخۆس و پیاوەکانی لەسەر باڵی چەپ و جەنەراڵەکانی دیکە لە ناوەڕاستی لەشکردا تاقمێکیان پێك هێنا. لە سەرەتادا کۆڕووش هێزە ناوچەییەکانی پشکنی، تاقم بە تاقم بە پێشیدا ڕەت بوون. لێنجا یۆنانیەکانی پشکنی، بە عەرەبانە بەپێشیاندا ڕۆیشت. شاژن لەنێو عەرەبانەیەکی داپۆشراودا بوو. چەکدارەکان خودەی برۆنز و یەلەگی سووریان پۆشتبوو، زرێکانیش بە رووتی بوون. کۆڕووش بەپێشیاندا ڕۆیشت و لە ناوەندی مەیدانەکە وەستا، هەستا پێگرەی تەرجومانی ناردە لای جەنەراڵە یۆنانیەکان کە پێیان بڵێت با سەرباز بە شێوازی

---

١ پاراد (Parade) واتە خۆپێشاندانی سەربازی (استعراض عسکری)

شەڕ ڕمبەکانیان ڕابگرن و لێی بێنە پێش. فەرمانەکە ڕاگەیێندرا و سەربازەکان ڕمبیان بەرز کردەوە و بە ئەعزەتی جەنگی پێشڕەوییان کرد. هەرهەندەیان زانی وا بەرەو ئۆردوگا دەڕۆن، ناوچەییاکان ترسان و شاژن لە عەرەبانەکە دەرپەڕی، خەڵکەکەش بازاڕیان چۆڵ کرد. ئینجا یۆنانیەکان بە پێکەنینەوە بۆ نێو ئۆردوگا گەڕانەوە. دەڵێن شاژن شاگەشکە ئەو سیستەمە ڕێکوپێکە و ئەو لەشکرە ساماناکە ببوو، هەروەها کۆڕووش پێ گەشابۆوە کە لەشکرەکەی دیت چۆن ترس و سامیان خستە نێو ئۆردوگای خەڵکە ناوچەییەکان.

لەوێوە کۆڕووش بە سێ ڕۆژ ٦٠ فەرسەخی بڕی بۆ ئیکۆنیۆم، دوا شاری فریجیا. سێ ڕۆژ مایەوە ئینجا بە پێنج ڕۆژ ڕێگایەکی ٩٠ فەرسەخیی بڕی بۆ لیکۆنیا. خەڵکی ئەو ناوچە دژوار بوون، کۆرش یۆنانییەکانی لەو شارە بەردا کە تالآنی بکەن. لێرەدا کۆڕووش شاژنەکەی کیلیکیا لەگەڵ مینۆن بەرێگایەکی قەدبڕدا ناردەوە بۆ وڵاتی خۆی و کۆڕووش لەگەڵ لەشکرەکە بە ڕێگای کەپەدۆکیادا ڕۆیشت و بە چوار ڕۆژ ٧٥ فەرسەخی بڕی تا گەیشتە شارە گەش و ئاوەدانەکەی دانا.

لەوێ سێ ڕۆژ مایەوە چونکە پیاوێکی فارس بەناوی مێگافەرنیس کۆڕووش تۆمەتباری کرد کە خەریکی پلانگێڕانە. کابرا پایەیەکی بەرزی هەبوو، وەنەوشەی شاهانەی دەپۆشت، ئیتر ئەمە و پیاوێکی تر لە دەسەلآتدارەکان بە سزای مەرگ گەیێندران.

لێرەوە ڕوویان کردە سنوری کیلیکیا، ڕێگاکە ڕێگای عەرەبانە بوو بەلآم زۆر هەوراز بوو، هەورازەکە بەشەڕ نەدەبڕا، گوتیشیان کەوا سیانەس لە سەر هەورازەکە دامەزراوە. کۆڕووش ڕۆژێك لە دەشتەکە مایەوە و سبەینێ نامەبەرێك هات پێی ڕاگەیاند کەوا سیانەس گەڕاوەتەوە چونکە بیستویەتی مێنۆن گەیشتۆتە جێ. هەروەها هەندێك لە کەشتیە سپارتییەکان لە لێوارەکانی ئایۆنیا دەخولێنەوە و لە کیلیکیا نزیك دەبنەوە. هەرچۆنێك بێت کۆڕووش بەبێ شەڕ گەیشە سەری، ئۆردوگای کیلیکییەکانی چۆڵ کرابوو. ئینجا بۆ نێو دەشتەکە شۆڕبۆوە، دەشتێکی بەرین و زەنوێر بوو، ئاودێرییەکی باشی هەبوو، داری جوان و بەرهەمی مێو و گەنم و هەرزن و توترکێکی زۆری دەدا و چیای بەرز بەدەوریدا وەکو دیوارێك لەدەریاوە بۆ دەریا دەشتەکەیان دەپاراست.

لینجا پێنج فەرسەخی ئەو دەشتەی بڕی و گەیشتە تەرسووس پایتەختی کیلیکیا. شارێکی گەشە سەرای سیانەسی تێدایە. رووبارێکی هەیە بەپانایی ٢٠٠ پێ دەبوو پێیان دەگوت سیندۆس کە بەنێو شارەکەدا دەڕۆیشت. بەلاّم لە دوکانداڕەکان بەولاوە خەلّکی شارەکە رەگەلّ سیانەس کەوتبوون بۆ چیا، لەوێدا خۆیان قایم کردبوو. هەروەها خەلّکی ئەیۆس جێگەی خۆیان چۆل نەکردبوو.

ئەپیاکسا ژنی سیانەس پێنج رۆژ پێش کۆڕووش گەیشتبووە جێ و لەلایەکی دیکەوە دوو تاقم لە چەکدارەکانی مێنۆن لەرێدا ون ببوون. دەلّێن دزی و تالاّنیان کردبوو جا خەلّکەکە پارچە پارچەیان کردبوون. هەندێکیش دەلّێن رێگایان بزر کردبوو، لێ کوژران. هەرچۆنێك بوبێت لەوان ١٠٠ هۆپلیت دەبوون جا کە لەشکرەکە گەیشتە تەرسووس لە تۆلّەی ئەو ١٠٠ چەکدارەدا شار و سەراکەیان تالاّن کرد.

کە کۆڕووش گەیشتە شارەکە بەدوا سیانەسیدا نارد بەلاّم سیانەس وەلاّمی دایەوە کە ئەو کەس لە خۆی بە گەورەتر نازانێت. دواتر ژنەکەی پێی سەلّماند و بەلّێنی پێ درا کە بیپارێزرێت، ئەوجار کوبوونەوەیەك رووی دا. سیانەس پارەیەکی زۆری پێشکەش بە لەشکرەکەی کۆڕووش کرد و لەبەرانبەردا کۆڕووش دیاری شەرەفی پێشکەش کرد بریتی بوو لە ئەسپێك بە زین و لغاو و رێشمەی زێڕینەوە، هەورەوها رۆبێکی فارسیشی پێشکەش کرد و بەلّێنی دا کە هیچ تالاّن و کاولکاری لە ناوچەکە ناکات و ئەگەر چەکدارەکانی کەسێکیان بە یەخسیر گرتبێت هەموویان ئازاد دەکات.

## چاپتەر -٣-
# کلیرخۆس هەڵگەڕانەوەیەك دادەمرکێنێتەوە

کۆرووش و لەشکرەکە ٢٠ رۆژ لەوێ مانەوە چونکە سەربازەکان گومانیان پەیدا کرد کە هەڵمەتەکە دژی شایە و گوتیان ئەوان بۆ ئەوە نەهاتوون. کلیرخۆس خەریکیان بوو بەڵام سەرباز بەردبارانیان کرد و هەندەی نەمابوو تێدا بفەوتێت، ئیتر کە زانی مەسەلەکە ئاسان نیە کلیرخۆس بڕیاری دا کۆبوونەوەیەك ببەستێت.




لە کۆبوونەوەکەدا پێشەکی بۆ ماوەیەکی درێژ لەبەرانبەریان بەگریانەوە وەستا، سەربازەکان بە ماتی تماشایان دەکرد و سەیریان پێ دەهات. ئینجا ئەم گوتارەی دا:

سەربازەکان، سەیرتان پێ نەیەت کە ئەوها دڵتەنگ بم. کۆرووش برادەری منە، کە ئاوارە کرابوم لەو نەك هەر رێزی لەمن گرت بەڵکو ١٠٠٠٠ داریکی بەمن داو کە پارەکەی دامێ من پارەکەم بۆخۆم خەرج نەکرد بەڵکو بۆ ئێوەم خەرج کرد. سەرەتا شەڕمان لەگەڵ تراکییەکان کرد و ئێمە پێکەوە زەبرێکی باشمان لێ وەشاندن کە دەیانویست یۆنانییەکانی خەرسۆنیز

پەراگەندە. ئینجا کە کۆرووش بەدوا مندا نارد، من ئێوەشم لەگەڵ خۆم هێنا تا چاکەی بدەمەوە. بەڵام ئێستا کە ئێوە ناخوازن هەڵمەتەکە ئەنجام بدەن من دوو ڕێگام هەیە، یان ئەوتا پشت لە ئێوە بکەم و بەدوا کۆرووش بکەوم، و یان ئەوەتا لەگەڵتان بمێنم و بەڵێنەکانم بۆ کۆرووش پێشێل بکەم. جا ئایا ڕەفتارم ڕاستە یان نا، من نازانم؟ بەڵام هەر چۆنێك بێت ئێوە هەڵدەبژێرم و لەوەی دەبێ با ببێت. با کەس نەڵێ من یۆنانیەکان بۆ وڵاتی بێگانە دەبەم و لەوێدا پشتیان تێ دەکەم بۆ خاتری بێگانەیەك. کە ئێوە بە قسەم ناکەن، من بەقسەتان دەکەم، ئەمەش چونکە من ئێوە بە برادەر و نیشتیمان و هاوپەیمان دەزانم. تەنیا لەگەڵ ئێوەش هەست بە پیاوەتی دەکەم دەنا دوور لە ئێوە باوەڕ ناکەم نە چاکەی دۆستانم پێ بکرێت و نە خراپەی دوژمنان. جا بڕیاری خۆتانم بدەن کەوا من لەگەڵتان دام.

ئەمانە قسەکانی کلیرخۆس بوون.

کە سەربازەکان بیستیان، یەك بەخۆ چەپڵەیان بۆ لێدا تەنانەت پتر لە ٢٠٠٠ چەکداری زینیاس و پاسیۆن بار و شمەکیان تێك نا و هاتنە لای کلیرخۆس. ئەم شتە کۆرووشی قەڵس و نیگەران کرد و بەدوای دا نارد. کلیرخۆس نەچوو بەڵام بە نهێنی خەبەرێکی بۆ نارد کە تا ماوەیەك پشوو بگرێ هەتا بارەکە باشتر دەبێتەوە[1]، گوتیشی با دووبارە و سێبارە بەدوای دا بنێرێت و ئەویش هەر ڕەتی دەکاتەوە. دواتر دیسان کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ سەربازەکان بەست و ئەم قسانەی کرد:

شتێکی ئاشکرایە کە ئێستا ڕای کۆرووش بەرانبەرمان بگۆڕێت چونکە ئێمە ئیتر سەربازی ئەو نین. چۆن سەربازی ئەو بین و لەگەڵیشی نەڕۆین؟ ئەو هیچی تر بەرپرسی ئێمە نیە و ئێستا وا دەزانێت کە ئێمە خراپەمان لەگەڵیدا کردووە. چەندە بەدوامدا بنێرێت من بە پیریەوە ناچم چونکە شەرمی لێ دەکەم و لەبەرانبەریدا هەست دەکەم بێ بەڵێن بوومە. دەترسم بمگرێت و سزایەکی توندم بدات، بۆیە باوەڕم وایە کە ئێستا کاتی نوستن و بێباکی نیە. دەبێ باش بزانین

---

١ با خوێنەر سەرنج بداتە ئەو سیاسەت و فێڵبازیەی کە لەنێو یۆنانیاندا باو بوو؟ هەر ئەمەش نیە بەڵکو دواتر دەبینین چۆن هەر تاقمێك خەریکی تاقمەکانی دیکە دەبوون. تاکە خاڵێك لەسەری ڕێك دەکەوتن تەنیا هەبوونی دوژمنی گشتی بوو دەنا (هەرکەس بۆ خۆی).

چیمان لەپێشە، دەبێ بزانین چۆن خۆمان بپارێزین و ئەگەر بڕیارێشمان دا بگەڕێینەوە دەبێ بزانین چۆن بە ئاسوودەیی دەگەڕێینەوە و خۆراك بۆ خۆمان دابین دەکەین چونکە بەبێ خۆراك نە سەرباز و نە جەنەراڵ کەڵکیان دەمێنێت. ئەو پیاوە بۆ لایەنگرەکانی خۆی نەرم و خۆشەویستە، بەڵام بۆ نەیاران دەبێتە دوژمنێکی ترسناك. هەمورمان دەزانین چ هێزێکی هەیە لە سوارە و پیادە و کەشتی، ئۆردوگاکەشمان لەوان دوور نیە، جا کاتی ئەوە هاتووە هەرکەس بیرێك لە خۆی بکاتەوە کە چ بکات باشە؟

خەڵکێك هەستانەوە قسە بکەن کەچی تاقمێکی دیکە (کە کلێرخۆس رایسپاردبوون) ئەوانە بە قسە هاتن و دیاریان خست کە مانەوە و رۆیشتن بەبێ رەزامەندیی کۆرووش ئاسان نیە. یەکیان وای دیارخست کە دەبێ بگەڕێنەوە بۆ یۆنان و دەبێ جەنەراڵێك لەباتی کلێرخۆس هەڵبژێرن و دەبێ خەریك بن خۆراك بکڕن (بازاڕەکە لەنێو ئۆردوگای ناوچەییەکاندا بوو) گوتیشی دەبێ بچن داوا لە کۆرووش بکن کەشتی دابین بکات بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ یۆنان، و ئەگەر نەیکرد دەبێ ریناسێك لەگەڵیان بنێرێتەوە تا یۆنان. خەڵکەکەی ئێرەش دژوارن، جا ئەگەر داواکاریەکانی جێ بەجێ نەکرد دەبێ بۆ شەڕ ساز بن و خێرا شوێنێکی بەرز بگرن پێش ئەوەی کۆرووش یان خەڵکی کیلیکیا جێگا بەرزەکان داگیر بکەن.

لێرەدا کلێرخۆس گوتی: کەس باوەڕ نەکا من کردارێکی ئەوها بکەم. زۆر شت هەیە کە رێگا نادەن ئەم پلانانە ئەنجام بدرێن، بەڵام باش بیزانن کەوا من گوێڕایەڵی ئەو کەسە دەبم کە ئێوە هەڵی دەبژێرن

ئەوجار یەکی دیکە هەستایەوە و ناڕاستیی رایەکەی پێشووی دیار خست کە لومێدیان دەکرد کۆرووش رێگای گەڕانەوەیان بدات. دیاری خست کە ئەم قسە چەند سووکە ئەوەی دەڵێ (گوایە) دەبێ کۆرووش رێناسێکمان لەگەڵدا بنێرێتەوە تا رێگامان پێشان بدات! گوتی:

ئێمە پلانەکانی کۆرووشمان تێك داوە، جا بۆچی داوا لە کۆرووش نەکەین ئەو هەوراوزانەش بۆ مە دابین بکات بۆ ئەوەی خۆمانی تێدا قایم بکەیەن دژبە خۆی؟! من تەنانەت سواری ئەو کەشتییەش نابم کە کۆرووش بۆ ئێمەی ساز کردبێت چونکە رەنگە نوقمی بکات، هەروەها بەدوا ئەو رێناسەش ناکەوم کە کۆرووش دەینێرێت چونکە دەمانباتە شوێنێکی وا دەبازبوونی نەبێت.

لەوە قسە نیە، ئەگەر بگەڕێمەوە دەبێ بەبێ ئاگاداری و بەدزی بڕۆم، کە ئەمەش هەر ناکرێت. کەواتە بەڕای من دەبێ کلێرخۆس بچێ تا بزانێت ئایا کۆرووش چی دەوێت؟ ئەگەر هەڵمەتەکە مەترسیی گەورەی تێدایە ئەوسا دەبێ داوای لێ بکەین یان ئەوەتا بە سەلامەتی بمانگەڕێنێتەوە، یاخیش ئەگەر لەگەڵی بچین ئەوسا بە مەرجی باشتر لەگەڵی دەچین.

هەستان شاندێکیان هەڵبژارد کە لەگەڵ کلێرخۆس بچن پرسیارەکان لە کۆرووش بکەن. کۆرووش وەڵامی دایەوە کە بیستوویەتی ئەبرۆکۆماس (دوژمنێکی خۆی بوو) لەسەر رووباری فوراتە کە ١٢ رۆژە رێ دوورە، ئەگەر لەوێ بوو ئەوا تۆڵەی لێ دەستێنێتەوە و دەگەڕێنەوە، و ئەگەر هەڵات ئەوسا ڕێگا چارەیەك دادەنێن.

شاندەکە قسەیان بۆ سەربازەکان گێڕایەوە و ئەگەرچی گومانیان هەبوو هەڵمەتەکە دژبە شایە، واش هەر بڕیاریان دا لەگەڵی بچن. بەڵام داوای مووچەی زیادەیان، واتە مانگانە سێ (نیوداریکی) لە مووچەیان زیاد بکرێت. ئیشەکە پێك هات بەڵام تا ئەو کاتەش کەس بەئاشکرایی نەیدەگوت کۆرووش بەگژ شایاندا دەبات.



چاپتەر -٤-

## لە دەروازەی سووریا بە درێژایی فورات

لەوێوە بە دوو رۆژ ٣٠ فەرسەخیان بڕی تا رووباری سارۆس کە ٣٠٠ پێ بەرین بوو. ئینجا بە دوو رۆژ ١٥ فەرسەخیان بڕی و گەیشتنە رووباری پیرامۆس کە ٦٠٠ پێ بەرین بوو، ئینجا بە دوو رۆژ ٥٥ فەرسەخیان بڕی گەیشتنە شاری گەورە و ئاوەدانی ئیسۆس، لەمەش دوا شاری کیلیکیایە لەسەر دەریا.

کۆرووش سێ رۆژ لەوێ مایەوە، ٣٥ کەشتی پیلۆپۆنیزی لەژێر فەرماندەیی ئەدمیراڵ تاگۆراسی سپارتی بۆی هاتن. کەشتییەکان لەلایەن کامۆسی میسرییەوە بەرێ کرابوون کەوا ٢٥ کەشتی دیکەی کۆرووشی لەدەست بوو، ئەو کەشتیانە بوون کە شاری میلەتۆس (هاوپەیمانی تیزافەرنەیان) یان گەمارۆ دابوو. هۆپلیت بە سەرکردایەتی خیریسۆفۆسی سپارتی لەم کەشتیانە بوون. کەشتییەکان لە ئیواری بەرانبەر رەشماڵەکەی کۆرووش نیشتن. دیسان لێرەدا هەمان شت رووی دا. ٤٠٠ هۆپلیتی یۆنانی هەڵگەڕانەوە و دامرکێندرانەوە و دیسان رەگەڵ کۆرووش کەوتنەوە.

لەوێوە بە یەك رۆژ پەنجا فەرسەخیان بڕی تا دەروازەی نێوان کیلیکا و سووریا. دوو قەڵاتی لێ بوو بەرانبەر یەکتر، یەکیان سەر بە کیلیکیا بوو لەدەست سەربازەکانی سیانەسدا و یەکیشیان سەر بە سووریا بوو کە سەربازی کۆرووشی تێدا بوو. رووباری کارسوس ١٠٠ پێ بەرین بوو بەنێوانیاندا دەرۆیشت، هەروەها مەودای نێوان دوو قەڵاتەکە ٦٠٠ یارد دەبوو بەڵام بەنێوان ئەو دوو قەڵاتەدا رەت نەدەبوون. رێگاکە تەسك بوو، دیواری قەڵاتەکانیش تا رۆخی تەلانەکەی سەر دەریاکە درێژ ببوونەوە و هەر یەك لە قەڵاتەکانیش دەروازەیان لەسەر رێگاکەدا هەبوو. بۆیە کۆرووش بەدوا کەشتییکانی دا نارد بوو. پلانەکە وابوو کە هۆپلیتەکان دابەزن و لەگەر ئەبرۆکۆماس چەکدار لەسەر دەروازەکان دانابێت، دەروازەکە بە شەڕ بگرن. بەڵام دیاربوو

لەبرۆکۆماس بیستبوی وا کۆرووش بەڕێ و یەکسەر هێزەکەی کشاندبۆوە و تێکەڵ بە سوپاکەی شای کردبۆوە. دەڵێن ژمارەیان گەیشتۆتە ۳۰۰,۰۰۰[1].

لەوێوە بە یەك ڕۆژ ٥٠ فەرسەخی بڕی و گەیشتە فینیکیان Phoenician[2]، مەڵبەندێکی بازرگانی بوو پڕ لە کەشتی. لەوێدا زینیاسی ئەرکادی و پاسیۆنی مەگەریانی شمەکی خۆیان تێك نا و بە کەشتی ڕۆیشتن. دەڵێن لە کۆرووش زویر بوونە کەوا هێشتویەتی رابەرایەتی ئەو سەربازانە بکات کە لەوان هەڵگەڕابوونەوە و چوبوونە لەلای کلێرخۆس ئەو کاتەی کە سەربازەکان بە گشتی بڕیاریان دابوو بگەڕێنەوە بۆ یۆنان. کە ئەوانە ڕۆیشتن، قسەیەك بڵاو بۆوە گوایە کۆرووش هێزێکی بەدوادا ناردوون، هەندێك کەسیش ئەم هەڵاتنەیان بە نامەردی لەقەڵەم دەدا. ئیتر کۆرووش جەنەڕاڵەکانی کۆکردەوە و ئەم قسانەی کرد:

زینیاس و پاسیۆن ڕۆیشتن، بەڵام دەبێ باش بزانن کە لە ژێر چەنگم دەر ناچن. من دەزانم بە کوێدا دەڕۆن و دەتوانم بە کەشتی بەدوایاندا بنێرم. بەڵام هەرچۆنێك بێت، من کەسیان بەدوادا نانێرم. با کەس نەڵێ من پیاوان بەکار دەهێنم و دواتر کە دەیانەوێ بڕۆن، دەیانگرم و لەشکەنجەیان دەدەم. نەخێر، بابڕۆن و با بزانن کە ئێمە بۆ ئەوان باشتر بوین. ئێستا ژن و منداڵەکانیان لە ترالیس لەبەر دەستی خۆمن بەڵام هیچیان لێ ناکەم و دەیاندەمەوە لەبەرانبەر ئەو خزمەتانەی کە تا ئێستا کردوویانە

ئەمە بوون قسەکانی کۆرووش. ئیتر تەنانەت ئەوانەی کە حەزیان نەدەکرد هەڵمەتەکە تەواو بکەن، ئەوسا هەموو بۆ هەڵمەتەکە تیژ بیوون.

---

[1] ئەم ژمارە گومانێکی گەورەی لەسەرە. خۆی لە هەموو کاتێکدا کە خەڵکەکە لەبەر چاوت بن ژمارەیان دەزانیت کەچی ئەگەر لە شوێنێکی دوور بن بەکسەر وادەزانی داخۆ چەند زۆرن؟!

[2] فینیکیا ئاماژەیەکە بۆ (فینیقی) واتە کەنعانیەکان (خەڵکی لوبنان). ئەوانە کۆمەڵێك شار و بەندەریان هەبوو لە دەریای سپی هەر لە سوریا لوبنان تا توونس (شاری قەرتاج لە توونس) تا لێواری ئسپانیا. شایانی گوتنە وشەی (فین) واتە سوور و کە یۆنانی پێیان گوتوون (فینیك) واتە (خەڵکە سوورەکان) چونکە ئەسمەر بوون. هەروەها هەمان وشە (فینی یاخود فوینی) لە لاتینیدا کراب بە (پوونی) بۆیە ڕۆم بە قەرتاجییەکانیان دەگوت (پوونیك). بۆ زانیاری.

پاش ئەوە بە چوار رۆژ ٦٠ فەرسەخ ریگایان بری و گەیشتنە رووباری خالۆس کە ١٠٠ پێ بەرین بوو و پڕ بوو لە جۆرە ماسیەکی دەستەمۆکراو. سووریەکان بە شتێکی پیرۆزیان دەزانی و نەیاندەهێشت کەس دەستیان لێ بدات و هەمان باوەڕیان بەرانبەر بە کۆتر هەبوو. ئەو گوندانە هی پەریزاد بوون، لەباتی وشکە پارە پێی درابوو.

لە وێوە بە پێنج رۆژ و بە رێپێوانێکی ٦٠ فەرسەخی گەیاندنی بە سەرچاوەکانی رووباری داردیس کە ١٠٠ پێ بەرین بوو. سەرای بێلەسیس، حاکمی سووریا، لەوێ مابوو. هەروەها پارکێکی گەورە هەبوو پڕ لە جۆرەها گیا و درەختی جوان کە بە خەیاڵتدا نایەت. بەڵام کۆرووش هەموو پارك و بێستان و سەراکەی کاول کرد.

ئینجا بە سێ رۆژ ٤٥ فەرسەخی بری تا گەیشتە فورات کە ٨٠٠ یارد بەرین بوو. شارێکی گەورە و گەشی لێ بوو بەناوی پاپساکۆس Thapsacus، لەوێ پێنج رۆژ مایەوە. لەم کاتە بوو کە کۆرووش بەدوا جەنەراڵە یۆنانییەکانی دا نارد و راگەیاند کە نیازی هەیە بەرەو بابل بڕوات و بەگژ شای گەورەدا بچێت، و داوای کرد بە سەربازەکان رابگەیێنن و رازییان بکەن. جەنەراڵەکان کۆبوونەوە ئینجا وەڵامیان بۆ کۆرووش ناردەوە، بەڵام سەربازەکان تووڕە بوون وایان دەزانی جەنەراڵەکان لەسەرەتاوە ئاگادار بوونە. سەرباز رازی نەبوون برۆن بەبێ پارەیەکی زیادتر وەکو ئەو پارەی کە درابووە ئەو کەسانەی کە لە کاتی خۆیدا لەگەڵ کۆرووش بۆ دیداری باوکی چوبوون.

جەنەراڵەکان ئەم قسانەیان بە کۆرووش راگەیاند، ئەویش بەڵێنی دا هەر کە دەگەنە بابل سەرو پێنج مینی[1] ی زیو وەربگرن سەرباری مووچەی خۆیان تا ئەو رۆژەی کە بە ساغی دەگەڕێنەوە بۆ ئایۆلیا. یۆنانییەکان مەیلەو رازی ببوون بەڵام پێش ئەوەی بڕیاری کۆتایی بدرێت مینۆن سەربازەکانی خۆی جودا کردەوە و ئەم قسانەی بۆ کردن:

سەربازەکان، ئەگەر بەقسەم دەکەن ئەوا بەبێ ترس و بارگرانی دەبێ وا بکەین کۆرووش بایەخێکی گەورەتر بە خۆمان بدات. ئێستا کۆرووش لە یۆنانییەکان دەپاڕێتەوە کە بەدوای

1 مینا Menea ئەمەش جۆرە پارەیەك بووە.

بکەون، جا من دەڵێم ئێمە پێش هەمووان لە رووبارەکە بپەڕینەوە پێش لەوەی وەڵامی کۆرووش بدەنەوە. چونکە ئەوسا کۆرووش بە چاکەی لێوەی دەزانێت. خۆ ئەگەر یۆنانییەکانیش دەنگ بۆ کۆرووش نەدەن و کەس نەپەڕێتەوە، خۆ ئێمەش دەگەڕێینەوە بەلاّم ئەوسا بە باشترین کەسمان دەزانێت. واتە کۆرووش دەکەینە برادەر[1].

پاش ئەم قسانە یەکسەر لە فورات پەڕینەوە. کۆرووش پێی گەشایەوە و یەکسەر گلاوسی ناردە لایان، گوتی:

سەربازەکان، دڵم بە ئێوە خۆشە و دەبێ دڵی ئێوەش بەمن خۆش بێت دەنا کۆرووش نەبم

سەربازەکان ئومێدی گەورە و دوعای سەرکەوتنیان بۆ خواست. ئەوەش گوترا کەوا مێنۆن دیارییەکی باشی پێ گەیشت. پاش ئەمە، کۆرووش لە فورات پەڕییەوە و لەشکریش بەدوای دا هاتن، لە پەڕینەوەدا ئاوی رووبارەکە نەدەگەیشتە سینگی پیادەکان. خەڵکی پاپساکۆس گوتیان:

جاران مەگەر بە بەلەم دەنا تا ئێستا کەس لەوها لەم رووبارە نەپەڕێتەوە

ئەبراکۆماس پێشتر بە بەلەم پەڕیبۆوە و بەلەمەکانی تێکشکاندبوو ئیتر لەلای خەڵکەکە مسۆگەر بوو کە شتێکی غەیبی لەئارادایە و رووبارەکە خۆی رێگای پەڕینەوەی خۆش کردووە، چونکە بۆ کۆرووش نوسراوە کە ببێتە شا.

لە وێوە بە نۆ رۆژ ١٥٠ فەرسەخیان بڕی بەنێو سووریادا تا گەیشتنە رووباری ئاراکیس. کۆمەڵێك گوندی لێ بوو پڕ لە دەرە و گەنم و شەراب. دوو رۆژ مانەوە و خۆراکێکی باشیان دابین کرد.

---

[1] با خوێنەر سەرنج بداتە ئەم راستیە کە یۆنانیەکان دەیانگوت (ئێمە) یاخود (خۆمان) مەبەستیان لە هەموو یۆنانیەك نەبوو، بەڵکو تەنیا خەڵکی ناوچەی خۆیان مەبەست بوو، ئیتر بزانە لە رقی یەکتر جیهان بەسەر دەهات و چۆن لە ئەنجامدا هەمیشە دەکەوتنە بەر دەستی بێگانە، کوردی گوتەنی (خۆبەخۆی بێگانەپەرست).

## چاپتەر -٥-
## بیابانی عەرەبی
## شەڕێك لەنێوان مێنۆن و کلیرخۆس

کۆرووش بەنێو عەرەبستاندا ڕۆیشت[1] و بە پێنج ڕۆژ ١٥٠ فەرسەخی لەو بیابانە بڕی. لەم بەشەی جیهاندا زەوی وەکو ڕووی دەریا تەختە، داری سووتەمەنی زۆر بوو، درەخت و گیای بۆندار ئەو دەشتەیان پڕکردبوو بە بۆنی خۆش، داری گەورەی لێ نەبوو بەلاّم ژمارەیەکی زۆر لە ئاژەڵی کێوی هەبوون، کەری کێوی و نەعامە گەلێك زۆر بوون، هەروەها ئاسك و چرگ، و سوارەکان زوو بە زوو ڕاویان دەکردن. کەرەکێوییەکان هەندێك هەڵ دەهاتن و ڕادەوەستان چونکە لەڕاستیدا زۆر لە ئەسپەکان بەغارتر بوون، ئینجا کە سوارەکان نزیك دەبوونە، دیسان هەڵدەهاتن. دەبوو چواردەوریان بگرن دەنا بە ئاسانی نەدەگیران. گۆشتیان چێژی گۆشت مانگای دەدا بەلاّم ڕەنگیان کاڵتر بوو و چێژیان هەندە خۆش نەبوو. سەیر ئەوەیە کە کەس نەیتوانی یەك نەعامە بگرێت، ئەوانە هەندە بەغار بوون سوارەکان پێیان ڕانەدەگەیشتن کە ڕایاندەکرد باڵیان وەکو شیراعی کەشتییەکان هەڵدەهێنا. بەلاّم گرتنی چرگەکان ئاسان بوو، ئەوانە هەندێك هەڵدەفرین و دەنیشتنەوە و بەڕاستی چرگ گۆشتێکی خۆشیان هەبوو[2].

لە ڕێپێوانی ئەم وڵاتەدا توشی ڕووباری ماسکاس بوون کە ١٠٠ پێ بەرین بوو. شارێکی زۆر گەورەی لێ بوو بەناوی کۆرسۆت کە ڕووبارەکە بەدەوریدا سوڕابۆوە. سێ ڕۆژ مانەوە، خۆراك

---

[1] دیارە هەرێمی جەزیرە لەوساوە پێی گوتراوە عەرەبستان Arabia، لەڕاستیشدا عەرەب لەسەردەمی ئاشورییەوە ناویان هەبوو.

[2] چرگ واتە (حباری) باڵندەیەکی بۆرە و لە قەلەموون گەورەترە. مایەی داخە کە لە کوردستان بە هۆی ڕاوکردن نەماون چونکە من لە پیاوەانم بیستووە کە تا شەستەکان چرگ مابوون. هەروەها مایەی داخە کە بیزانین لە کاتی خۆیدا نەعامەش لە خۆرهەلاّتی ناوەڕاستدا هەبووە بەلاّم بەهۆی ڕاوکردنێکی شێتانە دوایان بڕاوە. ئومێد دەکەم هەموو جۆرە ڕاوێك قەدەغە بکرێت، ئەوتا شاخەکانی کوردستان ورچ و پڵنگ و جۆرەها ئاژەڵمان هەبوو کەچی ڕەنگە ئێستا هیچیان نەمابن؟

و تفاقێکی باشیان دابین کرد ئینجا بە یەك مانگ ٢٧٠ فەرسەخیان لەو بیابانە بڕی. فورات هەمیشە لە دەستەڕاستیان بوو تا گەیشتنە جێگەیەك کە پێی دەگوترا (دەروازە). لەو ڕێپێوانەدا زۆر لە بارگینەکان لەبرسان تۆپین چونکە گیای لێ نەبوو، زەوییەکەش ڕووت بوو، خەڵکی وێش ڕووبارەکەیان بۆ هاتوچۆ بەکار دەهێنا، و بۆ هاڕینی دەرە بەردیان بەکار دەهێنا و دەیانبرد بۆ بابل بیفرۆشن.




لەو قۆناغەدا دانەوێڵە لەنێو لەشکر بڕا. نەدەکرا خۆراك بکڕن مەگەر لە بازاری لیدییەکان کە لەنێو سەربازە ناوچەییەکانی کۆرووشدا بوو. پیاو دەبایە یەك کاپیت گەنم و دەرە بە چوار سیگلی بکڕێت. نرخی ٣٠ گاوۆس بەرانبەر ٥،٧ ئۆبۆلسی ئەتیکی بوو. کاپیت دەکاتە سێ پنت جا سەربازەکان ناچار بوون هەر گۆشت بخۆن.

لە هەندێك قۆناغدا کۆرووش ڕێپێوانەکانی یەکجار درێژ دەکردەوە بەتایبەتیش کە هەندێك جار ناچار دەبوو خۆ بگەیێنێتە ئالیك و ئاو. جارێك لە جارەکان گەیشتنە ڕێگایەکی تەسك و قوڕاوی و عەرەبانەکان چەقین، کۆرووش فەرمانی بە گلاوس و پیگرە دا کە تاقمێك سەربازی

ناوچەیی بەرن بۆ یارمەتی عەرەبانەکان. کە زانی عەرەبانەکان بە باشی نارۆن رقی هەستا و بەگزادە فارسەکانی دەنگ دا کە هەموو دابەزن و دەستی یارمەتی بۆ دەربازکردنی عەرەبانەکان درێژ بکەن. تەنیا لەوکاتە یۆنانیەکان دیتیان پابەندبوونی راستەقینە چۆنە کەوا لە هەر شوێنێك هەستیان کردبایە عەرەبانەکان بەباشی نارۆن ئەو بەگزادە و پایەدارانەی فارس یەکسەر پەستەکە بەنەوشەییکانی خۆیان دادەکەند و بە غاردانێکی زۆر خێرا، وەك بلێی لە گردێکی لێژ دێنە خوارێ، ئەوها بۆ عەرەبانەکان دەچوون، جا بە خۆ و بە کراسی گرانبەها و بە پانتۆڵی نەخشکراوەوە دەچوونە نێو قوڕ. هەندێکیان ملوانکە و بازنیان لەدەستدا بوو کەچی واش هەر خۆیان هەڵ دەدایە نێو قوڕەکە و عەرەبانەکانیان دەرباز دەکرد بە خێراییەکی ئەوها کە کەس باوەڕی بە چاوی خۆی نەدەکرد.

بە شێوەیەکی گشتی دیاربوو کۆرووش دەیویست بە زووترین کات بگاتە جێ و مەگەر چۆن دەنا وەستان و پشودانەوەی نەبوو. بیری کردبۆوە کە تا زووتر بگات شا ماوەی نابێت بۆ کۆکردنەوەی هێز چونکە لە راستیدا چاودێرێکی زیرەك دەیتوانی بزانێ کە هێزەکانی شای فارس بەسەر ولاتێکی زۆر گەورەدا بلاو کراوەنەتەوە و هێڵەکانی گواستنەوە و گەیاندن زۆر دوورودرێژن، ئیتر ئەو کەسەی کە بتوانێ بەخێرایی دەست بوەشێنێت دەرفەت بۆ شا نەدەما هێزەکانی کۆ بکاتەوە.

لەوبەری رووبارەکە شارێکی گەورە و گەشی لێ بوو بەناوی خارمەند، سەربازەکان بازارێکی باشیان کرد و لەوسەر بە قایاغ گەڕانەوە. کەوڵەکانیان پڕ لە پووش دەکەرد و تێکیان دەبەستن تا ئاو نەگاتە سەرێ، بەوانە لە رووبارەکە پەڕینەوە و خۆراکێکی باشیان کڕی. شەراب هەبوو کە لە خورما دروست دەکرا[1]، هەروەها نانی دەرە لەم ولاتەدا زۆربوو.

لەو ناوە شەڕێك لەنێوان سەربازەکانی مێنۆن و کلیرخۆس رووی دا. یەك لە پیادەکانی مێنۆن هەڵەیەکی کرد و کلیرخۆس بە تێهەڵدانی دا، کە پیاوەکە گەڕایەوە نێو برادەرەکانی خۆی و باسی کرد، سەربازەکان رقیان لە کلیرخۆس هەڵگرت، و لە هەمان رۆژ کلیرخۆس و

---

[1] ئەمەش تێبینیەکی گرینگە!!

یاوەرەکانی سەردانی بازاڕ و شوێنی پەڕینەوەیان دەکرد، لە گەڕانەوەدا بەپێش ڕەشماڵەکانی مێنۆندا هاتن و، هێشتا کۆرووش بەڕێوە بوو. یەك لە پیاوانی مێنۆن خەریکی دارکردن بوو، کە کلێرخۆسی دیت تەورداسێکی تێ گرت، تەورداسەکە پێی نەکەوت بەڵام سەربازێکی دیکە بەردێکی تێ گرت و یەکی دیکە بەردێکی تری تێ گرت و بوو بە هەرایەکی گەورە.

کلێرخۆس پەنای بردە نێو پیاوەکانی خۆی و یەکسەر فەرمانی دا کە لێیان بێنە دەست. هۆپلیتەکانی ریز کرد کە بۆ شەڕ ساز بن، ئینجا تراکیەکان و ئەو چل سوارەی کە هەیبوو هێرشی پێ بردن. لە ئەنجامدا مێنۆن و سەربازەکانی ترسان و رایان کرد بۆ لای چەکەکانیان، هەندێکیان شوێنەکەیان چۆڵ نەکرد واش هەر دەسەڵاتیان بەسەر بارەکەدا نەشکا. لەم کاتەدا پرۆکسینۆس ریزێزێك هۆپلیتی دەهێنا، یەکسەر هێنانی بۆ نێوان ئەو دوو تاقمە و تکای لە کلێرخۆس کرد کە بوەستێت. کلێرخۆس هار ببوو چونکە هەندەی نەمابوو بە بەردباران بکوژرێت. پرۆکسنۆس بەنەرمی قسەی لەگەڵ کرد و داوای لێ کرد رێگاکە چۆڵ بکات، لەم کاتەشدا کۆرووش گەیشت وێ و لەگەڵ یاوەرەکانی هاتە نێو یۆنانیەکان. رمێکی بە دەستەوە گرت و ئەم قسانەی کرد:

کلێرخۆس و پرۆکسینۆس و ئێوەی یۆنانی ئاگاتان لەخۆ نیە چ دەکەن؟ لەگەر وا بڕوات من هەر ئێستا پێوەندیم لەگەڵتان دەبڕێنمەوە، لەگەر ئیش بە خواری بڕوات ئەوسا ئەو خەڵکە ناوچەییانەی کە دەیانبینن ئەوانە لێتان دەبن بە دوژمنێك لە خودی شا ترسناکتر

کلێرخۆس بە خۆی داهاتەوە و هەردوك لا چەکیان دانا.

## چاپتەر -٦-

# کۆرووش خائینێك دەگرێت

کە رۆیشتن، بەسەر شوێن سم و تەرسی ولاغاندا کەوتن. ٢٠٠٠ سوارێك دەبوون پێشیان کەوتبوونەوە و هەموو شتێکیان دەسووتاند کە بەکەڵکی لەشکر هاتبایە. ئۆرۆنتا فارسێك بوو لە خزمانی بنەماڵەی شا و ناوبانگی هەبوو کە شارەزایی و توانایەکی سەربازانەی بەرزی هەیە، بەڵام لە بنەوە دژایەتیی کۆرووشی دەکرد. خۆی لە لەسلەدا رێك نەبوون، شەڕیان هەبوو و ئاشت کرابوونەوە. لەوێدا بە کۆرووشی گوت ئەگەر ١٠٠٠ سواری بداتێ دەچێ ئەو هێزەی پێشیان دەبەزێنێت، یان هەرنەبێ هەندێك لەسیریان لێ دەگرێت بای ئەوەی کە واز بێنن و فریا نەکەون کە خەبەر بۆ شا بنێرن.

کۆرووش پلانەکەی پەسند کرد و پێی گوت با لە هەر تیپێك تاقمە سوارێك هەڵبژێرێت. ئۆرۆنتا کە لە خۆی رادەدیت نامەیەکی نارد بۆ شا گوایە ژمارەیەکی زۆر لە سوارەکانی کۆرووشی لەگەڵ خۆ هێناوە و داوای کرد خەڵکێك بە پیریەوە بنێرێت و وای دیار خستبوو کە لایەنگری شایە، بەڵام نامەکەی دابووە پیاوێك پیاوەکەش نامەکەی دایە دەست کۆرووش.

کۆرووش یەکسەر دەستبەسەری کرد و بەدوا هەفت کەسی دا نارد لە پایەدارەکانی فارس بۆ رەشماڵەکەی خۆی، فەرمانیشی بە جەنەراڵە یۆنانییەکان دا کە هۆپلیتەکانیان بێنن و چواردەوری رەشماڵەکە بگرن. فەرمانەکە بەجێ هێنرا و ٣٠٠٠ هۆپلیت لەوێ ریز بوون. کۆرووش کلێرخۆسی بانگ کردە نێو کۆڕەکە کەوا رێزیان لە کلێرخۆس دەگرت. کە هاتەوە، باسی کرد چۆن دادگایی ئۆرۆنتا بەڕێوە چوو، گوتی کۆرووش بەم قسانە دەستی پێکرد:

براداران، من بانگم کردوون تا پێکەوە لە مەسەلەی ئۆرۆنتا بڕوانین و بەگوێرەی بیری خەڵك و خواوەند بڕیارێك بدەین. ئەم پیاوە لەکاتی خۆیدا باوکم دایمەزراندبوو کە لەژێری فەرمانی مندا بێت، ئینجا وەکو خۆی دەڵێت گوایە بە فەرمانی براکەم قەڵاتی ساردیسی گرتووە و دژی من جەنگاوە. شەڕمان کردووە و دوایە مافی هاوڕێیاتیمان بە یەکتر داوە.

رووی لە ئۆرۆنتا کرد و گوتی: ئۆرۆنتا، رۆژێك بریندارم کردووی؟

گوتی نەخێر.

پرسیارێکی تری کرد: ئۆرۆنتا، خۆت دەڵێی من خراپەم نەکردووە، ئەدی بۆچی دواتر بۆ نێو میسییەکان چووی و ئەو هەموو زیان و ئازارەت بە وڵاتەکەم گەیاند؟

ئۆرۆنتا دانی پیّ نا، ئیتر کۆرووش گوتی: ئەدی کە هەستت بە هێزی خۆت کرد، نەچووی بۆ پەرستەگای ئەرتەمیس Artemis و پاکانەت لە خۆ کرد و، دووبارە پەیمانمان بە یەك نەدا؟

ئۆرۆنتا دانی پیّ نا کە قسەکان راستن. کۆرووش گوتی: ئەدی ئەمجارە چ خراپەیەکم کردبوو تا خیانەت لەمن بکەیت، ئایا دان دەنێیت کەوا رەفتارت بەرانبەر بە من راست نەبو؟

ئۆرۆنتا گوتی: بەڵیّ ناچارم دانی پیّ بنێم.

کۆرووش گوتی: دەتوانم لە تۆ راببینم کە لەمەو پاش دژاتیی شا دەکەیت و لەگەڵ من دۆستایەتیی دەنوێنی؟

ئۆرۆنتا گوتی: ئەگەر واش بڵێم، باوەڕ مەکە[1]

ئینجا کۆرووش ئەم قسانەی کرد: ئەوەتا کردارەکانی ئەم پیاوە لەبەر چاوتانە. کلێرخۆس تۆ دەڵێی چی؟

کلێخۆس گوتبووی: دەبیّ بەزووترین کات لەسەر رێی خۆمان لادەین تا دەستمان بپەرژێتە سەر ئیشی خۆمان دەنا ناکریّ هەر بیر لە وی بکەینەوە کە ئایا چاکە دەکات یان خراپە

کلێرخۆس گێڕایەوە کە هەموو ئەم رایەیان پەسند کرد و ئینجا هەستانەوە سەر پیّ، لەوانە خزمەکانی ئۆرۆنتا، قۆڵیان گرت کە ئەمە نیشانەیەك بوو کەوا بریاری مەرگی دراوە. واش کە بردیان، کەسانێکی کە پێشتر فێر ببوون سەری رێزیان بۆ دادەنواند، ئەگەرچی دەیانزانی دەکوژرێت، واش هەر بە رەوشتی ئاسایی خۆیان سەری رێزیان بۆ دادەهێنا. ئیتر بردیان بۆ رەشماڵێکی دیکە، رەشماڵی یەکێك لە باوەڕ پێکراوە هەرە نزیکەکانی کۆرووش، لەمە بەدوا کەس بە زیندوویی نەیدیت و کەسیش بە ئاشکرایی ناوی نەدەهێنا. قسەڵۆك زۆر بوون بەڵام کەس قەبریشی نەدیت.

---

[1] ئەم قسە ئەگەر راست بێت زۆر گرینگە چونکە وای دیار دەخات کە ئەفسەرە فارسەکان یەکجار راستگۆ و مەردانە بوونە.

## چاپتەر -٧-

# کۆرووش بۆ شەڕ ساز دەبێ
# بەڵام شا دەکشێتەوە

لێرەوە بەرەو ولاتی بابل پێشڕەویی کرد و بە ڕێپێوانێکی سێ ڕۆژی ٣٦ فەرسەخی بڕی. لە کۆتایی ڕۆژی سێیەمدا کۆرووش بە نیوەشەو پارادێکی بە لەشکر کرد، وای دەزانی سبەینێ بەرەورووی سوپای شا دەبێتەوە. کلێرخۆس لەسەر باڵی ڕاست دانرا و مینۆن و تێسالییەکان لەسەر باڵی چەپ، و خۆی لە ناوەڕاست.

بەری بەیانی هەندێك لە هەڵگەڕاوەکان لە هێزی شا گەیشتنە لای کۆرووش و زانیارییان پێی ڕاگەیاند. ئینجا بۆ بەرزکردنەوەی ورەیان کۆرووش کۆبوونەوەی بە جەنەراڵ و کاپتنە یۆنانییەکان کرد و ئەم گوتارەی دا:

سەربازانی یۆنانی، کە شەڕ بە ئێوە دەکەم لەبەر ئەوە نیە ژمارەی هێزەکانی دیکەم کەمن. نەخێر، بەڵکو بەهۆی ئەوەیە کە بیرم کردۆتەوە ئێوە لە جەنگدا تواناتان لە خەڵکە ناوچەییەکان زۆرترە بۆیەش دەمەوێ خۆتان ئەوها پێشان بدەن کە شایستەی ئەو ئازادییە و ئەو شادییەن کە بۆ خۆتانی دەخوازن. باوەڕ بکەن، ئەو جۆرە ئازادییە بەگرینگتر دەزانم لە هەموو مڵك و ماڵێك، بەڵام بۆ ئەوەی بزانن چ جۆرە شەڕێکتان لەپێشە با بۆچوونی خۆم باس بکەم. ژمارەی دوژمن لە ژمارەی ئێمە زۆر گەورەترە و کە هێرش دەکەن هاوار و هەرایەکی گەورە دەنێنەوە، بەڵام ئەگەر خۆتان ڕابگرن ئەوسا زوو دەشکێن، جا ئەوسا ڕەنگە شەرم لە خۆم بکەم کە ئەوانە نەتەوەی منن. لێرە ئەگەر بەختم هەبوو و بارەکە بۆم هەڵسوڕا ئەوسا کێهەتان بیەوێ بچێتەوە ماڵێ خۆی، ئەوە بەجۆرێك دەچێتەوە کە خەڵك حەسودیی لێ بکەن. بەڵێن بێت کە واتان لێ بکەم مانەوەتان لە چونەوەتان بە باشتر بزانن

گاولیتیس ئامادەی کۆبوونەوەکە بوو هەستایەوە و گوتی: کۆرووش، خەڵکێك دەڵێن تۆ ئەو هەموو بەڵێنانە دەدەیت چونکە ئێستا لە تەنگانە دایت، دەنا ئەگەر بۆت هات ئەوسا لەبیرت دەچین. هەندێك کەسیش دەڵێن تۆ ئەگەر بتخوازی بەڵێنەکانت بەجێ بهێنیت هەر ناتوانیت.

کۆرووش گوێی راگرت، ئینجا گوتی: سەربازەکان، ئیمپراتۆرییەتی باوکم هەندە بەرینە کە لە باشووردا زۆر گەرمە و لە باکووردا هەندە ساردە کەس لێی ناژیێت. هاورێکانی براکەم لەو میانەدا بوونەتە شارەوانی گەورە، جا ئەگەر سەرکەوتین ئەوسا مەگەر هەر بەوە رابگەیم برادەرانی خۆمان بکەم بە لۆرد و دەسەڵاتدار ئەو هەموو وڵاتانە، تەنانەت من لەوە دەترسم کە هەندە برادەرم نەبێ بای ئەوەی دەسکەوتەکان بەشمەوە؟!. جا ئەگەر ئیشەکە باش رۆیشت ئەوسا چ بەشمەوە، سەرو تارایەکی زێڕ وەردەگرن

کە ئەم قسانەی کرد یۆنانییەکان هەندەی تر گەرم بوو. قسەکە بڵاو بۆوە و خەڵکەکە دەچوونە لای کۆرووش، ئەویش بەڵێنەکانی تاکید دەکردەوە. کلیێرخۆس پرسیارێکی لێ کرد بەم جۆرە: باوەڕ دەکەی براکەت بێتە مەیدانی شەڕ؟

کۆرووش گوتی: ئەدی چۆن؟ مەگەر کوڕی دارا و پەریزاد نەبێت و مەگەر برای من نەبێت دەنا چۆن خۆی لە شەڕ دەدزێتەوە؟ پاشان منیش بەبێ شەڕ دەسەڵاتم ناوێت

سەرژمێرێك بۆ لەشکر ئەنجام درا: لە ریزی یۆنانییەکاندا ١٠٤٠٠ هۆپلیت و ٢٥٠٠ پەلتاست هەبوون. هێزە ناوچەییەکانیش ١٠٠٠٠٠ کەس دەبوون ویڕای ٢٠ عەرەبانەی تیغدار[1]. لەلای دوژمندا دەڵێن ملیۆن و دووسەد هەزار سەرباز ویڕای ٢٠٠ عەرەبانەی تیغدار و ٦٠٠٠ سوارە لە پاسەوانانەکی شا هەبوون لەژێر فەرماندەیی ئاتەگەرسدا[2]. رابەرایەتیی سوپای شا لەدەست چوار فەرماندە بوو. ئەبرۆکۆم، تیزافەرنە، گۆبریا، ئەرباك. هەریەك ٣٠٠٠٠٠ چەکداری هەبوو. بەڵام تەنیا ٩٠٠٠٠٠ لەو سوپایە ئامادەبوون چونکە ئەبرۆکۆماس پێنج رۆژ پاش شەڕەکە گەیشتە جێ. ئەم زانیاریانە لەرێگای هەڵگەڕاوەکان بە کۆرووش راگەیێندران، هەروەها پاش شەڕەکە هەندێك لە ئەسیرەکان هەمان قسەیان کردەوە.

---

[1] عەرەبانەی تیغدار، رەنگە زۆربەی خوێنەران لە فیلمە مێژووییەکاندا دیتبێتیان چۆن عەرەبانەیان دروست دەکرد کە تەنیشتەکانیان بە تیغی ئاسن داتەنرا بۆ لەتوپەتکردنی ریزەکان دوژمن.

[2] دووبارە دەبین کە ژمارەی هێزەکان دوورەچاو بە گەورە مەزەندە دەکات دەنا ئەمڕۆ ئەمەریکاش هەندە سەربازی پێ بەخێو ناکرێت؟!!

ئەو رۆژە کۆرووش بە ئامادەباشیەوە نۆ فەرسەخ ریگای بری. بە ئامادەباشی دەرۆیشت چونکە وای رادەدەیت بەرەورروو دوژمن بیتەوە بەلام لە نیوەرۆدا تووشی خەندەکێك بوون پینج فاتۆم بەرین و سێ فاتۆم قوڵ. خەندەکەکە لەم سەر بۆ ئەوسەر بەدرێژایی دیواری میدی[1] هەلکەندرابوو. باش بوو کە لە نزیك رووبارەکە دەربازێکیان دۆزیەوە بە پانایی ٢٠ پێ، کۆرووش و لەشکرەکەی بەویدا پەرینەوە. شایانی گوتنە کە ئەو خەندەکە بە فەرمانی شا هەلکەندرابوو چونکە بیستبوی وا کۆرووش هەلمەتی بۆ دێنێت.

ئەو رۆژە شەرەکە نەکرا بەلام شوێنەوارێکی زۆر دیرا لە شوێن سمی ئەسپ و شوێن پای پیادە. کۆرووش بەدوا سیلانۆسی دا نارد، فالگرێکی ئەمرکادی بوو، ٣٠٠٠ داریکی پێ بەخشی چونکە ١١ رۆژ پێشتر پێشبینی کردبوو کەوا لەم ١٠ رۆژەی ئاییندەدا شەر روو نادات. کۆرووشیش پێی گوتبوو : ئەگەر لەم ١٠ رۆژەدا تووشی شەر نەبین ئەوا بەیەکجاری واز لە شەر دێنم و ئەگەر قسەکەت راست دەرچوو مەرج بێت کە من ١٠ تالەنت بەتۆ دەبەخشم.
١٠ رۆژەکەش بەسەر چوبوو، ئیتر پارەکەی پێ بەخشی.

بە گوێرەی کەوا شا لەلای خەندەکەکەدا شەری نەکرد، کۆرووش و یاوەرەکانی هاتنە سەر باوەرێك کە رەنگە شا هەرگیز شەر نەکات، جا رۆژی دووەم هەندە وریا نەبوون و تەنانەت لە رۆژی سێیەمدا چەکدارەکان بە بلاوی دەرۆیشتن و چەکەکانیان خستبۆوە نێو عەرەبانەکان.

---

[1] دیواری میدی (Median Wall) دیوارێکی دوور و درێژ بوو لەنێوان فەللوجە و بەغدای ئەمرۆ دروست کرابوو ١٥٠ سالێك پێش ئەو کاتەی زینۆفۆن. دیوارەکە بە فەرمانی نەبووبلاسەر (پاشای بابل) دروست کرابوو لە ترسی میدیەکان. خۆی نەبووبلاسەر لەگەل میدیا رێك کەوت دژبە ئاشوور و لە ٦١٢ پ.ز. ئاشووریان بەزاند، بەلام دواتر میدیەکان جێی باوەر نەمان بۆ بابلیەکان بۆیەش ئەو دیوارەیان دروست کرد. ئەو دیوارە شوێنەواری نەماوە بەلام تا ئێستاش سنووری نێوان ناوچە شیعەکان (ولاتی بابل لە باشووری ئەو دیوارە) لەگەل ناوچە سوننەکانی عیراق (باکووری دیوارەکە) دیار دەخات.

## چاپتەر -٨-
## شەڕەکەی کوناکسا و مەرگی کۆڕووش[1]

بەیانی داهات و کات گەیشتە پێش نیوڕۆ و هێشتا نەگەیشتبوونە ئەو جێگەی کە کۆڕووش بڕیاری دابوو تێدا پشوو بدات، لەو کاتەدا پاتەگیا (پاوێکی فارس بوو برادەری کۆڕووش) لە دوورەوە پەیدا بوو. بەسواری ئەسپێکی ئارەقە کردوو بە خێرایی دەهات و بە فارسی و یۆنانی هاواری دەکرد کە شا و سوپاکەی وا نزیك دەبنەوە.

سەرشێوان و ئاڵۆزی بەرپابوو، هەرکەس لە جێوە تاوی دەدایە چەکێك و غاری دەدا بۆ ریزی خۆی وایان دەزانی کە هەر ئێستا بەسەریاندا دەدەن. کۆڕووش لە عەرەبانەکەی دابەزی، زرێکەی پۆشت و سواری ئەسپێك بوو و رمبێکی بەدەستەوە گرت، ئینجا فەرمانی دا کە هەموو شوێنی خۆیان بگرن. سەبازەکان بە حاڵ پێیان کرا ریز بن.

کلێرخۆس لەسەر باڵی راستی لەشکر لە تەنیش رووباری فوڕات دامەزرا، پرۆکسینۆس لە تەنیشت کلێخۆس دامەزرا و، ئینجا مێنۆن لەگەڵ یۆنانییەکانی دیکە لەلای چەپی هێزە یۆنانیەکان دامەزرا بوو. هێزە ناوچەییەکان بریتی بوون لە ١٠٠٠ سوارەی پافلاگۆنی لە لای کلێرخۆس ریز ببوون، هەروەها پەلتاستی یۆنانیش لەلای راستدا لەگەڵ کلێرخۆس ریز ببوون. ئاریا (جێگری کۆڕووش) لەسەر باڵی چەپ لەگەڵ هێزە ناوچەییەکانی دیکە وەستابوو، کۆڕووش و

---

[1] خوێنەران دەتوانن نموونەی ئەم دیمەنە مێژووییەی لەو فیلمەدا ببینن کە بەم ساڵانەی دوایی دەرچوو بەناوی (ئەسکەندەری مەزن). ساڵی ٢٠٠٦ کە چاپی یەکەمی ئەم کتێبەم بڵاو کردەوە ئەوسا ئەو فیلمە دەرنەچووبوو، بەڵام کە فیلمەکەم دیت و بەتایبەتی ماستەرسینەکەی شەڕەکەی گۆگەمیلا (لەنێوان هەولێر و مووسڵ رووی داوە) دیمەنەکە وەك بڵێی لە نووسینەکانی زینۆفۆن وەرگیراوە بەتایبەتیش کە ئەسکەندەر لە دوورەوە چاوی بە داریۆسی سێیەم دەکوێت و هاوار دەکات (I see him -دەیبینم). هەر ئێستا هەمان شت لێرە دەبینین. ئیتر گومانم نیە کە نووسەرانی شەڕەکەی (گۆگەمیلا) سوودیان لە یاداشتەکانی زینۆفۆن وەرگرتووە چونکە زینۆفۆن ٦٠-٧٠ ساڵێك پێش شەڕەکەی گۆگەمیلا یاداشتەکانی خۆی نووسیوە.

٦٠٠ سوارەی خۆی لە ناوەڕاستی لەشکر ریز ببوون کەوا لە سینگ تا سەر لەژنۆ بە زریٚ داپۆشرابوو تەنانەت سینگ و نێوچەوانی لەسپەکانیشیان هەر بە زریٚ داپۆشرابوون.

نیوڕۆ داهات و هێشتا دوژمن دیار نەبوو بەلاّم پاش نیوڕۆ تۆز وەکو هەورێکی سپی لە ئاسۆ هەڵستا، ئینجا هێلێکی رەش بەدرێژایی ئاسۆ دەر کەوت. کاتێك نزیکتر بوونەوە ئەوسا تریسکەی برۆنز دیترا، سەرە رمب و نێزەکانی دوژمن رۆنتر دەبوون، هێزی سوارە لەلای چەپی سوپاکەیان دەدیتران و گوتیان گوایە تیزافەرنە رابەرایەتی دەکردن. لە تەنیشت ئەوانە سەربازی زرێپۆش ریز ببوون، ئینجا هۆپلیت دەکەوتن بە قەڵغانی دارینەوە، گوتیان میسری بوون. ئەوجار جۆرەها سوار و تیرەنداز پەیدا بوون و تێکڕای ئەوانە بە تاقمی لاکێشەیی بەرەو پێش دەهاتن، ولە پێش ئەوانەوەشدا عەرەبانەی تیغدار هەبوون، ئەوانە تێغیان تێ خرابوو تا ریزەکانی دوژمن پەرت بکەن.

قسەی کۆرووش کە پێشتر لەگەڵ جەنەراڵە یۆنانییەکانی کردبوو، کە گوتبوی ئەوانە بە هات و هاوارەوە هێرش دەکەن، ئەمە راست دەرنەچوو چونکە تا ئێستا بە هەسپایی و بەبێ دەنگی و بەشێوازێکی رێك دەهاتنە پێش.

لەم کاتەدا کۆرووش و پیگرە (تەرجومانەکەی کۆرووش) و چەند کەسێك هاتنە لای یۆنانیەکان و کلێرخۆسیان بانگ کرد. پێیان گوت دەبێ لەشکرەکەی بەرەو ناوەڕاستی دوژمن رابدات چونکە شا لەوێیە و ئەگەر لەوەدا سەرکەوتن ئەوسا هەموو شتێك بەسەر دەچێت. کلێرخۆس لە تەماشایەکی سوپای شای کرد، سوپاکە هەندە زل بوو کە ناوەڕاستەکەی کەوتبوە بەرانبەر باڵی چەپی لەشکرەکەی کۆرووش. دوودڵ بوو لەوەی کە لە رۆخی رووبارەکە دوور بکەوێتەوە نەبادا گەمارۆ بدرێت، واش هەر وەلاّمی بە کۆرووش دایەوە کە دواتر بیرێکی لیٚ دەکاتەوە و ئەگەر بە باشی زانی ئەوسا دەیکات.

لەو کاتەدا سوپای فارس وردەوردە بەرەو پێش دەهات و یۆنانییەکان هێشتا لە جێی خۆیان وەستابوون و سەبازەکان شوێنەکانی خۆیان پڕ دەکردەوە. کۆرووش بەپێش ریزەکاندا تێپەڕی سەیری هەردووك لای دەکرد، لای دوژمن و لای تیپەکانی خۆی. زینۆفۆن کوڕێکی لەتینیی

بوو[1]، لەنێو ریزە یۆنانییەکانەوە چاوی بە کۆرووش کەوت، بۆی چووە پێش تا بزانێت کە ئایا هیچ فەرمانێکی هەیە؟

کۆرووش گوتی: فالّ و قوربانییەکان باشن و پێی گوت کە ئەم قسە بە هەمووان رابگەیێنێت. لەم کاتەدا دەنگە دەنگێك لە نێو ریزی یۆنانییەکان هەستا. کۆرووش پرسی ئەم دەنگە چیە؟

زینۆفۆن گوتی: وا بۆ جاری دووەم ناوی نهێنی بلاّو دەکرێتەوە.

کۆرووش پرسی: ئایا کێ ناوی نهێنی داناوە و ناوەکە چیە؟

زنۆفۆن پێی گوت ناوەکە ئەمەیە "زیۆسی گەیێنەری سەرکەوتن"

کە ئەمەی بیست گوتی: باشە، با وا بێت.

ئیتر ئەسپەکەی بۆ ناوەندی لەشکر تاو دا.

لەو کاتەدا مەودای نێوان دوو لەشکرەکە ٦٠٠، تا ٨٠٠ یارد مابوو، یۆنانییەکان سروودی پایانیان خوێند و بەرەو دوژمن پێشڕەوییان کرد. کە بەرێ کەوتن بەشێکی ریزەکان هەندێك پێشتر کەوتن و ئەوانەی داوتر دەیانویست بگەنەوە پێش. لە هەموو هاوارێکیان بەرز کردەوە وەکو هەلهەلە (Elelu) کە خەلّك بۆ خواوەندی جەنگ دەیکەن، و هەر هەندەیان زانی وا راستەوخۆ بەرەو دوژمن غار دەدەن. هەندێك کەس دەلّێن سەربازەکان بۆ ئەوی ئەسپەکانی دوژمن بترسێنن تەقەتەقیان بە قالّغان و رمبەکانیان دەکرد. بەلاّم پێش ئەوەی بگەنە مەودای تیرەندازان ریزەکانی فارس هەژان و هەلاّتن. یۆنانییەکان بە گورجی راویان نان، هاواریشیان دەکردە یەکتر کە غار نەدەن بەلّکو راویان بنێن بەبێ ئەوەی ریزەکانیان تێك بچێت.

عەرەبانە تیغدارەکان بە تیژی هێرشیان کرد، هەندێکیان بێ شوفێر بوون و هەندێکیان بۆ ریزەکانی دوژمن رەوینەوە و هەندێکیشیان ریزی یۆنانییەکانیان بڕی. کە عرەبانەکانیان دیت

---

[1] ئەمە یەکەم جارە زینۆفۆن ناوی خۆی بێنێت، هەر وەك دیاریشە باسی خۆی دەکات وەکو کەسی سێیەم. هەروەها ئەمە یەکەم جار و دواجاریش بوو کە زینۆفۆن قسە لەگەلّ کۆرووش بکات. تەنانەت هەست دەکەم وەك بلّێی زینۆفۆن ویستوویەتی خۆی (رەبێش) بخات دەنا کۆرووش چ کارێکی بەو سەربازە بچووکە بووە؟ من لە کاتی خۆیدا کە ناوی زینۆفۆن دەهات وام دەزانی سەرکردەیەکی گەورە بووە، کەچی لەراستیدا گەنجێکی بچووك بووە و تەنیا بە هۆی برادەرێکەوە (پرۆکسینۆسی بۆیۆتی) رەگەلّ ئەو لەشکرە کەوتبوو.

یۆنانی ریزەکانیان ئاوالّە کرد بۆ ئەوەی عەرەبانەکان بەبیّ زیان رەت بن بەلاّم یەکێك لە سەربازەکان خۆی لە شوێنەکەیدا چەقاند جا عەرەبانەکە بەسەریدا رۆیشت، واش دەڵێن بریندار نەبووە. لەو شەڕەدا هیچ زیانێك بە یۆنانیەکان نەگەیشت تەنیا یەك پیاو نەبیّ لە ریزەکانی چەپدا گوتیان تیرێکی بەرکەوتووە.

کۆرووش شاد ببوو کە دەیدیت وا یۆنانییەکان سەردەکەون و دژمن بە پێشە خۆیان رادەدەن. ئەوانەی لەدەوری بوون وا تێگەیشتن کە ئیتر تەواو، کۆرووش بوو بە شا. بەلاّم خۆی لەبیر نەکرد بای ئەوەی کە فارسە شکاوەکان راو بنێت بەڵکو راوەستابوو چاوی دەگێرا کە بزانیّ شا چ دەکات؟ لەلای مسۆگەر بوو کە شا لە ناوەڕاستی سوپاکەی وەستاوە و گومان نیە کە هەموو سەرکردە فارسەکان لە ناوەڕاستی هێزەکانیان دەوەستان. فیکرەکە لەوە دایە کە لە ئاسوودەترین جێگە راوەستن بۆ ئەوەی ئەملا و ئەولایان بپارێزرێت، هەروەها بۆ ئەوەی بتوانن فەرمان بە لایە دوزوورەکان بدەن، ئەوسا فەرمانەکە بە زووترین کات دەگاتە جیّ. ئەو رۆژەش هەمان شت بوو، شا لە ناوەڕاستی سوپاکەی وەستابوو بەلاّم بۆ کۆرووش، شا کەوتبوە سەر باڵی چەپ. کە دیتی هێزەکانی بەرانبەر هیچ ناکەن هەستا وەك جۆرێك تەوق کردن بۆ لای راست شکاندییەوە.

کۆرووش لەوە ترسا کە شا پشتی یۆنانییەکان گەمارۆ بدات، هەستا راستەوخۆ بۆی چوو. بە خۆ و بە ٦٠٠ سوارەوە هێرشی کرد و ریزەکانی شکاندن. هێزێکی ٦٠٠٠ سوارەی رامالّی و دەڵێن کۆرووش بە دەستی خۆی ئەرتەگەرسەی کوشتوە کە سەرکردەی ئەو هێزە بوو. بەلاّم کە هێرشەکەیان کردووە ٦٠٠ سوارەکە ریزیان تێك چووە و پەرت بوونە و ژمارەیەکی زۆر کەم لەگەڵ کۆرووش مابوون، ئەوانەی کە پێیان دەگوترا هاوخوانە (واتە هاونشین). کاتێك بەتەنیا لەگەڵ ئەوانە دەمێنێت لە دورەوە چاوی بە شا دەکەوێت کەوا بە چەند ریزێك چەکداری چڕ و پڕ پارێزرابوو. بەبیّ سیّ و دوو هاواری کردووە (دەیبینم) و راستەوخۆ هێرشی بۆ کردووە و زەبرێکی توندی لیّ داوە کەوا زرێکەی سەر سینگی بریوە، هەروەکو دکتۆر کتیسیاس Ctesias باسی کردبوو گوتبوی شای بریندار کردبوو چونکە خۆی برینەکەی تیمار کردبوو. بەلاّم هەر لەو کاتەدا کە خەریکی دەست وەشاندن بوو سەربازێك رمبێکی توند لەژێر چاوی دەدات.

کەتیسیاس لەو شەڕەدا لەگەڵ شا بووە و دەیگێڕێتەوە کەوا چەندەها کوژراو لەلایەن شا کەوتبوون بەڵام کۆڕووش و هەشت لە یاوەرە خانەدانەکان (Nobles) هەموو کوژران و تەرمەکانیان کەوتنە سەر تەرمی کۆڕووش. دەڵێن کەوا ئەرتەپاتا، نۆکەرێکی زۆر نزیکی کۆڕووش بوو، کە دیتویەتی کۆڕووش کەوتووە ئەوسا خۆی بەسەر تەرمەکەی کۆڕووش داداوە. هەندێك کەس دەڵێن شا فەرمانی داوە کە لەسەر تەرمی کۆڕووش بیکوژن، هەندێك کەسیش دەڵێن ئەرتەپاتا لەسەر تەرمەکەی کۆڕووش خۆی کوشتوە کەوا خەنجەرێکی زێڕی هەبوو. هەروەها بەچەشنی خانەدانە فارسەکان ئەرتەپاتا ملوانکە و بازن و زیوەری لەبەر دەکرد چونکە نۆکەرێکی هەندە بەئەمەك بوو کۆڕووش باوەڕ و پایەیەکی گەورەی پێ بەخشبوو.

## چاپتەر -٩-
# پاش شەرەکە

سەری کۆرووشیان بری لەگەڵ دەستی راستی. شا کەوتە پێشرەوی و چوە نێو ئۆردوگای کۆرووش. پیاوەکانی ئاریا لەوێ گیر نەبوون بەڵکو کشانەوە بۆ کۆنە ئۆردوگای رۆژی پێشو کە ١٢ فەرسەخ دوور بوو. لەمیانی ئەو هەموو تالانەی کە بەدەست پیاوانی شا کەوت خانمە دۆستێکی کۆرووشیان گرت، کچە فۆکاییەکە Phocaean کە دەڵێن جوان و زیرەکیش بوو، دۆستەکەی دیکەی کۆرووش، ئەو خانمە گەنجەی کە خەڵکی میلەتۆس بوو، ئەویش گیرا بەڵام بە نیوەرووتی هەڵات بۆ لای هەندێك پاسەوانی یۆنانی کە لەلای شمەکەکان مابوونەوە، ئەوانە ریزیان بەست و هەندێك لە تالانچییەکانیان کوشت و هەندێکیان لێ کوژرا و هەڵاتن و کچەکەشیان رزگار کرد، و هەموو پارە و شمەکی کە بەوان سپێردرابوو هەموویان دەرباز کرد.

لەم قۆناغەدا لەشکری یۆنانی سێ فەرسەخ لە یەکتر دوور کەوتبوونەوە، یۆنانی هێزە فارسەکەی پێش خۆیان راو نا وایان دەزانی سەرکەوتنێکی یەکجارییان ئەنجام داوە، فارسەکانیش بەهەمان شێوە خەریکی تالانکردنی ئۆردوگاکە بوون وایان دەزانی سەرکەوتنێکی یەکجارییان تۆمار کردووە. بەڵام دواتر یۆنانییەکان زانیان وا ئۆردوگاکەیان تالان دەکرێت. شا کە لە تیزافەرنەی بیست وا یۆنانی راوی بەشێکی سوپاکەی دەنێن، خۆی بۆ شەڕ ساز کرد. کلێرخۆس بەدوا پرۆکسینۆسی دا نارد چونکە لە هەموویان لێی نزیکتر بوو، پرسی پێ کرد ئایا باشتر ئەوەیە تیپێك بنێرنەوە بۆ پاراستنی ئۆردوگا یاخۆ هەموو پێکەوە بمێنن؟ لەم کاتەدا زانییان کەوا شا لەدواوە بۆیان دێت. یۆنانی بڕیان کردەوە و رویان وەرسوڕاند بۆ بەرەنگاریی کردنی شا کەچی شا هێزەکانی بەم لایەدا نەهێنا. وەك چۆن پێشتر بەسەر باڵی چەپی دادابوو، لەم جارەش هەمان شتی کرد و پەلاماری ئەوانەی دا کە لە لەشکرە سەرەکییەکە دابڕابوون. جگە لە شا، تیزافەرنە و هێزەکانی هەمان شتیان دەکرد.

تیزافەرنە لە یەکەم بەرەنگاریدا هەڵ نەهات بەڵکو هێرشی کردە سەر پەلتاستەکانی نزیك رووبارەکە و ریزەکانی شکاندن، واش هەر تاکە کەسێکی پێ نەکوژرا. یۆنانی ریزەکانیان ئاواڵە

کرد و بە رمب و شمشێر لە پیاوەکانیان دەدان. ئەپستینیسی لەمفیپۆلیس سەرکردەیان بوو، دەڵێن لەوێدا توانا و ئازایەتییەکی سەیری نواندوە.

تیزافەرنە کە دیتی وا لەم ڕەددوبەدەرە خراپترین ئەنجامی بەدەست هێناوە، ئەمجارە نەسوڕایەوە بۆ هێرشێکی تر بەڵکو ڕاستەوخۆ ڕووی کردە ئۆردوگای یۆنانییەکان بۆلای شا، لەوێدا هەموو هێزەکانی ڕێك خست و بەشێوازی جەنگی لەسەر باڵی چەپی یۆنانییەکان ریز بوون. یۆنانی ترسان کە پەلاماری ئەم باڵە بدەن و ئینجا بە هەردووك لادا بازنەیەك لەدەوریاندا دروست بکەن و ڕەنگە وردوخاشیان بکەن. بۆیە، باشتر لەوەبوو ئەم باڵە پانتر بکەنەوە و ڕووبارەکە بخەنە پاڵ پشتیان. کە ئەوان خەریکی ئەم مانۆڕە بوون، شا ڕێگای گۆڕی و هاتە بەرانبەر ریزەکانی پێشەوەی یۆنانییەکان، واتە هەمان جێگەی کە لەسەرەتادا لێی بوون.

کە یۆنانی دیتیان وا لەبەرانبەریان ریز بوونە سرودی پایانیان خوێند و بە شێوەیەکی لەجاران درتر هێرشیان کرد، لەمجارە فارس تەنانەت هەندی جارەکەی پێشتریش خۆیان را نەگرت بەڵکو هەر زوو شکان و یۆنانی راویان نان تا گەیشتنە گوندێك. راوەستان چونکە گردێکی لێ بوو سەری گەردەکە پڕ بوو لە چەکداری دوژمن، لەوێ بەرەنگکاری دەکرا. پیادەکان هەڵاتبوون بەڵام سوارەکان سەری گردەکەیان گرتبوو و نەدەکرا بزانرێت چ لە ئارا دایە. هەندێك دەڵێن دروشمی شا لەسەر گردەکە بوو، داڵێکی زێڕین بوو لەسەر رمبێکدا باڵی بەپانی کردبۆوە.

یۆنانی بەرەو گردەکە دەچوون کاتی کە سوارەکانیش دەستیان پێکرد بڵاوە بکەن، هەر تاقمە و بەلایەکدا هەڵدەهاتن و سەری گردەکە چۆڵ کرا. کلێرخۆس نزیکی گردەکە نەکەوتەوە بەڵام لیسیۆسی سیراکۆزیی لەگەڵ چەند پیاوێك نارد سەیری ئەودیو بکەن. لیسیۆس بە سواری چوو و گەڕایەوە، گوتی دوژمن وا لە کشانەوە دان. لەم کاتەدا خۆر ئاوا دەبوو، یۆنانییەکان وەستان، چەکیان لە خۆ داماڵی و پشوویان دا، پرسیاریان دەکرد بۆچی کۆرووش سۆراغی نیە تەنانەت نامەیەکیشی نەناردووە؟ نەیاندەزانی مردوە وایاندەزانی دژمن راو دەنێت یان خەریکە جێگایەکە داگیر دەکات. کەوتنە گفتوگۆ، ئایا بگەڕێنەوە یان بوەستن؟ بڕیار درا کە بگەڕێنەوە، کە گەڕانەوە ئۆردوگا کاتی نانی شێوان بوو دیتیان هەموو ئاو و خۆراك و شمەکیان تالآن کراون، هەندێك عەرەبانەش هەبوون (گوتیان ٤٠٠ عەرەبانە دەبوون) پڕ لە شەراب و جۆ کە کۆرووش بۆ یۆنانییەکانی دانابوو، هەموو بەدەست پیاوانی شا تالآن کرابوون. نانی نیوڕۆشیان نەخواردبوو لێرە یۆنانییەکان ئەم شەوەیان لەوها بەسەر برد.

## چاپتەر -١-
# نامەبەری شا

بەری بەیانی، جەنەرالەکان کۆبوونەوە سەیریان پێ دەهات کە کۆرووش هێشتا سۆراغی نیە. بریاریان دا شمەکیان کۆ بکەنەوە و برۆن رەگەڵ کۆرووش بکەونەوە بەڵام هێشتا بەرێ نەکەوتبوون و هێشتا خۆر هەڵاتبوو کە پرۆلکیس، فەرمانرەوای تەوترانیا و نەوی داماراتۆسی سپارتی، لەگەڵ گلاوس، کوری تامۆس، گەیشتن و هەواڵەیان گەیاند کەوا کۆرووش مردووە و ئاریا و هێزە ناوچەییەکان هەڵاتوون بۆ لۆردوگای دوێنێ. نامەکەی ئاریا رایدەگەیاند کە ئەو تا سبەینێ چاوەرێیان دەکات دەنا دەگەرێتەوە بۆ ئایۆنیا.

کە یۆنای ئەمەیان بیست خەفەت و نائومێدییەکی قورسیان بەسەردا هات، کلێرخۆس ئەم قسانەی کرد: خۆزیا کۆرووش زیندوو بایە، بەڵام ئێستا کە مردووە، بە ئاریا بڵێن کە شا بەدەستی ئێمە بەزیوە و هیچ بەرەنگارییەك لەپێشمان نەماوە. خۆ نیازیشمان هەبوو دیسان بەگژیدا بچینەوە. بەڵێن بە ئاریا دەدەین ئەگەر بێت دەیخەینە سەر تەختی شا. لەوانەی کە لە مەیدان سەردەکەون، مافی ئەوەشیان هەیە باڵادەست بن.

ئەم وەڵامەی بۆ ناردەوە و خیریسۆفۆسی سپارتی و مێنۆنی تێسالیی لەگەڵدا ناردەوە. مێنۆن حەزی دەکرد برۆات چونکە برادەری ئاریا بوو و زۆر جار مێوانداریی کردبوو. کە رۆیشتن، کلێرخۆس مایەوە. لەشکر خۆراکی پەیدا کرد بە کوشتنەوەی هەندێك گا و بارگین کە بۆ گواستنەوەی شمەکەکان تەرخان کرابوون. سوتەمەنییش بەوە پەیدا کرا کە هەندێك پیاو چوونەوە بۆ مەیدانی شەرەکە، لەوێدا رمب و تیرێکی بێژمار کەوتبوون وێرای قەڵغانە دارینەکانی میسرییەکان، هەروەها قەڵغانە بچووکەکان و عەرەبانەی بێ شوفێر. قەڵغانەکانیان بۆ گۆشت کوڵاندن بەکار هێنا، بەمەش جەمی ئەو رۆژەیان دەستکەوت.

هێشتا جەرگەی بەیانی بوو کە شاندێك نامەبەر لەلایەن تیزافەرنە و شاوە هاتن. هەموویان ناوچەیی بوون تەنیا فالینۆس نەبێت، لە ناوەکەی را دیار بوو کە یۆنانییە، ئیشی بۆ تیزافەرنە

دەکرد و دیاربوو زۆر رای لێ بوو چونکە، وەکو باسی کرد، شارەزای مەشق و مانۆڕی سەربازی بوو. ولاَغیان بۆ لای یۆنانییەکان لێ خوڕی و داوایان کرد لەگەڵ جەنەراڵەکان بدوێن، گوتیان ئێستا کەوا شا سەرکەوتووە و کۆرووشی کوشتووە، فەرمانی داوە یۆنانییەکان چەك دابنێن و بێن بۆ خزمەت تەختی شا تا ئەگەر بتوانن لێبوردنی شاهانە بۆ خۆیان وەدەست بێنن. یۆنانی بەم قسانە پەست بوون. کلێرخۆس گوتی: زاڵ چەکی دانانێت. بەلاَم هەرچۆنێك بێت راوەستن هەندەم پێ ناچێت، دەبێ بیر لە باشترین و سەربەرزانەترین وەلاَم بکەینەوە. ئەوەش چونکە ئەفسەرەکانی پێیان گوت با هەناوی قوربانییەك[1] بپشکنینەوە بۆ پێشبینی کردن.

ئینجا کلینۆری ئەرکادی، کە لەوانی دیکە بەتەمەنتر بوو، گوتی: مردن باشترە نەك چەك دانان، هەروەها پرۆکسینۆس گوتی: فالینۆس، من پێم سەیرە شا داوای چەك لە ئێمە دەکات، ئایا ئەمە بەهۆی ئەوەیە کە خۆی بە سەرکەوتوو دەزانێت یان لەبەر ئەوەیەتی کە دەیەوێ نیشانەیەکی ئاشتیانە لە ئێمەوە ببینێت! ئەگەر وەکو سەرکەوتوو قسە دەکا، کەواتە بۆچی داوا دەکات؟ دەبا بێتە ئێرە و چەکمان بکات. دەنا ئەگەر بە مەبەستی ئاشتییە، ئەوسا دەبێ بە ئێمە بلێت ئایا لەبەرانبەر شەڕوەستاندندا چ قازانجێك دەکەین؟

فالینۆس وەلاَمی ئەم قسەی دایەوە: کە شا خۆ بەسەرکەوتوو دەزانێت لەبەر ئەوەیە کە کۆرووشی کوشتووە، و ئێستا کەس نەماوە تەراتینە لەسەر تەختی شاهایەتی بکات؟ باوەڕی وایە کە ئێوەش لەژێر دەسەلاَتی خۆی دان. کۆرووش ئێوەی هێناوەتە ئێرە و ئێستا رووبارێکی بەرینتان لەدوایە و شا دەتوانێ هەندە پیاوتان بەسەردا بگێڕێت کە ئەگەر شەڕیش نەکەن پیاوەکان هەندە زۆرن تەنانەت فریا کوشتنیشیان ناکەون.

ئەمجارە تیۆپۆمپۆس، پیاوێکی ئەتینی بوو، قسەی کرد: فالینۆس، وەك دەبینی تاکە شتێکی بەنرخی کە هەمانە چەك و ئازایەتیی خۆمانە، تا چەکمان هەبێت سوود لە ئازایەتییەکە دەبینین،

---

1 مەسەلەی سەربڕینی ئاژەڵێك بۆ قوربانی، یۆنانییەکان وەکو جۆرێك فاڵ و ئیستیخارە و رێورەسمی دینی کردوویانە. لەمیانی ئەم تۆمارەی زینۆفۆندا دیار دەبێت کە باوەڕێکی گەورەیان پێ هەبووە و پێش هەموو بڕیارێکی گرینگ هەناوی قوربانیەکیان دەنۆڕی بۆ فاڵ و پێشبینی.

دەنا ئەگەر چەك نەما ئەوسا ژیانیشمان نامێنێت. جا باوەڕ مەکە تاکە سەرمایەیەکی خۆمان لەدەست خۆ بدەین.

فالینۆس خەندەیەکی هاتێ و گوتی: لاوۆ، تۆ بەچەشنی فەیلەسوفێك قسە دەکەیت، ئێوە شێتن ئەگەر وا بزانن ئازایەتیی لە ڕووی شادا سوودی دەبێت.

ئەوانەی ئامادەی ئەم قسانە بوون گوتیان هەندێك کەس دەستیان پێکرد ورە بەردەن و بڵێن (وەك چۆن دڵسۆزی کۆرووش بووین، ڕەنگە شا نرخی ئەم ڕاستییە بزانێت و بۆ خۆی بەکارمان بێنێت، بۆنموونە دژی میسر، پێکەوە داگیری دەکەین).

کلێرخۆس هاتەوە و پرسی کە ئایا گەیشتنە بڕیارێك؟ فالینۆس گوتی: ئەوانە کۆمەڵێك وەڵامیان داوەتەوە. کلێرخۆس، ئێستا تۆ دەڵێی چی؟

کلێرخۆس گوتی: فالینۆس، بەدیتنی تۆ شادم، تۆ وەکو خۆمان یۆنانیت و داوای ئامۆژگاری لە تۆ دەکەین، تکا دەکەم، تۆ چ چارەیەکی سەربەرزانە شك دەبەیت. با لە دوارۆژدا بگوترێ فالینۆس ئەو پیاوە بوو کە شا ناردی چەك یۆنانیەکان دابنێت بەڵام کە داوای ئامۆژگارییان کرد، فالینۆس ئەوها ئەوهای گوت و ڕزگاری کردن. وەك دەزانی ئامۆژگارییەکەت بۆی هەیە لە یۆنان باس بکرێتەوە.

کلێرخۆس ئەم جۆرە ئاماژەی باس کرد بە ئومێدی ئەوەی کە فالینۆس قسەیەك بخاتە بەر گوێی پیاوەکان کە ورەیان بەرز بکاتەوە تا چەکیان دانەنێن، کەچی فالینۆس خۆی پەڕاندەوە و بەشێوازێکی زۆر جودا قسەی کرد، گوتی: ئامۆژگاریی من ئەوەیە چەکتان دانەنێن. ئەگەر بەشەڕ بێت، ڕەنگە ئومێدتان لە ١٠٠٠ یەك بێت، دەنا بەبێ چەك هیچ ئومێدێکتان نیە. ئامۆژگاریتان دەکەم کە ئەو تاکە هەنگاوە بنێن کە دەشێ ڕزگارتان بکات.

کلێرخۆس گوتی: کەواتە سپاس بۆ ئامۆژگارییەکەت. ئێستا دەتوانی وەڵامەکەمان ڕاگەیێنی، ئێمە ئەگەر لەگەڵ شاهدا بیین بە برادەر، ئەوسا بەچەکەوە قازانجمان بۆ وی زیادتر دەبێت. وە ئەگەر بیین بە دوژمن، دیسان هەر بە چەکەوە باشترین.

فالینۆس گوتی: کەواتە ئەمەیە وەڵامەکەتان. دەباشە، شا ئەم ڕاسپاردەشی هەبوو کە تا ئێوە لە جێگەی خۆتان بن، ئاگربەست لە ئارادا دەبێت. بەڵام ئەگەر بەرەو پاش و پێش ببزوون،

ئەوسا شەڕە. ئیتر دەبێ وەڵامی ئەوەشم بدەنەوە کە ئایا لێرە دەمێنن بۆ ئەوەی ئاگربەستەکە لەئارادا بێت یاخۆ دەبزوون و شەڕ دەست پێ دەکاتەوە؟

کلیێرخۆس گوتی: بێ بڵێ ئێمەش وەکو ئەو بیر دەکەینەوە.

فالینۆس گوتی: ئەمە چ دەگەیێنێت؟

کلیێرخۆس: ئەگەر بوەستین، ئاگربەستە. و ئەگەر ببزوین، شەڕە.

فالینۆس گوتی: کەواتە بلێم چی، ئاگربەستە یان شەڕە؟

کلیێرخۆس وەڵامێکی ئەوتۆی نەدایەوە: تا لێرە بین، ئاگربەستە و کە پاش و پێشمان کرد ئەوسا شەڕە.



## چاپتەر -٢-
## یۆنانی بە ئاریا رادەگەنەوە.

فالینۆس و ئەوان رۆیشتن. ئینجا ئەو شاندەە کە بۆ لای ئاریا چوبوون، لەوانە هەرنەبێ پرۆکسینۆس و خیریسیفۆس هاتنەوە دەلا مینۆن لەگەڵ ئاریا مایەوە. ئاریا وەڵامی دابۆوە کە لەنێو فارساندا پیاوی لە خۆی پایەدارتر هەن بۆیە ئەو بۆی نیە رۆژێك ببێتە شا. بەڵام ئەگەر دەیانەوێ بگەرێنەوە بۆ ئایۆنیا با خێرا بەرێ بکەون چونکە ئەو بەیانی زوو دەڕوات. کلێرخۆس گوتی: کەواتە ئەگەر بمانەوێ بێین دەبێ بەقسەی ئێوە بکەین، ئەگەرنا دەتوانین هەر رێگایەك بگرین. ئەمەیە وەڵامەکەتان؟ کلێرخۆس تەنانەت بۆ ئەوانیش دیاری نەدەخست کە چ نیازێکی هەیە.

تازە خۆر ئاوا دەبوو، کلێرخۆس هەستا کاپتن و جەونەراڵەکانی بانگ کرد و ئەم گوتارەی دا: برادەران، کە قوربانیم دەکرد بەنیازی ئەوەی بزانم ئایا بەگژداچونەوەی شا چۆن دەبێت، فاڵەکە باش دەرنەچوو. وەك تێی بگەم ئێستا ئێمە لەنێوان سوپای شا و رووبارێکی بەرین داین. بەبێ بەلەم ئێوە ناتوانن لە رووباری دیجلە([1]) بپەڕنەوە، هەروەها بەلەمیشمان نیە، ناشتوانین لێرە بمێنین چونکە لێرە خۆراکمان دەست ناکەوێت. بەڵام ئەگەر مەسەلەکە بریتی بێت لەوەی کە بتوانین خۆمان بە هاورێکانی کۆرووش بگەیێنینەوە، فاڵەکان بۆ ئەم لایە زۆر باش بوون. کەواتە دەبێ ئێستا ئەوها بکەین، پاش ئەم کۆڕە دەبێ هەموو خۆراکێك کۆبکەینەوە و کە شەیپوور ژەنرا هەموو بارگەتان تێك بنێن، لە شەیپووری دوەمدا بارتان بارکەن، لە شەیپووری سێیەمدا بەدوا فارماندەکانتان بکەون. بارگینەکان با بەرۆخی رووبارەکەدا برۆن، هۆپلیتییش بەلای دەشتەکەدا.

---

[1] رەنگە لێرەدا نووسەر یان وەرگێڕ یان خودی کلێرخۆس لە کاتی خۆیدا هەڵەیەکی کردبێت چونکە تا ئێستا باسی (فورات) دەکرا، ئیتر بۆچی لێیان بۆتە (دیجلە)، نازانم؟!

کە ڕێنماییەکەیان پێ درا جەنەراڵەکان دەستیان پێکرد جێبەجێی بکەن. لەمەوە کلێرخۆس بوو بە سەرلەشکر و ئەوانی دیکە بوونە دەستەی وی. ئەمە بەهۆی هەڵبژاردن ڕووی نەدا بەڵکو چونکە دەیانزانی کلێرخۆس تاکە کەسێکە عەقڵی ڕابەرایەتی هەبێت، ئەوانی دیکە هەندە شارەزا نەبوون[1].

کە تاریك داهات، میلتۆکوتیسی تراکی لە شا هەڵگەڕایەوە و ٣٠٠ پیادە تراکیەکانی لەگەڵ خۆی هێنا. سەبارەت بە تێکڕای لەشکرەکە بەگوێرەی ڕێنماییەکانی پێشوو بەدوا کلێرخۆس کەوتن. نیوەشەو گەیشتنە لای ئاریا، جەنەراڵ و کاپتنە یۆنانییەکان بە شێوازی جەنگی دەڕۆیشتن. چوونە دیداری ئاریا، لەلایەکەوە یۆنانیەکان و لەلای دیکەدا ئاریا و ئەفسەرەکانی خۆی، سوێندیان بۆ یەکتر خوارد کە خیانەت لە یەکتر نەکەن و هاوپەیمانی ڕاستەقینەی یەکتر بن. ناوچەییەکان سوێندێکی تریشیان خوارد کەوا بەبێ فێڵ و خیانەت یۆنانییەکان دەبەنەوە بۆ وڵاتی خۆیان. ئەم سوێندانەش بە جۆرێك خوران کە یۆنانییەکان شمشێرێك و ناوچەییەکان ڕمبێکیان لە خوێنی کەلەشی گایەك و یەکانە بەرازێك و بەرانێك وەردا. کە ئەو بەڵێنانە دران، کلێرخۆس گوتی: ئاریا، ئێستا کەوا لەسەر یەك ڕێگا داین، پێمان بڵێ چۆن پێکەوە بگەڕێینەوە، ئایا بەهەمان ڕێگا یان ڕێگایەکی باشتر دەزانیت؟

ئاریا وەڵامی دایەوە: ئەگەر بەهەمان ڕێگادا بگەڕێینەوە، هەموومان لە برسان دەمرین. لەم ١٧ ڕۆژەی دواییدا هیچمان لەوێ دەست نەکەوتووە و ئەوەی هەشبوو هەموو خورا. پێشنیاز دەکەین کە بەڕێگایەکی درێژتردا بچینەوە، هەرنەبێ خۆراکی لێ بێت. لە یەکەم جوڵەشماندا دەبێ هەنگاوێکی زۆر درێژ بهاوێین تا لە شا دوور بکەوینەوە، ئەگەر بتوانین دوو- سێ ڕۆژەرێ پێشی بکەوینەوە ئەوسا شا پێمان ڕاناگاتەوە، و ئەمەش ناکات کەوا بە هێزێکی بچووکەوە ڕاومان بنێت، بەهێزی گەورەش ناتوانێ سووك بڕوات، کەواتە دەرفەتی دەربازبوونمان دەبێت. ئەمەیە بۆچوونی من.

---

[1] ئەم تێبینیەی زینۆفۆن زۆر گرینگە. یۆنانی وەکو کورد و عەرەبی ئەمڕۆ (عەرەبی عیراق نەك هەموو عەرەبێك) هەستیارییەکی زۆر گەورەیان هەبوو لە مەسەلەی ئەوەی کە کێ فەرمان دەدات و (کێ لە کێ پیاوترە).

تاکە پلانێکی کە لەپێشیان بوو ئەمەبوو کە دەبایە بە هەسپایی خۆ بدزنەوە و یان ئەوەتا بەجۆرێك بۆی دەرپەڕن کە فارس پێیان رانەگەنەوە، کەچی وا رێك کەوت کە بەخت باشترین رابەر بێت. بەیانی زوو کە بەڕێ کەوتن، رۆژ لەلای دەستە راست بوو، وایان دانابوو کە تا کاتی خۆرئاوابوون بگەنە گوندێك لە لادێکانی بابل. بۆچوونەکەیان راست بوو بەڵام هەر لە کاتی نیوەڕۆ سەیریان پێهات کەوا هەندێك سوارە لە دوایان دان. یۆنانییەکانی کە لە رێگا لایان دابوو خێرا هاتنەوە، ئاریا بریندار ببوو واش هەر لە عەرەبانەکەی دابەزی و زرێکەی لەبەر کرد. شوێنهەڵگرەکان هاتنەوە و گوتیان ئەوانە سوارە نین بەڵکو بارگینن وا دەلەوەڕێن. یەکسەر تێ گەیشتن کە شا لێرە نزیکە. لەدوورەوە گوندێکیان دیت بەڵام کلێرخۆس پەلاماری گوندەکەی نەدا چونکە پیاوەکانی برسی و ماندو ببوون و درەنگیش داهاتبوو و لەهەمان کاتیشدا حەزی نەکرد دیاری بکات کە ترساوە، ئیتر لەسەر رێپێوانەکەی خۆی بەردەوام بوو. کە رۆژ ئاوابوو لەنزیك گوندێك وەستا، بەڵام دیتیان پیاوانی شا تەنانەت پوشکەیەکیان لەم گوندە نەهێشتووە بەکەڵکیان بێت. ئەو کەسانەی کە بەدرەنگەوە گەیشتن، لەم تاریکاییەدا هەندە بانگ و هاواریان کردە یەکتر تەنانەت دوژمنیش گوێی لێ دەبوو. بەیانی تێگەیشتن کەوا دوژمن ترساوە و یەکسەر ناوەکەی چۆڵ کردووە و یەك باگینیشیان بەجێ نەهێشتوە. شاهیش ترساوە، وای زانیوە بەشەو بەسەری دادەدەن.

خودی یۆنانییەکان تووشی ترسێکی گەورە ببوون و هات و هاواریان بەشەو دەکرد، کلێرخۆس بە تۆلدیسی ئەلەیی گوت بچێت خەڵکەکە بێدەنگ بکات. جەنەراڵەکان قسەیەکیان بڵاو کردەوە گوایە ئەو کەسەی ناوی ئەم کەسانە دەدات ئەوانەی دەنگە دەنگیان کردووە، پاداشت دەکرێت، بەمەش پیاوەکان بێدەنگ بوون. بەیانی کلێرخۆس فەرمانی دا کە بەهەمان شێوازی دوێنێ ریز ببەستن تا هەمیشە ئامادە بن بۆ بەرەنگاری.

## چاپتەر -٣-
# یۆنانی ڕێککەوتننامە لەگەڵ تیزافەرنە مۆر دەکەن

ئەوەی کە پێشتر نوسیم دەربارەی شا، کە ترساوە، بەیانی قسەکە ڕاست دەرچوو چونکە پێشتر نامەبەری نارد بۆ ئەوەی چەك دا بنێن کەچی ئەم بەیانییە شاندێکی نارد بۆ گفتوگۆ کردن.
نامەبەرەکان تووشی پاترۆلێك[1] ببوون، داوایان کرد جەنەراڵەکان ببینن. کلیرخۆس تاقمە چەکدارەکانی بەسەر دەکردەوە، گوتی با ڕاوەستن تا کاتی ئەوەی دەبێ شاندەکە ببینێت. ئینجا چوو هێزەکانی بەجۆرێك ریز کرد کەس نەزانێت کە کێ چەکدارە و کێ بێ چەکە. هێڵەکانی تەسك و قەرەباڵغ کرد وەك بلێی بۆ شەڕ ساز کراون، ئینجا هەندێك جەنراڵ و چەکداری پۆشتەی هەڵبژارد و خۆی لە دورر وەستا و گوتی: پێیان بلێن چییان دەوێت؟
گوتیان: دەمانەوێ کفتوگۆ بکەین، دەسەلاتێکی تەواومان وەرگرتووە کە گفتوگۆ لەنێوان ئێوە و شادا بکەین.
کلیرخۆس گوتی: کەواتە دەتوانن پێ بلێن کەوا پێشەکی دەبێ شەڕێك بکەین! ئێمە نانمان نەخواردووە و کەس ناوێرێ بە سەربازەکانمان بلێت با گفتوگۆ بکەین بەبێ ئەوەی کە نانێکی پێشکەش بکات.
شاندەکە ڕۆیشتن و زوو هاتنەوە، وا دیاربوو کە یان شا یان نوێنەرێکی بەرزی شا لەوێ وەستابوو. وەڵامیان دایەوە کە ئەگەر لەگەڵتان ڕێك بکەوین ئەوسا ڕێناسێك دادەنێین کە ئێوە بەرێتە جێگایەکی ئەوها خۆراکی لێ بێت. کلیرخۆس داوای کرد کە نامەبەرەکان بکشێنەوە دوا تا وەڵامیان دەداتەوە. کلیرخۆس پرسێکی بە جەنەراڵەکان کرد، ئەوان پێیان باش بوو کە بەزووترین کات خۆراکیان دەستکەوێت، بەلام کلیرخۆس گوتی: ڕاوەستن، با یەکسەر وەڵامیان

[1] پاترۆڵ = (مەفرەزە). چەند چەکدارێکی کەم کە بۆ کارێکی تایبەتی دەنێردرێن.

لەدەینەوە، یا هەندێك بترسن، وابزانن کە ئێمە شەڕ دەکەین. کەچی پیاوەکانی ئێمەش وا دەترسن.

دەمێك راوەستا ئینجا وەڵامی دانەوە کە باشە ئاگربەست دەکات بەڵام هەر ئێستا رێگایان پیشان بدەن. چەکدارەکانی بە ئامادەباشیی هێشتەوە و خۆی سەرپەرشتیی هێزەکانی پاشەری[1] کرد. لە رێگادا تووشی کەند و جۆبار بوون. بەڵام دارخورمایەکی زۆر براببوونەوە، کردیانن بە پرد و بەردەباز.

لێرە دەرفەتێکی باش رەخسا کە بزانین کلێرخۆس چۆن سەرپەرشتی پیاوەکانی دەکرد. بە دەستی چەپ رمبێکی گرتبوو و لە دەستی راستدا دارێکی گرتبوو وەکو دەسکێك بوو، لەگەر کەسێك لە کارەکەیدا سڵی کردبایەوە بەو دەسکە تێی رادەخوڕی بەڵام لە هەمان کاتدا ئامادەبوو کە بۆ یارمەتیی هەندێك کەس خۆی هەڵداتە نێو قوڕەکە. بەمەش هەموو شەرمیان بەخۆدا دەهات ئەگەر وەکو کلێرخۆس گورج نەبن. پەلەکردنی کلێرخۆس لەبەر ئەوەبوو گومانی دەکرد کەوا ئەگەرچی وەرزەکە وەرزی ئاودێری نەبوو کەچی ئەوان جۆگەکانیان بەردابۆوە. کلێرخۆس گومانی هەبوو کە شا بەمەبەستی ترساند ئەم دەشتەی پڕ کردووە لە ئاو.

گەیشتنە گوندێك، رێناسەکان گوتیان دەتوانن لێرە خۆراك بکرن. دەرە و شەرابی خورما زۆر بوو، خورمایەکە لەو جۆرە بوو کە لە یۆنان دەدرانە نۆکەرەکان دەنا خورمایە باشەکان گەورە و گەش و ئاودارن. رەنگی خورماکە سوور و زەرد بوو، وشك دەکرانەوە تا شیرناتییەکەیان بمێنێت[2]. هەروەها خۆشاوێك هەبوو بەڵام پیاوی گێژ دەکرد، ئینجا یەکەم جار بوو جومماڕ بخۆن، زۆربەیان سەیریان بە چێژی جومماڕ هات کە زۆر شیرن بوو، بەڵام ئەمەش پیاوی هەندێك گێژ دەکرد. ئەو دارەی جومماڕی لێ دەردەهێنرا هەموو دارەکە فڕێ دەدرا[3].

---

[1] (پێشەر و پاشەری لەشکر) واتە (مقدمە الجیش و مؤخرە الجیش) ئەمانە زاراوەی سەربازین.

[2] وابزانم هەمان (قسپ) ی ئەمڕۆیە کە لە باشوورە بۆمان دێت. لە سەرەتادا زەرد و رەقن بەڵام پاش ماوەیەك مەیلەو سوور هەڵدەگەڕێن و رۆژ بەرۆژ دەتوێنەوە و نەرم شیرن دەبن. هەروەها، بەبۆنەی ئەوەی کە خورماکان زەرد و سوور بوونە، دیارە ئەو شەڕەی کوناکسا لەنێوان مانگی ئاب یان ئەیلوول روویداوە.

[3] وەرگێڕ ئەمەی نوسیوە.
The "cabbage" of the top of the palm tree.

سێ رۆژ لەوێ مانەوە ئینجا شاندەکەی شا هاتنەوە، بریتی بوون لە تیزافەرنە و زاوایەکی شا و سێ فارسی تر و هەندێك نۆکەر و پاسەوان. جەنەراڵەکان بۆیان چوون، تیزافەرنە تەرجومانێکی هەبوو ئەم قسانەی کرد: برادەرە یۆنانییەکانم، من لە سنوری یۆنان دەژیم و کە ئێوەم ئەوها دیت حەزم کرد شا بهێڵێت بتانبەمەوە بۆ وڵاتی خۆتان و خۆشبەختانە داواکارییەکەم پەسند کرا. ئەمە کارێکە دەبێ ئێوە و هەموو یۆنان بە چاکەی منی بزانن. من داوام لە شا کرد رەزامەندی بفەرمێت ئەم کارە ئەنجام بدەم چونکە من یەکەم کەس بووم پێی رابگەیێنم کەوا کۆرووش هەڵمەتی بۆ ساز دەکات. کاتێك خەبەرەکەم پێی راگەیاند، بەخۆ و بە هێزەوە چووم بۆ خزمەتی، تاکە کەسیش بووم کە بەرەنگاری یۆنانیەکان بوومەوە و هەڵنەهاتم، بەڵکو بەنێو ریزەکانتاندا رێگام بڕی و خۆم گەیاندەوە لای شا پاش ئەوەی کە ئەو کۆرووشی کوشتبوو و گەیشتبوە ئۆردوگاکەتان. ئینجا لەگەڵ ئەم پیاوانە، کە ئەمەکدارترین پیاوی شان، هێزە ناوچەییەکانم راو نا. شا بەڵێنی دا کە داواکارییەکانم پەسند بکات، داواشی لە من کرد لە ئێوە بپرسم مەبەستان چ بوو لەم هێرشتان؟ ئامۆژگاریم ئەوەیە کە وەڵامێکی باش بدەنەوە بۆ ئەوەی بتوانم سوودێك بە ئێوە بگەیێنم.

یۆنانیەکان لە قسەکەیان کۆڵیەوە. وەڵامەکەش کلێرخۆس دایەوە بەم جۆرە: ئێمە نە لەسەرەتادا، نە ئێستاش نیازی جەنگمان هەبووە دژی شا. مەسەلەکە، وەکو کە باش دەیزانن، ئەوەبوو کە کۆرووش جۆرەها بەڵێنی دەدا و وای دیار دەخست گوایە مەبەستی هەڵمەتەکە بۆ شتێکی دیکەیە، واش کە گەیشتینە قۆناغێکی ترسناك ئێمە بە شەرمدا چووین کە پشتی کۆرووش بەردەین. جا ئێستا کە کۆرووش مردووە، ئێمە چاومان لە ملکی شا نیە و هیچ هۆکارێك نیە وا بکات زیان بە وڵاتەکەی بگەیێنین یان خۆمان بۆ شتێك بەکوشت بدەین. ئێمە

---

کاباج - Cabbage واتە قەرنابیت. بەڵام ئایا چۆن قەرنابیت لەنێو دارخورمان پەیدا دەبێت؟ بۆیە من باوەڕ دەکەم مەبەستی جومماڕ بێت. جومماڕ وشەیەکی عەرەبیە واتە کاکڵی قەدی دارخورما. کە دارخورمایەك دەبڕنەوە ئەم کاکڵە شیرینە دەردێنن و بە چەقۆ پارچەی لێ دەبڕن و دەیخۆن. شێوەی وەکو پارچە پەنیرێکی گەورەیە، رەنگیشی شەکەرییەکی مەیلەو زەردە. شایانی گوتنە کە خۆراکێکی گرانە، برا عەرەبەکان لە جەژنەکاندا بە نرخێکی گران دەیفرۆشن، هەروەها مەعیدەت قورس دەکات.

دەگەڕێینەوە بۆ ولاتی خۆمان، تۆش وا بکە کەس هەڕەشە نەکات دەنا، پشت بە خواوەندەکان لەستوور، تەنگی پێ هەڵدەچنین. بەپێچەوانەشەوە، ئەوەی یارمەتیمان دەدات لەبەرانبەردا ئێمەش یارمەتیی دەدەین.

تیزافەڕنە قسەکەی پەسند کرد و گوتی: نامەکەتان بە شا دەگەیێنم و دەگەڕێمەوە، تا ئەو کاتەش ئێمە وای دادەنێین کە ئاگربەست لەئارا دایە، ڕێگاشتان دەدەین خۆراك بکڕن.

لە ڕۆژی دوەمدا تیزافەڕنە سۆراغی نەبوو، یۆنانی سەغلەت بوون، بەلام لە ڕۆژی سێیەمدا هاتەوە و گوتی: ئەوجار توانیومە ئیشەکە پێك بێنم. خەڵکێکی زۆر هەیە کە بەرهەڵستیی ئاشتی دەکەن چونکە شا لەکەسانێك نابوورێت ئەگەر بەگژی داهاتبنەوە، بەلام لە کۆتاییدا ڕازی بوو ڕێگا گەڕانەوتان بدات. بۆتان هەیە خۆراك بکڕن، بەلام دەبێ سوێند بخۆن کە بە ئاشتییانە بڕۆن و تالانکاری نەکەن و پارەی ئەو شتانە بدەن کە دەیانکڕن.

لەسەر ئەم خالانە ڕێك کەوتن و سوێند خورا. ئینجا تیزافەڕنە و زاواکەی شا دەستی ڕاستەیان بۆ جەنەراڵەکان هێنا پێش، ئەوانیش هەمان شتیان کرد. ئینجا گوتی: ئێستا دەچمەوە بۆ لای شا، کە ئیشەکە دامەزرا دەگەڕێمەوە و بە پێشتان دەکەوم بەرەو ناوچەکانی خۆتان لە یۆنان.

## چاپتەر -٤-
# ڕێپێوانێکی گوماناوی

ئاریا و پاشماوەی لەشکرەکەی کۆرووش ئۆردوگایان لە تەنیشت ئۆردوگای یۆنانیەکان داکوتابوو. هەردووك لا بۆ ٢٠ ڕۆژ چاوەڕێی تیزافەڕنەیان کرد، و لەم ٢٠ ڕۆژەدا خزم و براکانی ئاریا سەردانیان کرد، فارسی دیکەش دەهاتن و سەردانی خزمەکانیان دەکردن، قسە و بەڵێنیان بۆ دەهێنان کە شا لێیان خۆش دەبێت.

ڕۆن و ئاشکرا بوو کە پیاوەکانی ئاریا هەندە باکیان بە یۆنانییەکان نەماوە، ئەمەش بوو بە هۆیەکی تر کە وەك جاران باوەڕیان بە یەکتر نەمێنێت. سەربازەکان یەقەی کلێرخۆس و جەنەراڵەکانیان دەگرت کە تاکەی چاوەڕێ بن؟ کێ دەڵێ شا خەریك نیە کە قەلاچۆمان بکات؟ دەیەوێ پەندێك بنێنەوە بۆ ئەوەی خەڵکی یۆنان چاوترس بن کە هیچی تر بەگژ شادا نەچنەوە. ئێستا هێزەکانی فارس بڵاون، بەڵام کە کۆبوونەوە ئەوسا یەکسەر پەلامارمان دەدەن، ڕەنگە ئێستا دیوار و خەندەك ساز بکەن دژی مە، شا چۆن دەهێڵێ بچینەوە بۆ یۆنان و بڵێین کە ئێمە لە نزیك تەلاری شادا شەڕمان کردووە و هیشتوشیەتی بە ساغی بگەڕێینەوە؟ چۆن ڕێگا بە شتی ئەوها دەدات؟

کلێرخۆس وەڵامی دایەوە: منیش هەمان هەستی ئێوەم هەیە بەڵام ئەگەر ئێستا بزووین ئەمە پێشێل کردنی ئاگربەستەکەیە و دەشزانێت کە ئەوسا کەس خۆراکمان پێ نافرۆشێت و کەسیش ڕێگامان پێشان نادات. هەروەها ئەگەر بزووین ئاریا لە ئێمە جودا دەبێتەوە و یەك برادەرمان لەم وڵاتە نامێنێت. ئایا چەند ڕووبارمان لەپێشە؟ نازانم، بەڵام مسۆگەرە ئەگەر دوژمن لەدوامان بێت، ئێمە ناتوانین لە فورات بپەڕینەوە، ئێمە سوارەمان کەمن، ئەوانەش زۆربەی هێزەکانیان لە سوارە پێك هاتووە. واتە ئەگەر ببەزن، پێراناگەین زۆریان لێ بگوژین و ئەگەر سەرکەون، ئەوسا کەسمان ناهێڵن. هەروەها، شا ناچار نیە سوێند و بەڵێنی خۆی بۆ لەو هەموو فارس و یۆنانییانە سووك بکات. ئەمە بوون بیانگەکانی کلێرخۆس.

لەم کاتانەدا تیزافەرنە و لەشکرەکەی هاتنەوە، دیار بوو نیازی گەڕانەوەی هەیە. ئۆرۆنتا[١] هات و کچەکەی شای لەگەڵدا بوو ئەوەی کە لێی خواستبوو. تیزافەرنە و هێزەکەی پێش یۆنانیەکان کەوتن، دەرۆیشت ڕێگاشی دەدا خۆراك بکرن. بەڵام ئاریا لەگەڵ تیزافەرنە و ئۆرۆنتا دەرۆیشت و ئۆردوگای لەگەڵ ئەوان دادەکوتا و ئەمە گومانی خستە نێو دڵی یۆنانییەکان. چاودێر و ڕێناسەکان خۆیان بڵاو دەکردەوە و ئۆردوگاکەیان هەمیشە لە دووری سێ فەرسەخ دادەکوتا. هەردووك لا بە چاوی گومان و دوژمنایەتیەوە لە یەکتریان دەڕوانی، هەندێك جاریش کە خەریکی دارکردن و ئالیك و سوتەمەنی دەبوون پیاوەکان بەشەڕ دەهاتن، ئەمەش ڕاددەی سەغڵەتییەکەی تیژتر دەکرد.

پاش سێ ڕۆژ گەیشتنە لەو شتەی کە پێی دەگوترا دیواری میدیا و لێی پەڕینەوە بۆ دیوەکەی دیکە (بۆ باکوور). دیوارەکە لە کەرپوچ دروست کرابوو، ٢٠ پێ بەرین و ١٠٠ پێ بەرز بوو و دەڵێن ٦٠ فەرسەخ درێژە.

ئینجا بە دوو ڕۆژ ٢٤ فەرسەخیان بڕی و لەڕێگادا لە دوو جۆبار پەڕینەوە، یەکیان پردێکی کاتیی لەسەر بوو، ئەوەی دیکە پردێکی بە بەلەمی هەبوو. ئاوی جۆبارەکان لە دیجلەوە دەهاتن و دابەش دەبوون بۆ جۆبار و جۆگەی بچووکتر، وەکو ئەوانەی کە لە یۆنان ئاودێری پێ دەکەن.

ئینجا کە گەیشتنە سەر دیجلە شارێکی گەورە و گەشی لێ بوو بەناوی سیتاس Sittace فەرسەخ و نیوێك لە ڕووبارەکە دوور بوو. یۆنانی لە قەراغ شاردا لەنێو دارستانێك ئۆردوگایان داکوتا، دارستانەکە پڕ بوو لە جۆرەها دار و درەخت. ناوچەییەکان لەوبەری دیجلە دابەزین بەڵام لێك دیار بوون[٢].

---

[1] بەگوێرەی قسەکانی پێشو دەبایە کۆڕووش ئۆرۆنتەی کوشتبێت، کەچی وا ئۆرۆنتە پەیدا بۆتەوە و زینۆفۆنیش هیچ ئاماژەیەك ناکات ئایا هەمان کەسە یان پیاوێکی دیکەیە؟

[2] ڕەنگە ناوچەی مەداین (سەلمانپاك)ی ئێستا بێت کە ڕووباری دیالا (سیروان) دەگاتە دیجلە و ناوچەکەش بەگشتی پڕە لە باغ و بێستان.

پاش نانی ئێوارە، پرۆکسینۆس و زینۆفۆن لەلای جبەخانەکە پیاسەیان دەکرد، پیاوێك هات لە پرۆکسینۆس و کلێرخۆس دەگەڕا بەلاّم لە مینۆنی نەدەپرسی چونکە خۆی لەلایەن برادەرەکەی مینۆوەوە، لەلایەن ئاریا، هاتبوو. پرۆکسینۆس گوتی: ئێمەین کە دەتەوێ. کابرا قسەی کرد، گوتی: ئاریا و ئەرتائۆزۆ کە دلسۆزی کۆرش و دلسۆزی ئێوەشن، منیان ناردوە کە وریاتان بکەمەوە ئەمشەو لەشکری ناوچەییەکان پەلامارتان دەدەن. هێزێکی گەورە لە دارستانەکە یە نزیك ئێرە، دەشلێن دەبێ پاسەوانی لە پردەکەی دیجلە بکەن کەوا تیزافەرنە نیازی هەیە تێکی بدات بۆ ئەوەی لەنێوان دیجلە و جۆبارەکەدا گیربن.

کە پرۆکسینۆس و زینۆفۆن ئەمەیان بیست کابرایان بردە لای کلێرخۆس. کلێرخۆس زۆر سەغلەت بوو بەلاّم گەنجێك لەوێ بوو، پاش هەندێك بیرکردنەوە گوتی: لەلایەکەوە پەلامارمان بدەن و لەلایەکی دیکەوە پردەکە تێك بدەن! ئەم دوو پلانە تێك ناکەنەوە، بۆچی پردەکە تێك بدەن؟ ئەگەر تێکی بدەن ئەوسا هێزەکانی ئەوبەری رووبارەکە ناگەنە ئێرە، بەبێ پردیش ئێمە رێگای هەلاّتنمان نیە. کەواتە ئەم قسە چی؟!

کلێرخۆس پرسی: ئایا مەودای نێوان دیجلە و جۆبارەکە چەندە.

گوتی: گەورەیە و کۆمەلێك گوند و شاری گەورەی لێیە.

گەیشتنە باوەڕێك کە ناوچەییەکان بەمەبەست ئەم پیاوەیان ناردوە. ئەوان لەوە ترساون یۆنانییەکان پردەکە تێك بدەن و خۆیان لەم ناوە قایم بکەن کەوا بە دیجلە و جۆبارەکە پارێزراوە و پڕە لە گوند و شار. ئەوسا دەبێتە بنکەیەك بۆ نایارانی شا.

پاسەوانیان بلاّو کردەوە و کردیانە شەو، بەلاّم هیچ جوجولێك رووی نەدا، بەیانیش لە پردەکە پەڕینەوە، پردەکە لە ۳۷ بەلەم دروست. زۆر بە وریایی جوولاّنەوە چونکە بیستبویان رەنگە لەکاتی پەڕینەوەدا پەلامار بدرێن، بەلاّم لەوێش هیچ رووی نەدا، تەنیا ئەوەبوو کە گلاوس هات و تەماشایەکی کردن بزانێ ئایا دەپەڕنەوە یان نا. کە دیتی، یەکسەر گەڕایەوە.

بە چوار رۆژ ٦٠ فەرسەخیان بڕی و گەیشتنە رووباری فیکۆس Phycus کە ١٠٠ پێ بەرین بوو و پردێکیشی لەسەر بوو. شارێکی گەورەی هەبوو بەناوی ئۆپیس، لە نزیك وێ زۆڵە

برایەکی[1] کۆرووش و ئەرتەکسەرکیس گەیشتە لای یۆنانییەکان. لەشکرێکی گەورەی لە سوسا Susa و ئەکبەتانا Akbatana[2] هێنابوو بۆ یارمەتیی شا، و بە خۆ و بە لەشکرەوە لەسەر لارێ وەستابوو تەماشای یۆنانییەکانی دەکرد. کلێرخۆس سەرلەشکر بوو، پیاوەکانی دوو بەدوو ریز کرد، دەیجولاندن و دەیوەستاندن و مەودای دەدایە نێوان تیپەکان. لە کاتێکدا هەستا تیپەکانی وەستاند و ریزەکانی دیکەی لە پاشیان راگرت، دیمەنەکەیان وابوو کە خودی یۆنانییەکان سەیریان بەخۆ هات چۆن ژمارەیان هەندە زۆرە! فارسەکانیش سەریان سورما.

لێرەوە بە ڕێپێوانێکی چوار رۆژی ٦٠ فەرسەخی بیابانیان بڕی و گەیشتنە گوندێك، گوندەکە هی پەریزاد بوو دایکی کۆرووش و ئەتەکسەرکیس. تیزافەرنە بەمەبەستی سووکایەتی کردن بەرانبەر کۆرووش و دایکی، گوندەکەی دایە دەست یۆنانییەکان کە بەهەوەسی خۆیان تالانی بکەن، بەلام نەیهێشت خەلکی گوندەکە یەخسیر بکەن. دەرە و بەرخ و شتی بە نرخ زۆر بوو لەو گوندە.

ئینجا بە ڕێپێوانێکی چوار رۆژی ٦٠ فەرسەخیان بڕی بەدرێژایی دیجلە کە لەلای چەپیان بوو. لە رۆژی یەکەم بە نزیك شارێکدا تێپەڕین بەناوی کێنیا Ceanea. خەلکە ناوچەییەکان لەوبەری رووبارەکە بۆیان دەپەڕینەوە، نان و شەراب و پەنیریان بە قەیاغ دەهێنا.

---

[1] illegitimate brother (اخ غیر شرعی) ئەو کەسانەی کە لە کەنیزەکانی پاشاکان دەبوون، ئەوانە بە کوڕی پاشاکان دەزانران بەلام بەجەشنی شازادە شەرعییەکان ئەو پایە بەرزەیان نەدەبوو.

[2] ئەکبەتانا واتە هەمەدان، کۆنە پایتەختی میدیا.

## چاپتەر - ١ -

# خیانەتی تیزافەرنە

پاش ئەمە گەیشتنە رووباری زاپاتاس Zapatas کە ٤٠٠ پێ بەرین بوو[1]، سێ رۆژ لەوێ مانەوە. ئەگەرچی هیچ شتێك رووی نەدابوو بەلام لەو ماوەدا گومانەکان زیادتر دەبوون، کلێرخۆس داوای دیدارێکی تیزافەرنەی کرد بۆ ئەوەی سنورێك بۆ ئەم گرژیە دابنێت نەبادا ببێتە دوژمنایەتییەکی ئاشکرا. لە دیدارەکەدا کلێرخۆس ئەم قسانەی کرد: تیزافەرنە، ئێمە سوێند و بەڵێنمان داواتە یەکتر بەلام بەو شێوازەی کە ئێوە چاودێرمان دەکەن، وەك بڵێی چاودێری دوژمنێك دەکەن. تا ئێستا شتێکم لە ئێوە نەدیتوە بیسەلمێنێت کە خراپەمان دەکەن. سەبارەت بە ئێمەش، یەك لەبارە خۆمەوە، بەهیچ شێوە خەیاڵمان بۆ ئەوە ناچێت کە خراپەتان بکەین، بۆیە بڕیارم دا مەسەلەکە باس بکەم تا سنورێك بۆ ئەم گومانانە دابنرێت.

من ئاگادارم کە پێشتر بەهۆی هەندێك هەواڵی درۆوە وردە روداو هەبوون، هەندێك جاریش بەهۆی گومانی نابەجێ خەڵك لێك ترساون و دەستیان وەشاندووە، بەلام شتێکی ئەوتۆ نەبووە زیانێکی وا بگەیێنێت کە چارە نەکرێت. بۆیە هاتم چونکە پێوەندیی راستەوخۆ کۆتایی بەم شتانە دێنێت. من دەڵێم ئێوە هیچ هۆیەکتان نیە کە باوەڕ بە ئێمە نەکەن، و پێش هەموو شتێك و لە هەمووی گرینگتر ئەوەیە کە ئەو سوێندانەی بەرابەر خواوەندەکان، رێگامان نادەن کە ببینە دوژمن. ئەو کەسەی باکی بە سوێندی ئەوها نەبێت من هەرگیز بە پیاو موبارەکی ناکەم. ئەوەی دوژمنی خواوەندەکان بێت، ئایا دەبێ خۆ لە کوێ بشارێتەوە و بۆکوێ هەڵێت و پەنا بۆ چی بەرێت؟ هەموو شتێك لەدەست خواوەندەکان دایە و دەسەلاتیان بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت. ئەوەیە هەستی من بەرانبەر بە خواوەند و بەرانبەر بە سوێندەکانی کە لەپێناو خۆپاراستندا خستومانە دەست خواوەندەکان، جا کە دەگاتە مەسەلەی پێوەندیی نێوانمان، باوەڕم وایە ئێستا ئێوە باشترین مایەی سوودن بۆ ئێمە و بە یارمەتیی ئێوە هەموو رێگاکان بۆ ئێمە ئاسان کراون، لە رووبارەکان بە ئاسانی دەپەڕینەوە و تووشی برسیاتیش نابین. کەچی ئەگەر ئێوە نەبان

[1] رەنگە ئەمە زابی بچووك بێت کە ١٠٠ کیلۆمەترێك لە خۆرئاوای کەرکووك دەگاتە دیجلە.

ئەوسا ڕێگامان نادیار دەبوو چونکە شارەزا نین و هەموو ڕووبارێك دەبوو بە ڕێبەستێك و هەر تاقمە خەڵکێك دەبوونە مایەی ترساندن، لە هەمووشی ترسناکترئەو چۆڵەوانیە یە، ئێمە تێدا بزر دەبوین. ئەگەر ئێمە هەندە شێت بین کە پەلامارتان بدەین کەواتە چۆن دەبێ سوودبەخشی خۆمان بکوژین و چۆن بیر لە تۆڵەیە ناکەینەوە کە شا لە ئێمەی دەکاتەوە؟ یەك لەبارە خۆمەوە ئەگەر زەبرێکم لە ئێوە دا، دەبا زیانێکی بێئەندازە بکەم و بە بەدترین شێوە بەسەرمدا بشکێتەوە. من بۆیە بووم بە برادەری کۆرووش چونکە لەهەمووکەسێك پتر بەهانای خەڵکەوە دەچوو، ئێستاش تۆ دەسەڵات و ناوچەکانی کۆرووشت گرتۆتەوە و، دەسەڵاتی شاهیش هەر لەگەڵ ئێوە دایە، ئەوانە هەموو لە قازانجی تۆدان، جا کێ هەندە شێتە برادەرایەتیت نەکات؟

هەروەها با پێت بڵێم بۆچی من ئومێدم هەیە کە ئێوە هاوپەیمانەتی لەگەڵ ئێمە بکەن. یەکەم، بەهۆی خەڵکی میسیا کە وابزانم ئالۆزن و لەخۆم و لەم هێزەم رادەبینم کە سەرکوتیان بکەم. هەروەها خەڵکی پیسیدیا، بیستومە خەڵکێکی شەڕانگێزیان هەیە دەتوانن تووشی سەرئێشەت بکەن، ئاگاداریشم کەوا رقێکی تایبەتیان هەیە بەرانبەر میسرییەکان[1] و باوەڕ ناکەم بۆ سزادانی ئەوانە لە هێزەکەی من باشترتان دەستکەوێت. بەڵێ، بەیارمەتیی ئێمەوە دەتوانن بەرانبەر دەوڵەتەکانی هاوسێتان وەکو دیکتاتۆر رەفتار بکەن. ئێمە لەبەر پارەمان نیە بەڵکو لەبەرانبەر ئەم چاکە دایە کە لەگەڵمان دەیکەن کەوا ژیانمان دەپارێزن. سەیرم پێ دێت کە هێشتا باوەڕ بە ئێمە نەکەن!

ئەمەبوو قسەی کلێرخۆس، تیزافەرنە وەڵامی دایەوە: کلێرخۆس، بەراستی پێم خۆش بوو ئەم قسە رێك و پێکانەت کرد. تۆ ئەم هەست و باوەڕەت هەیە وا رادەگەیێنی کە دژایەتیی کردنی ئێمە زیان بە بەرژەوەندیی ئێوەش دەگەیێنێت. بەڵام ئێستا نۆرەی تۆیە گوێ بگری تا بزانی کە نە شا و نە من بەرانبەر بە ئێوە گوماناوی نین. ئەگەر نیازمان هەبایە وێرانتان بکەین ئێمە لە سوارە و پیادە و چەکمان کەم نیە. بیر لەو هەموو چیایانە بکەنەوە کە دەتوانین لوێدا پێشتان لێ بگرین، بیر لەو هەموو رووبارە بکەنەوە کە بەوان دەتوانین پێش بە هەموو کەسێك بگرین چونکە

[1] فارس میسریان داگیرکردبوو بەڵام بە ئاسانی کۆنترۆڵ نەدەکرا بەتایبەتی باشووری میسر.

هەندێکیان هەندە پانن کە بە ئێوە نابڕێن. بێجگە لەمانە، ئاگر لە گیا بەهێزترە، دەتوانین ئاگر لە هەموو بەر و بوومەکانی پێشتان بەردەین، ئەوسا برسیاتی دژبە ئێوە بەگەڕ دەخەین ئیتر هەموو ئازایەتیی جیهان بەهاناتان نایەت. بەو هەموو توانایەی کە لەبەر دەستی ئێمە دایە، کە هیچیش بارگرانی لەسەر ئێمە ناکەن و لەنێو ئەو هەموو ئەگەرانەدا کە لەبەر دەستمان دان، تۆ بۆچی وا دەزانی ئاکە ڕێگایەك دەگرین کە ڕەنگە لەبەرچاوی خەڵك و خواوەندان لاوازی و سووکایەتیی تێدا بێت بۆ ئێمە؟ شتی ئەوها تەنیا لەنێو خەڵکی بێهۆش و بێئومێد روو دەدات کەوا هیچ ڕێگایەکی دیکەیان نەمابێت (کە ئەگەر ئەوهاش بن، هەر بە تاوانبار دەردەچن). پیاو هەن کە لەپێناو خۆئاسوودەکردندا ئامادەن سوێند شکێنی لەگەڵ خواوەندەکان بکەن و بەرانبەر بە پیاواندا بێئەمەك بن. کلێرخۆس، ئێمە هەندە پووچ و بێمێشك نین. ئێمە دەتوانین وێرانتان بکەین، ڕەنگە بپرسی کەواتە بۆچی نایکەین؟ با پێت بڵێم کە ئەمە لەبەر ئارەزووی خۆمە کە دەمەوێ ببم بە جێ باوەڕی یۆنانییەکان بۆ ئەوەی بە چاکە بتوانم بگەڕێمەوە ناوچەی خۆم بە پشتیوانیی ئەو بەکرێگیراوانەی کە کۆرووش هێنابوونی. خۆت باسی هەندێك بوارت کرد کە دەشێ ئێوە بەهانام بێن، بەڵام هۆیەکی گرینگتر هەیە، شتێکە کە هەر خۆم دەیزانم. ئەمەش ئەو تارایەیە کەوا ئێستا لەسەر سەری شایە بەڵام لەهەمان کاتدا لە نێو دڵی زۆر کەسدایە.

کلێرخۆس باوەڕی وابوو کەوا لەم حاڵەدا قسەی ڕاست دەکات، گوتی: دەباشە، ئەو ساکارانەی کە دەیانەوێ ئێمە بکەنە دوژمنی یەکتر، لەو کاتەدا کە ئێمە ئەو هەموو هۆکارانەمان هەن بۆ ئەوەی ببینە برادەر، ئایا ئەوانە شایستەی خراپترین چارەنووس نین؟

تیزافەڕنە گوتی: با، ئیتر ئەگەر خۆت و جەنەراڵ و کاپتنەکانت بێنە لای من ئەوسا یەك بەیەك ئەو کەسانە دەستنیشان دەکەم کە بەمنیان گوتووە گوایە ئێوە خەریکی پلانگێڕان دژی من.

کلێرخۆس گوتی: هەموویان دێنم و یەك لەبارە خۆمەوە ئاشکرای دەکەم کێیە ئەو کەسەی کە ئەم هەواڵانەی بۆ من دەهێنا.

پاش ئەمە، تیزافەڕنە زۆر بە جوانی لەگەڵ کلێرخۆس ڕەفتاری کرد و نەیهێشت بڕواتەوە تا نانی ئێوارەیان پێکەوە خوارد.

ڕۆژی دووەم، پاش گەڕانەوە بۆ ئۆردوگا، کلیێرخۆس دیاری خست کەوا لەگەڵ تیزافەرنە گەیشتۆتە تێکگەیشتنێکی زۆر باش و دەیگوت ئەو یۆنانیانەی کە ئەم قسەلۆکەیان بڵاو کردۆتەوە دەبێ بە چەشنی خاین سزا بدرێن. کلیێرخۆس گومانی لە مێنۆن دەکرد چونکە مێنۆن لەگەڵ تیزافەرنە و ئاریا دیترابوو و خەریك ببوو بەدزی بەرەیەك لەنێو یۆنانییەکان ڕێك بخات بۆ ئەوەی تێکڕای لەشکری یۆنانی بکاتە برادەر لەگەڵ تیزافەرنە، بەڵام کلیێرخۆس دەیویست لەشکرەکە پابەندی خۆی بن و ئەو هەموو بۆڵە بۆڵەشی لەکۆڵ بێتەوە. هەندێك سەرباز لەقسەی کلیێرخۆسیان دەدایەوە کە نابێ هەموو جەنەراڵ و کاپتنەکان بەرێت و نابێ باوەڕ بە تیزافەرنە بکات، بەڵام کلیێرخۆس لەسەر قسەکەی خۆی سوور بوو تا لەکۆتاییدا توانی پێنج جەنەراڵ و ٢٠ کاپتن لەگەڵ خۆی بەرێت وێڕای ٢٠٠ سەربازێکیش گوایە خۆراك دەکڕن.

کە گەیشتنە دەرکی ڕەشماڵەکەی تیزافەرنە جەنەراڵەکان بۆ ژووری بانگ کران، ئەوانەش بریتی بوون لە پرۆکسینۆسی بۆیۆتی، مێنۆنی تێسالی، ئاگیاسی ئەرکادی، کلیێرخۆسی سپارتی و سۆکراتی ئاخەیی. کاپتنەکان لەبەر دەرگا مانەوە، بەڵام هەندەی نەبرد بە یەك ئاماژە ئەوانەی ژوورێ دەستبەسەر کران و ئەوانەی دەرێ یەکسەر کوژران. ئینجا هێزێکی سوارەی ناوچەیی بەو دەشتەدا گەڕان، ئەو یۆنانییەی کە تووشیان بوون، یەخسیر و ئازاد وەکو یەك، هەر هەموویان کوشتن. یۆنانی بەسەیری تەماشای ئەو مانۆڕ و جموجۆڵەیان دەکرد و تێنەدەگەیشتن چ رووی داوە تا نیکارخۆسی ئەرکادی بە زامداری هاتەوە، برینێکی گەورە لە زگی کرابوو کەوا هەناوی خۆی بەدەست هەڵگرتبوو. هاتەوە و مەسەلەکەی گێڕایەوە.

یۆنانی تاویان دایە چەك. خەفەتێکی گەورەیان بەسەردا سەپا و دەیانگوت هەر ئێستا دوژمن هێرش دەکەن. بەڵام دوژمن بە هەموو هێزەکەیەوە نەهات بەڵکو تەنیا ئاریا و ئەرتەئۆزۆ و میترادادا، کە ئەوانەش نزکترین پیاوی کۆڕووش بوون. تەرجومانە یۆنانییەکە برای تیزافەرنەی لەوێ دیتبوو وێڕای ٣٠٠ سوارەی زرێپۆشی فارس.

کە لە ئۆردوگا نزیك بوونەوە داوایان کرد تێکڕای کاپتن و جەنەراڵەکانی کە ماون بۆیان بێنە دەرێ تا نامەیەکی شا ڕابگەیێنن. جەنەراڵە یۆنانییەکان بەوپەڕی وریاییەوە چوونە دەرێ، کلینۆری ئۆرخۆمینۆس و سۆفەینەتۆسی ستیمفالی چوون، زینۆفۆنی ئەتینیش چوو تا بزانێ

پرۆکسینۆس چی بەسەر هاتووە؟ خیریسیۆفۆس خۆوبەخت لەگەڵ هەندێك کەس چوبوونە گوندێك بازاڕ بکەن.

لە شوێنێەك راوەستان کە دەنگیان بگاتە یەکتر، ئاریا ئەم قسانەی کرد: یۆنانییەکان، بۆمان دەرکەوت کە کلیێرخۆس سویندشکێنە و ئاگربەستەکەی پێشێل کردووە و ئەوەی پێی گەیشت شایستەی خۆی بوو. وا مرد، بەلاّم پرۆکسینۆس و مینۆن کە دەربارەی پلانەکە گوزارشیان دابوو وا بەرێزەوە گیراون. سەبارەت بە ئێوەش، شا داوا دەکا چەك دابنێن بەبۆنەی ئەوەی کە ئەم لەشکرە پێشتر هی کۆرووش، غولاّمی شا، بووە و ئێستا شا بە هی خۆی دەزانێت.

کلینۆری ئۆرخۆمینۆس وەك گوتەبێژی یۆنانییەکان وەلاّمی دایەوە: ئاریا هەی رووڕەش، ئەدی ئێوە برادەری کۆرووش نەبوون، سویندتان خواردبوو کە هەمان دۆست و دوژمنی ئێمەتان هەبێت کەچی لەگەڵ ئەو تیزافەڕنە بێخودایە پیاوکوژە خیانەت لە ئێمە دەکەن؟ خودی ئەو کەسانەتان کوشت کە سویندتان پێکەوە خواردبوو، ئێستاش کە ئێمەتان بەجێ هێشتووە وا لەگەڵ دوژمنانی مە هاتون؟

ئاریا گوتی: راستی ئەوەیە کە کلیێرخۆس خەریکی فێڵ بوو دژی هەموومان.

زینۆفون وەلاّمی ئەم قسەی دایەوە و گوتی: باشە، ئێستا کلیێرخۆس کە سویند و ئاگربەستەکەی شکاند وا بە سزای خۆی گەیشت. راستە، دەبێ سویندشکێنی بەرپەرچ بدرێتەوە، بەلاّم پرۆکسینۆس و مینۆن کە جەنەراڵی ئێمەن و بۆ ئێوەش سوودیان هەیە، دە ئەوانە بنێرنەوە. گومان نیە کە ئەوانە برادەری هەردووك لان، باشترین ئامۆژگاری دەدەن بۆ ئێمە و بۆ ئێوەش!

ناوچەییەکان دەمێك لەنێو خۆیاندا قسەیان کرد بەلاّم رۆیشتن بەبێ ئەوەی هیچ وەلاّمێك بۆ ئەم پێشنیازە.

## چاپتەر -٦-
# کەسایەتیی پێنج جەنەراڵەکە

جەنراڵە گیراوەکانیان بۆ لای شا برد و سەریان برا. یەك لەوانە کلیرخۆس کە بەشایەدی هەموان سەربازێکی راستەقینە بوو، بە شێوەیەکی نائاسایی ژیانی خۆی بۆ جەنگ تەرخان کردبوو. ئەمەش بەوە دیار دەبێت کە تا سپارتا لە جەنگدا بوو دژی ئەتینا ئەو هەر لە یۆنان بوو کەچی کە جەنگ وەستا، توانی بە حوکمەتەکەی خۆی بسەلمێنێت کەوا تراکییەکان دژایەتیی یۆنانییەکان دەکەن و لە دەرفەتێکدا رێگایەکی دۆزیەوە و بەدەریادا بۆ جەنگی تراکییەکان رۆیشتبوو لە باکووری خەرسۆنیز و پەرینتۆس. پاش لەوەی کە بەکەشتیی کەوتە رێ بەرپرسەکانی سپارتا رای خۆیان گۆڕی و لە ئیستمۆس بەدوایاندا ناردەوە. بەڵام ئەو بەقسەی نەکردن و گەڕایەوە بۆ هێلێسپۆنت، دەرەنجام بەڕێوەبەرایەتیی سپارتا حوکمی مەرگیان بۆ دەرچواند کەوا لە سپارتا هەڵگەڕاوەتەوە. ئینجا وەکو ئاوارەیەك خۆی لە کۆڕووش نزیك کردەوە و هەمان بیانگەی بۆ نووسی، بەوەش بوو بە جێ باوەڕی کۆڕووش. کۆڕووش ١٠٠٠٠ داریکی دایێ کە هیچی بۆ خۆی خەرج نەکرد، بەڵکو لەشکری بەو پارە پێك هێنا و جەنگی هەڵگیرساند و تراکیای بەزاند و تەخت و تالانی کرد و هەر بەردەوام بوو تا کۆڕووش بەدوای دا نارد.

بە گۆشەنیگای من، ئەمە ژیاننامەی پیاوێکە کە ژیانی خۆی تەرخان کردووە بۆ جەنگ. دەیتوانی بە خۆشی بژیێت و تووشی ئەو کێشە و ئازارە نەیەت. بەڵام وەك چۆن خەڵك پارە لە ئەوین و شادیی خەرج دەکەن، ئەو لە جەنگی خەرج دەکرد[1].

---

[1] ئەو مرۆڤە نموونەی زۆرە لە وڵاتی خۆمان بەتایبەتی هەندێك کۆنە پێشمەرگە و کۆنە ئەفسەر کە ناتاونن وەك من و تۆ بەبێ هەرا و مەترسی بژین. شایانی گوتنە کە سەددام حوسێنیش ئەو ئیدمانەی گرتبوو کە نەدەتوانی بەبێ جەنگ و کێشە بژیەت. و بە شێوەیەکی گشتی، سپارتییەکانی ئەو سەردەمە لە

ئەوانە دیاری دەخەن تا چ رادەیەك ژیانی بۆ جەنگ تەرخان کردبوو. تواناکانی لە مەیدانی سەربازیدا بەوە دیار بوون کە چەند حەزی لە مەترسی و سەرەڕۆیی دەکرد. شەو و رۆژ ئامادە بوو کە لەباری سەخت و ئالۆزدا رابەرایەتی بکات و هێرشی سەر دوژمنان بکات و دەیتوانی رێگای خۆی دەربکات. دەڵێن هەموو خەسڵەتەکانی رابەرایەتیی تێدابوو، پلانگێڕێکی یەکجار بەتوانا بوو دەیتوانی هەموو پێداویستییەکانی لەشکر دابین بکات و لەکاتی پێویستدا دەیگەیاندنە سەربازەکان. سەرنجی خەڵکی رادەکێشا، وای دەکرد بەقسەی بکەن چونکە پیاوێکی توند بوو روخسارێکی خۆسەپێنی هەبوو لەگەڵ دەنگێکی رەق. سزاکانی بە توندی و هەندێك جار بە توڕەییەوە دەسەپاند، تەنانەت هەندێك جار پەشێمان دەبۆوە کەوا هەندە دڕ بوو.

سزادان، یەکێك بوو لە بنەما سەربازیەکانی کلێرخۆس چونکە باوەڕی وا بوو کە لەشکر بەبێ پابەندبوون کەڵکی نیە. دەڵێن گوتویەتی (دەبێ سەرباز پتر لە فەرماندەی خۆی بترسێت نەك لە دوژمن، ئەمە بۆ ئەوەی کە بەبێ دوودڵی هێرش بکات و لەکاتی کشانەوەشدا بەباشترین شێواز فەرمانەکان بەجێ بگەیێنێت). دەربارەی کلێخۆس دەگێڕنەوە دەڵێن: لە کاتی بەرەنگاریدا روخسارە ترسناکەکەی نەرمتر دەبوو، وای لێ دەهات ببێتە مایەی دڵئارامی بۆ سەربازەکان. واش هەر لە شێنەییدا کە سەربازەکان دەرفەتیان دەبوو دەچوونە لای ئەفسەری دیکە چونکە هەندە رەق و دڕ بوو کە بەدەگمەن توانیویەتی دڵیان رابگرێت. پێوەندی لەگەڵ سەربازەکانی خۆی وەکو پێوەندی خوێندکار و مامۆستا بوو. بەم پێیە، کلێرخۆس هەرگیز ئەو پیاوانەی دەست نەکەوت کە لەپێناو برادەرایەتی و خۆشەویستیدا پشتی بگرن. ئەو رابەرایەتیەکی تەواوی بەسەر دەست و پاوەندەکانیدا دەسەپاند کەوا لەلایەن شارەکەیەوە ئەو

---

یۆناندا وەکو تکریتیەکان سەردەمی بەعس رەفتاریان لەگەڵ خەڵکی وڵاتەکە دەکرد. ئەمە نەك بە واتای کە خەڵکی شارەکانی دیکە لە سپارتا باشتر بوون. نەخێر، بۆ نموونە پێشتر ئەتینا باڵادەست بوون و هەمان کەڵەگاییان نواند، و پاش چەند ساڵێك لە سەردەمی زینۆفۆن بۆیۆتیەکان سپارتایان بەزاند و ئەوجار ئەوان بوون بە کەڵگای وڵاتەکە و دووبارە هەموویان بەگژیاندا چوونەوە تا لە کۆتاییدا عەشایەرە مەکەدۆنیەکان هەموو یۆنانیان راپێچەك کرد (٣٦٩ پ.ز.) ئینجا رۆم و ئەوجار تورك و ئیتر لەوساوە تا ساڵی ١٨٢٠ ی پاش زایین (واتە تا ٢٠٠٠ ساڵێك) یۆنان سەربەخۆیی نەدیت.

دەسەلاتەی پەیدا کردبوو، هەروەها بەهۆی دەستکورتی سەربازەکان یاخۆ لەبەر هەر شتێکی دیکە بووبێت، بەلاّم کە لەژێر رابەرایەتیی ئەودا سەرکەوتن وەدەست دەهات، لەوسا نرخی ئەم رەوشتانەیان دەزانی کە ئەو پیاوەیان کردبوو بەم سەربازە توندە. سەربازەکان لەلایەکەوە سودیان لەوە دەدیت کە لەسایەی کلێرخۆسدا ترسیان لە دوژمن دەشکا، و لەلایەکی دیکەوە ناچاربوون لەترسی سزادان پابەندییەکی تەواو بنوێنن. کەواتە وەکو فەرماندەیەك ئەم رەوشتانەی هەبوو، بەلاّم دەیانگوت حەزی نەدەکرد لەژێر فەرمانی خەلکی دیکەدا بێت. کە مردیش تەمەنی گەیشتبوە ٥٠ سالێك.

پرۆکسینۆسی بۆیۆتی لە تەمەنی هەرزەکارییەوە چاوی لە ئەنجامدانی کاری زل بوو. پارەیەکی زۆری لەوە خەرج کرد تا لەسەر دەستی گۆرگیاسی لیۆتینی بخوێنێ، بەلاّم گەیشتە باوەڕێك کە ئەو توانایەی نیە بەلکو بۆ برادەرایەتیی پیاوی مەزن باشە و لەلایەکی دیکەدا بۆ ئەوە باشە کاری سەربازی بەڕێوە ببات بۆیە رەگەلّ ئەو هەلّمەتە سەربازیەی کۆرووش کەوت کە بەخەیالّی خۆی، جگە لە پارە، بتوانێ ناوبانگ و دەسەلاّت پەیدا بکات. بەلاّم زۆر بە ئاشکرایی دەیگوت نایەوەێ ئارەزوەکانی بە شێوازی نا رەوا بەدی بێنێت. بە پێچەوانەوە، ئەو دەیویست بە شایستەیی ئەنجامیان بدات، دەنا با نەبن باشترە. پرۆکسینۆس لەگەلّ خەلکیدا رەند و بەئەدەب بوو و فەرماندەیەکی باشیش بوو، بەلاّم نەیدەتوانی سام بەسەر سەربازەکاندا بسەپێنێت. بەرانبەر سەربازەکانی خۆی پتر بەرگری لەخۆی دەکرد لەچاو ئەوەی کە ئەوان بەرگری لەخۆیان بکەن یان بپارێنەوە. زۆر دیار بوو کە بایەخی بەوە نەدەدا ئایا قسەی دەڕوات یان ناروات بەلکو پەرۆشی ئەوەی هەبوو جەماوەر ناوبانگی باش لەنێو سەربازەکاندا هەبێت. بیری دەکردەوە ئەگەر بیەوێ جەنرالێکی باش بێت، بەسیەتی ئافەریم و پاداشتی ئەو کەسانە بکات کە لیشی باشیان دەرکرد. ئەنجامەکەش ئەوەبوو کە خەلکە راستڕەوەکانی تاقمەکەی خۆی خۆشیان دەویست، بەلاّم خەلکی بێ بیر و باوەڕ سروکایەتییان بە پایەی وی دەکرد، وایان دەزانی کە بە ئاسانی کۆنترۆلّ دەکرێت. کە مرد تەمەنی ٣٠ سالێك دەبوو.

مینۆنی تێسالی بە ئاشکرایی مەراقی پارە بوو. ویستویەتی ببێتە جەنەراڵ بۆ ئەوەی دەسکەوتی پێ ببڕێت. مەبەستیشی لە پایەداریدا ئەوەبوو کە قازانجێکی زیادتر بکات بۆ ئەوەی تا خەڵکی گەورەتری ناسیبایە، ئەوسا پتر چاوپۆشی لە ڕەفتارە بەدەکانی دەکرا. فرت و فێڵ و درۆ لەلای وی شتی ئاسایی بوون بۆیە راستگۆیی بە جۆرێك نەفامیی دەزانی. پەرۆشی بۆ کەس نەبوو، ئەو کاتەی کە خۆی بە برادەری کەسێك نواندبایە ئیتر خەڵکەکە یەکسەر تێدەگەیشتن کە خەریکە زەبرێکی لێ بدات. لە گفتوگۆدا نە سووکایەتی بە دوژمن دەکرد و نە بایەخیشی بە قسەی خەڵکە خۆییەکان دەدا، تەنانەت بایەخی بە شمەك و ماڵی دوژمنیش نەدەدا چونکە بەشتێکی دوورەدەستی دەزانی. کەچی ماڵی برادەرەکانی خۆی، کە بە ئەمانەت دەسپێردران، ئەوانەی بە دەسکەوت دەزانی بۆ خۆی. ترسی گەورەی لە پیاوی درۆزن و بەدکار و بێ بەڵێن بوو چونکە وای دەزانی هەمان چەکی خۆی بەکار دێنن. هەروەها ئەگەر تووشی پیاوێکی وردبین و راستڕەو بایە، ئەوانەی بە نیمچە هۆشیار دەزانی، دەنا بەرانبەر بە پیاوی خواناس و راستگۆ و دەستپاك، مینۆن بە شانازییەوە تەڕەی دەدان و بەچاوی سووکایەتییەوە سەیری دەکردن. خەریکی کەسانێکی ناشرەزا دەبوو کە هەستیان بە کەمیی کردبایە و لەگەر ویستبای برادەرایەتی لەگەڵ کەسێکدا بکات ئەوسا لاسای خەڵکی پایەداری دەکردەوە. ئەو ڕێبازەی کە پێڕەوی دەکرد بۆ مسۆگەرکردنی پشتگیری سەربازەکانی خۆی ئەوەبوو کە لە دزی و تاوانەکانیاندا بەشداری دەکردن بۆ ئەوەی دواتر بەچاویاندا بداتەوە. باوەڕی وابوو دەبێ هێز و توانای خۆی دیار بخات و پێشانیان بدات کەوا ئامادەیە سوود لە خاڵەکانی لاوازیی ئەوان وەربگرێت[1].

لەوانەی کە وازیان لە خزمەتی وی دەهێنا بە پاشملە باسی دەکردن گوایە خێری پێ کردوون و چاوپۆشی لێ کردوون. ئیتر بە ڕەچاوکرنی رابردووی ژیانی، پیاو دەتوانێ بڵێت کە مینۆن پیاوێکی ناڕاست بوو. ئەم قسانەی ئێستا دێن زانیارییەکی گشتین دەربارەی ژیانی وی. لەکاتی خۆیدا کە کوڕێکی جوانکوڵە بووە بە ئەریستیپۆسی سەلماندوە کە رابەرایەتیی چەکدارەکان بەخۆی بسپێرێت. هەروەها پێوەندییەکی گەرمی لەگەڵ ئاریا هەبوو کە ئەگەرچی

---

[1] باوەڕم وایە ئەو مینۆنە ئەگەر ئێستا لە عیراق ژیابایە ئێستا هیچ نەبێ وەزارەتێکی وەردەگرت !!

..ون لە خەڵکە ناوچەیەکان بوو بەڵام ئاریا حەزی لە پیاوی قۆز بووە و هەر خۆی پێش ئەوەی ..ەڵ و و ردێنی پەیدا بن، ئاریپاستی گرتبوو بە (نێرە-دۆست) کە ئەوسا ئاریپاست تازە پێ گەیشتبوو.

هەرچۆنێك بێت، جەنەراڵەکانی دیکە بەهۆی ئەوە کوژران کەوا بەگژ شادا چوبوونەوە و لەگەرچی مێنۆن هەمان شتی کردبوو بەڵام شا جۆرە سزایەکی تایبەتی دیکەی بۆ دانا. مێنۆن وەکو کلیێرخۆس و جەنەراڵەکانی دیکە بە سەربڕین نەمرد، بەڵکو دەڵێن چارەنووسی وابوو کە یەك ساڵ لەژێر خراپترین حاڵدا بژییێت بەچەشنی هەر تاوانبارێك و دزێکی ئاسایی.

ئاگیاسی ئەرکادی و سۆکراتی ئاخەیی، ئەوانەش کوژران. کەس ناتوانێ لە ئازایەتییان کەم بکاتەوە یان بڵێ تێگەیشتنیان بەرانبەر بە برادەرەکانیان باش نەبوو. هەردووك تەمەنیان لەدەوری ٣٠ ساڵێك دەبوو.

# بابەتی سێیەم
# رێپێوان بەرەو کوردستان[١]

[١] ئەم ناونیشانە وەرگێڕی ئینگلیزی (رێکس وارنەر) بەکاری هێناوە دەنا وشەی (کوردستان) یەکەم جار لە سەردەمی سەلجووقی بەکار هاتووە. واتە ١٥٠٠ ساڵێک پاش ئەو سەردەمە.

## چاپتەر -١-
# زینۆفۆن دەستپێشخەری دەکات

کە جەنەراڵەکان گیران و سەربازەکان کوژران، یۆنانی کەوتنە بارێکی زۆر سەخت. وایاندەزانی لە پایتەختی شا نزیکن و کۆمەڵێك شار و خەڵکی دژوار دەوریان گرتوون و لە ئایندەدا کەس خۆراکیان پێ نافرۆشێت. بەلانی کەم ١٠٠٠ فەرسەخ لە یۆنان دوور بوون و کەسیش نەمابوو ڕێگایان پێشان بدات. ڕووباری بەرینیان لەپێش بوو و ئەو خەڵکەی کە بە هاوپەیمانیان دەزانین ئەوانیش ببوونە دوژمن، ئیتر بە تاقی تەنیا مابوونەوە و بەبێ هێزی سوارە. بەوەش دەیانزانی کە ئەگەر لەشەڕدا سەر بکەون ناتوانن دوژمنەکانیان بکوژن و ئەگەر ببەزن ئەوسا کەسیان بە زیندویی نامێنێت. ئەم ئێوارە کەس نانی پێ نەخورا، شەوێ کەس هێزی نەمابوو خۆی ڕێك بخات، زۆربەیان لەجێگەی خۆیان دانیشتن و خەویشیان لێ نەدەکەوت. یادی ماڵ و منداڵیان دەکردەوە وایاندەزانی تازە چاویان پێ ناکەوێتەوە.

یەکێ ئەتینی لە لەشکرەکە بوو بەناوی زینۆفۆن، نە جەنەراڵ بوو نە کاپتن و نەوەکو سەربازێکی ئاسایی[1]. پرۆکسینۆس، کە کۆنە برادەری بوو، بەدوای دا ناردبوو تا بیکاتە برادەری کۆرووش کەوا کۆرووشی لە ولاتی خۆی گرینگتر دەزانی. کە زینۆفۆن نامەکەی کۆرووش دەخوێنێتەوە پرس بە سۆرکراتی ئەتینی دەکات دەربارەی ئەم پێشنیازە. سۆکرات گومانی هەبوو کەوا برادەرایەتی کردنی کۆرووش لە ئەتینادا دەبێتە مایەی گلەیی و گازەندە (چونکە باوەڕیان وابوو کۆرووش یارمەتی سپارتای داوە دژی ئەتینا)[2]. سۆکرات ڕایسپارد کە

---

[1] ئێستاش کە لە (ڕۆشنبیرەکان) دەپرسی "زینۆفۆن کێ بوو؟" دەڵێن، وابزانم سەرکردەیەکی مەزنی یۆنانی بوو وەکو ئەسکەندەر. کەچی لەڕاستیدا (وەکو خۆی دەیڵێت) تەنانەت سەربازیش نەبوو بەڵکو تەنیا (مێوانی) پرۆکسینۆس بوو.

[2] بە ڕای من مێژووی کۆنی یۆنان بریتیە لە سێ قۆناغ. یەکەمیان قۆناغی هەڵمەتی فارس و جەنگی ڕزگاری دەگرێتەوە کە لە ئەنجامیدا شاری ئەتینا باڵادەست بوو. دووەم، سەردەمی فەلسەفە دێت، ئەمەش

بچێت بۆ پەرستگای دەلفی[1] تا پرسوڕای خواوەندەکان بکات. زینۆفۆن چوو و ئەم پرسیارەی ئاراستەی ئەپۆلۆ کرد: ئایا نوێژ و قوربانی بۆ چ خواوەندێك بکەم بۆ ئەوەی بەباشترین و سەربەرزترین شێوە بچم بۆ لەو گەشتەی کە لە مێشکم دایە و بەسەلامەتی و بە سەرکەوتوویش بگەڕێمەوە؟

وەلامی ئەپۆلۆ ئەمە بوو کە دەبێ قوربانی بۆ خواوەندێکی گونجاو بکات. جا کە زینۆفۆن گەڕایەوە بۆ ئەتینا، وەلامە ئاسمانییەکەی بە سۆکرات راگەیاند و کە سۆکرات بیستی، گلەیی لێ کرد کە دەبایە بپرسێت (ئایا بچێت یان نەچێت؟) چونکە پرسیارەکە وای دەگەیاند کە تازە بڕیارەکەی داوە و هەر دەڕوات ئەوجار پرسیویەتی کە چۆن باشترین رێگا بگرێت؟ سۆکرات گوتی: بەلام ئێستا کە تۆ پرسیارەکەت بەم جۆرە کردووە ئیتر دەبێ ئەم شتە جێبەجێ بکەیت کە خواوەندەکان گوتویانە.

---

ئەو سەردەمەی سوکرات و دواتر ئەفلاتوون و ئەرستۆ دەگرێتەوە چونکە پاش دۆڕاندنی ئەتینا رەوتێك لەو شارە پەیدا بوو (سۆکرات پەیدای کرد و زینۆفۆنیش یەکێك بوو لە قوتابییەکانی) ئەم رەوتە بەگژ رەوتی کۆنی ئەتینیە شارپەرستەکاندا چوونەوە، ئەمەش بۆ ئەتینا کوفرێکی گەورە بوو بۆیە بە بڕیارێکی (دیمۆکراسیانە) سوکراتیان کوشت و لایەنگرەکانی سۆکراتیان شاربەدەر کرد. قۆناغی سێیەم قۆناغی مەسیحیاتی بوو کە ئەو گەلەی یۆنان لەژێر چەپۆکی رۆمدا وەکو دەروێشێکی مازۆکییان لێ هات و روویان کردە خۆکوژی و خۆ ئازاردان و تەرکی ژیان.

[1] پەرستگای دەلفی (بەچەشنی کەعبە بۆ عەرەبی پێش ئیسلام) تاکە پەرستگایەك بوو کە هەموو شار و ناوچە یۆنانیەکان خواوەندی خۆیان لەوێ دادەنا وەك جۆرێك یەکیەتی نەتەوەیی، واتە بەحاڵ یەکیەتیەکی نەتەوەییان هەبوو (پێوەندیەکی دینیی لاواز) دەنا لەراستیدا هیچ شارێك دانی بە شارەکانی دیکە نەدەنا و هیچ لەهجەیەك دانی بە راستی و دروستی لەهجەکانی دیکە نەدەنا. هەر بەم بۆنەشەوە خوێنەر دەتوانێت هەست بە راستیەکانی ئەو سەردەمە بکات کەوا (خواوەند) هێمایەك بوو بۆ شناسنامە و ئینتیمای ئەم شار و ئەو شار، نەك بە واتای (دروستکەری کائینات). بە پێچەوانەی عەرەب و یۆنان، فارس یەك خواوەندیان بە گرینگ دەزانی. ئیتر یەك خواوەند بە واتای یەك شاە و یەك زمانی رەسمی و یەك نووسینی رەسمی و یەك ئینتیما. ئەمەیە راستی هەبوون و نەبوون یەك خواوەند. جا ئێمەی کورد با هەر بڵێین ئێمە یەك خودا دەپەرستین، بەلام کە تۆ گوتت (ئێمە لە فلان شارین یان فلان ناوچەین و دان بەوان دیکە نانێین) ئیتر نەتەوایەتیی چی و وەحدانیەتی چی؟

زینۆفۆن قوربانییەکەی کرد و بەڕێ کەوت. پرۆکسینۆس و کۆرووشی لە ساردیس دۆزییەوە کە هەندەی نەمابوو بڕۆن. بە کۆرووشیان ناساند. پرۆکسینۆس زۆر حەزی دەکرد لەگەڵیان بێت، کۆرووشیش وەکو پرۆکسینۆس پێی خۆش بوو و گوتی هەر کە هەڵمەتەکە بەسەرچوو یەکسەر دەینێرێتەوە بۆ ماڵێ خۆی. هەڵمەتەکە گوایە دژی پسیدیەکان دەکرا ئیتر زینۆفۆن بەخەیاڵێکی چەوتەوە رەگەڵ کەوت، چونکە لە کلیرخۆس بەولاوە کەس لە یۆنانییەکان نەیدەزانی هەڵمەتەکە دژی شایە. هەرچۆنێك بێت کە گەیشتونەتە سیلیکیا و مەسەلەکە بۆ هەمووان ئاشکرا بوە، بەناچاری بەخۆی گوت: جا چ بکەم! ئیتر سەرباری ترس و سامی گەشتەکە، زۆربەی خەلکەکە لە شەرمی یەکتر و لە شەرمی کۆرووش مانەوە و بەردەوام بوون.

زینۆفۆن فەرقێکی نەبوو لەچاو ئەوانی دیکە و لەم تەنگەتاوییەدا وەکو هەمووان پەرێشان ببوو و خەوی لێ نەدەکەوت. بەلام هەرچۆنێك بێت سووکە خەوێکی لێ کەوت و خەونێکی دیت. لەخەونەکەدا رەشەبایەك دەهات، بروسکێك بە ماڵی باوکی کەوت و ئاگری تێبەردا. کە لە خەو هەستا زۆر ترسابوو بەلام بەجۆرێك لە جۆرەکان پێی گەشبین بوو چونکە لەو تارمایی و رەشاییەدا ئەو چاوی بە رۆناکی زیۆس کەوتووە. بەلام لە هەمان کاتیشدا زانی کەوا زیۆس زەنگی مەترسیی رادەگەیێنێت، چونکە هەستی کرد زیۆس لە کەسایەتی شا بەرجەستە بووە و بۆی هاتووە. ئەو هەموو ئاگرەش لەدەوریدا رەنگە بەواتای ئەوە بوربێت کەوا رەنگە نەتوانێ لە ولاتی شا دەرباز بێت و لەهەموو لایەکەوە تووشی دەردەسەری ببێت. واتای راستەقینە خەونەکە بەوە دیار دەبێت ئەگەر بزانین دواتر چ رووی داوە.

ئەوەی کە رووی دا، ئەمە بوو. هەر کە بەخەبەر هات یەکەم شت هاتە مێشکی ئەمە بوو: من بۆچی لێرە پاڵ بدەمەوە؟ وا شەو دەڕوات و کە بەیانی دادێت رەنگە دوژمن بگەنە سەرمان. ئەگەر بکەوینە بەر دەستی شا ئەوسا هەرچی خراپە بەوپەڕی سەرشۆڕی پێمان دەگات، کەچی تا ئێستا کەس خەمێکی لێ ناخوات، پاڵمان داوەتەوە وەك بڵێی خۆ دەخافڵێنین. کەواتە دەبێ کام

شار ئەو جەنەراڵە پێشکەش بکات کە هەنگاوی راست دەنێت؟ ئایا دەبێ چاوەڕێ بم تا هەندێك پیرتر دەبم؟ ئەمڕۆ ئەگەر خۆ بدەمە دەست دوژمن، هەرگیز بەوە راناگەم کە پیرتر بم[1].

هەستایەوە و پێش هەموو شتێك کاپتنەکانی پرۆکسینۆسی بانگ کرد. کە کۆبوونەوە گوتی: کاپتنەکان، یەك لەبارە خۆمەوە باوەڕ ناکەم کەسمان هیچی تر خەوی لێ بکەوێت و هەر ئەوها بوەستین. گومان نیە کە دوژمن تەنیا ئەو کاتە شەڕەکەی ئاشکرا کرد کە زانی پلانەکانی تەواون، کەچی لەلای ئێمەدا کەس پلانێك دانانێت بای ئەوی کە شەڕێکی باشمان پێ بکرێت. جا ئەگەر خۆمان شل بکەین و بکەوینە بەر دەسەلاتی شا ئەوسا چی لێ رادەبینن؟ شا پیاوێکە تەرمی براکەی خۆی پارچە پارچە کردووە، کوڕی دایکی خۆی بەمردوویی وا لێ کردووە، کەواتە ئێمە چمان لێ دێت؟ ئێمە لەلایەکەوە خزمی نین و لە لایەکی دیکەوە بەگژیدا چووینەوە بەنیازی ئەوەی کە لە تەختی شاهانەی بخەینە خوار و کە ژێردەستەی بکەین و ئەگەر بکرێ بیکوژین، کەواتە ئایا شا پەنا بۆ هەموو رێگایە نابات بۆ ئەوەی هەرچی خراپە پێمان بکات؟ دەیکات بۆ ئەوەی لەمەو پاش کەس نەوێرێ بەگژیدا بچێتەوە.

گومان نیە کە ئێمە دەبێ هەموو توانامان بەگەڕ بێنین بۆ ئەوەی نەکەوینە بەر دەستی شا. تا ئەمڕۆ کە ئاگربەستەکە مابوو هەمیشە خەمم لە خۆ دەخوارد و بەحەسودییەوە سەیری شا و پیاوەکانی شام دەکرد، بیرم لەو هەموو وڵاتە گەورە دەکردەوە کە هەیانە و لەو هەموو سەرچاوە بێپایانە بۆ خۆراك و جۆرەها ئیشکەر و خزمەتچی، گاران و زیڕ و جل و بەرگ. لەلایەکی دیکە بیرم لە پیاوانی خۆمان کردەوە کە تەنیا بە کڕین دەستیان دەگاتە ئەو شمەکە باشانە (دەشزانم کە کەمیان ئەو پارەی ماوە). تا ئێستا دەستمان بەو سوێندە بەسترابوو خواردبوومان کەوا بەبێ پارە هیچ شتێك وەدەست نەهێنین. کە بیرم دەکردەوە خەفەتم لەو ئاگربەستە دەخوارد، بەڵام ئێستا ئەوان کۆتاییان بە ئاگربەستەکە هێنا، ئیتر سەردەمی لوتبەرزی ئەوان و خەفەتی ئێمە کۆتایی هات چونکە ئەو دەسکەوت و شمەکانە دەکەونە بەر دەستی ئەو کەسەی کە پیاوە.

---

[1] ئەم قسەی ناخی هەستەکانی زینۆفۆن دەردەخات کەوا بەرادەی سەرەکی بیری شاری خۆی کردۆتەوە؟

خواوەندەکان شایەدی ئەم بەرەنگاریەن و بێگومان لەلای ئێمەدان. لەوان سوروکایەتیان بەناوی خواوەندەکان کرد کەچی ئێمە بەهۆی ئەو سوێندەوە دەستمان پاراستبوو. ئیتر دیار و ئاشکرایە کە باوەڕمان گەورەترەوە و بۆ ئەو مەیدانە باشترین چونکە توانای دەست و بازوومان لەوان زۆرترە و بەرگەمان بۆ گەرما و سەرما و بۆ بارگرانی زۆرترە، هەروەها ورەمان بە هەبوونی خواوەندەکان بەرزترە و ئەگەر خواوەندەکان وەکو جاران سەرکەوتن بە ئێمە ببەخشن، ئەوسا کوشتنی دوژمن بۆ ئێمە ئاسنتریش دەبێت.

ڕەنگە زۆرکەسی تر هەمان هەستی هەبێت، کەواتە بەحەققی ئاسمان با ڕانەوەستین. با ئێمە یەکەم کەس بین کە ئەوانی دیکە بەرەو ڕێگای سەربەرزی بانگ بکەین[1]. ئەوها خۆ دیار بخەن کەوا لەنێو کاپتنەکاندا لەهەمووان ئازاترن و مافی ڕابەرایەتیان زۆرترە لەچاو ئەو کەسانەی کە ئێستا ڕابەرمانن. یەك لەبارە خۆمەوە، ئەگەر ئێوە ئامادە بن دەستپێشخەریـەکی ئەوها بکەن، من ئامادەم بەدواتان بکەوم. وە ئەگەر من بەرابەر دادەمەزرێنن، من تەمەنم ناکەم بە بیانگە. لەراستیدا، باوەڕ دەکەم کە بای ئەوە گەورە بوومە کە بتوانم بەرگری لەخۆ بکەم.

ئەمە بوو کە زینۆفۆن گوتی. کە قسەکانیان بیست هەموو کاپتنەکان هانیان دا کە ببێتە ڕابەریان تەنیا یەك کەس نەبێت لەوێ بەناوی ئەپۆلۆنیدیس کە لەهجەیەکی بۆیۆتی هەبوو[2]. ئەو ئەپۆلۆنیدیسە وای دەربڕی کە ئەم قسانە بێ واتان و ئەگەر ئومێدێك هەبێ بەساغی دەرچن، تەنیا بەوەیە کە دڵی شا نەرم بکەن. ئینجا دەستی پێکرد باسی مەترسییەکان بکات. بەڵام زینۆفۆن قسەی پێ بڕی و ئەم قسانەی کرد: کوڕی باش، تۆ کەسێکی نە دەزانی چ دەبینی و نە بەبیرت

---

[1] لێرەدا زینۆفۆن قسە بۆ چەکدارەکانی پرۆکسینۆس دەکات، ئەوانەش بۆیۆتی بوون و خۆیان بە جودا دەزانی لەچاو ئەرکادی و ئاخایی و سپارتی و کریتی و هتد. جا زینۆفۆن یاری لەسەر ئەم دەمارە دەکات (دەماری ناوچەگەری).

[2] لەهجەی بۆیۆتی (لەهجەی شاری تیبە) وەکو لەهجەی هەولێری ئەمڕۆ بوو بۆ خەڵکی ئەتینا (سلێمانیەکەی یۆنانی ئەو سەردەمە) و سپارتاش کە بە لەهجەی دۆری دەدوان ئەوان بادینیەکەی ئەوسا بوون. من زۆر جار گوتوومە ئەگەر دەرهێنەرێکی بخوازێ بەسەرهاتی زینۆفۆن بکاتە فیلمێك یان شانۆگەری، لەهجە کوردیەکانی ئەمڕۆ دەتوانن باشترین وێنە پێشان بدەن لە ڕاستیەکانی ئەوسای یۆنان.

دێتەوە چت بیستوە. خۆ تۆ لەوێ بوویت پاش مردنی کۆڕووش کە شا ناردی چەك دابنێین کەچی کە ئێمە چەکمان دانەنا و ئامادەی شەڕ بوین یەکسەر خەڵکی ناردەوە بۆ گفتوگۆ و ئینجا ئاگربەستی داهێنا. کەچی کە جەنەراڵەکانمان چوونە کۆنفرانسەکە دیتت چ قەوما. ئینجا سەرباری ئەو هەموو زانیارییانە، باوەڕت وایە کە ئەوانەی باسی بەرگری دەکەن قسەی بێ واتا دەکەن و دیسان دەبێ دڵی شا نەرم بکەین؟ سەربازینە، باوەڕم وایە کە نابێ ئەم کابرایە لەنێو تاقمی خۆمان بهێڵینەوە. دەبێ پایەی کاپتنایەتی لێ بستێنینەوە و پشتی بار بکەن بەچەشنی بارگین بەکاری بێنن. ئەم پیاوە ئەگەر یۆنانی بێت نەك هەر ناوچەی خۆی شەرمەزار دەکات بەڵکو هەموو یۆنان.

ئینجا ئاگاسیاسی ستێمفاڵی قسەکەی بڕی و گوتی: ئەم کابرایە نە حەقی بەسەر بۆیۆتیاوە هەیە و نە یۆنان. هەست دەکەم وەکو خەڵکی لیدیا گوێی کون کراوە.[1]

ئیشەکە ئەوها بوو و کاربرایان دوور خستەوە. ئەوانی دیکە بەنێو تیپەکاندا گەڕان بزانن هیچ جەنەراڵێك هەیە بانگی بکەن. یان ئەگەر جەنەراڵەکە نەبایە بریکارەکەیان بانگ دەکرد و ئەگەر کاپتنی زیندو هەبان، بانگیان دەگردن. کە هەموو بانگ کران بۆ شوێنی جبەخانەکە، ژمارەی کاپتن و جەنەراڵەکان دەگەیشتە ١٠٠ کەس. کۆبوونەوەکەش لە نیوەی شەو دەستی پێکرد. هیرۆنیمۆسی ئەلیس کە لەنێو کەپتنەکانی پرۆکسینۆسدا بەتەمەنتر بوو دەستی بەم قسانە کرد: جەنەراڵ و کاپتنەکان، لەم حاڵەی ئێستادا بڕیارمان دا کۆ ببینەوە و ئێوەش بانگ بکەین کە تێدا بەشدار بن بۆ ئەوەی ئەگەر بکرێت، بتوانین بگەینە بڕیارێکی سوودبەخش. ئێستا داوا لە زینۆفۆن دەکەم کە ئەم قسانە بکات کەوا پێشتر بۆ ئێمەی کرد.

بەم پێیە زینۆفۆن ئەم قسانەی کرد: لێرەدا شتێك هەیە کە هەموو دەیزانین. شا و تیزافەرنە هەموو ئەو کەسانەیان گرتووە کە دەستیان گەیشتۆتێ و دیار ئەگەر پێیان بکرێت هەموومان قەلاچۆ دەکەن. بەش بە حاڵی خۆمان، وەکو کە من دەیبینم، دەبێ تا پێمان بکرێ دەستی ئێمە

---

[1] لێرەدا هەموو قسەکان ناوچەگەرییان لێ دەبارێت. ئەم پیاوە گوایە پاکانە بۆ خەڵکی بۆیۆتیا دەکات، گوایە (نەتەوەپەروەرن) کەچی یەکسەر جنێو بە ناوچەیەکی دیکەی هێلینیەکان دەدات. بەڵێ لیدیا لە بەری ئەورووپا نەبوو بەلام ئەوانیش هیلێنی بوون.

بەسەریاندا بشکسێتەوە نەك ئێمە بکەوینە بەر دەستی ئەوان. حەز دەکەم تاکید بکەمەوە کە ئێستا ئێوە ئەرکێکی یەکجار گەورەتان لەئەستۆدایە. هەموو ئەو سەربازانەمان چاویان لە ئێوەیە و ئەگەر ببینن ئێوە ورەتان بەرداوە، هەموو ترسنۆك دەبن کەچی ئەگەر ئێوە بە ئاشکرایی ئامادە بن بەرەورووی دوژمن ببنەوە و داوایان لێ بکەن هەمان شت بکەن، لاتان مسۆگەر بێت کە ئەوسا ئەوانیش هەوڵ دەدەن وەکو ئێوە بن. هەرنەبێ ئێوە جەنەراڵ و ئەفسەر و کاپتن، و لە کاتی ئاشتیدا مووچە و رێزێکی زۆرتر بە ئێوە دەگات لەچاو ئەوان. ئێستاش لەکاتی جەنگدا دەبێ ئێوە پتر خۆ رابگرن لەچاو تێکرای ئەوانی دیکە و دەبێ لەباتی خەڵکەکەش بڕیار بدەن. وە ئەگەر پێویست بوو، دەبێ یەکەم کەس بن کارە گرانەکان جێبەجێ بکەن.

بەرای من، دەبێ پێش هەموو شتێك جەنەراڵ و کاپتن دەستنیشان بکەن لەشوێنی ئەو کەسانەی کە نەماون چونکە ئەگەر سەردەستەکان خەڵکەکە کۆنترۆڵ نەکەن، هیچ شتێك ئەنجام نادرێت. ئەم قسە راستییەکی رەقە و لە هەموو بوارەکانی ژیاندا پێویستە و لەمەیدانی رێکخستنی سەربازاندا پێویستتریش دەبێت. رەندایەتی وا دەکات کە هەست بە ئاسوودەیی بکەین دەنا پێش ئێستا، بەرەڵایی جۆرەها خەڵکی لەنێو بردووە.

ئینجا پاش ئەوەی ژمارەیەك ئەفسەر دادەنرێن، دەبێ داوای کۆبوونەوەیەکی گشتی بکەن و ورەیان بەرز بکەینەوە چونکە باری ئێستا ئەمە دەخوازێت. لەم کاتەی ئێستاماندا وابزانم وەکو من دیتتان کە بۆ نۆرەی پاسەوانیی شەو چەکیان وەردەگرت، چەندە لەشیان گران بوو. لەحاڵەتی ئەوهادا نازانم ئایا چ سودێکیان دەبێت ئەگەر بەرۆژ بیت یان بە شەو. بەڵام ئەگەر بتوانین جۆری بیرکردنەوەیان بگۆڕین ئەوسا ورەیەکی گەورە پەیدا دەبێت و ئەوسا سەبازێك لەباتی ئەوە بیر لەوە بکاتەوە و بڵێ (چم بەسەر دێت؟) بیر لەوە دەکاتەوە دەڵێ (چ پێویستە بیکەم؟)

ئێوە باش ئاگادارن کە مەرج نیە ژمارەی هێزەکان سەرکەوتن مسۆگەر بکات. نەخێر، سەرکەوتن بەوە دێتە دی کە لایەنێك بە پشتیوانی خواوەندەکان و بە ورەی بەرزەوە بۆ دوژمن بچن. وەکو ئێوەش، من سەرنجم داوەتێ کەوا لە سەربازیدا ئەو کەسانەی کە پەرۆشی ژیانی خۆیانە ، ئەوانە لەئەنجامدا تووشی مەرگێکی سەرشۆڕانە دەبن. کەچی ئەوانەی باوەڕیان وایە کە

مەرگ چارەنووسی هەمووانە و مەراقیانە بە سەربەرزی بمرن، ئەوانە زۆربەی جار دەگەن تەمەنێکی گەورە و ژیانێکی خۆشتر بەسەر دەبەن. هەندێك راستیش هەن کە دەبێ رەچاویان بکەین (کە حاڵی ئێستامان دەیخوازێت) و دەبێ دیاری بخەن کەوا ئێوە بەجەرگەن و دەبێ ببنە نمونە بۆ ئەوانی دیکە.

ئەوها کۆتایی بە گوتارەکە هێنا. پاش ئەمە خیریسۆفۆس قسەی کرد و گوتی: زینۆفۆن، تا ئێستا هەر ئەوەم بیستبوو کە تۆ کابرایەکی ئەتینی بەلاّم ئێستا پیرۆزباییت لێ دەکەم بۆ ئەم گوتارە و ئەم رەفتارە. حەزیش دەکەم خەڵکی وەك خۆت تا بکرێ زۆر بن. بەوە روحیەتی پێویست لە لەشکرەکەدا بلاّو دەبێتەوە. جا ئێستا با کاتەکەمان بەفیرۆ نەدەین. برادەرینە، با برۆین ئەفسەری نوێ هەڵبژێرین بۆ ئەوانەی کە ئەفسەریان نیە. دواتر وەرنەوە ناوەڕاستی ئۆردوگاکە لەوێدا هەموو سەربازەکان ریز دەکەین. تۆلمیدیسی نامەبەریش با لەگەڵمان بێت.

بەم قسانە هەستایەوە سەر پێ تاکپێشانیان بدات کەوا کەس دوا نەکەوێت ودەبێ ئیشەکان زوو جێبەجێ بکرێن. دوابەدوای ئەوە ئەم ئەفسەرانە هەڵبژێردران. تیماسیۆن کە پیاوێکی داردانی بوو لە جێگەی جەنەراڵ کلێرخۆس دانرا. زالتیکلیس کە ئاخەیی بوو جێگەی جەنەراڵ سۆکراتی گرتەوە. کلینۆری ئەرکادی لە جێی ئاگیاس دانرا. فیلیسیۆسی ئەرکادی لە شوێنی مینۆن دانرا. زینۆفۆنیش کە ئەتینی بوو لە جێی پرۆکسینۆس دانرا.

## چاپتەر -٣-
# ئەنجومەنی جەنگ

تازە رۆژ دادەهات، ئەفسەرە نوێکان هەڵبژێردران و هاتنە ناوەڕاستی ئۆردوگا و بڕیاریان دا نێشکچی بڵاو بکەنەوە و ئەوانی دیکە بانگ بکەن بۆ کۆبوونەوە. پێشیێ خیریسۆفۆس ئەم قسانەی کرد: سەربازینە ،گومان نیە کە ئێمە لە حاڵێکی سەخت داین. ئێمە چەند جەنەراڵ و کاپتن و سەربازێکی بە توانامان لەدەست چوو. هەروەها پیاوەکانی ئاریا کە لەلای مە بوون، ئێستا خیانەتیان لە مە کردووە، ئیتر هەر چۆنێك بێت ئەوەی ئێستا پێویستمانە بیکەین بۆ ئەوەی کە بەسەر گرفتەکانماندا زاڵ بین و لەباتی کۆڵدان دەبێ ئازایانە و سەربەرزانە سەرکەوین. هەر نەبێ بمرین نەك بکەوینە بەردەستی دوژمن دەنا تووشی دەردێك دەبین کە تەنیا بۆ دوژمنانی دەخوازم.

پاش ئەمە کلینۆری ئۆرخۆمینۆس هەستا ئەم قسانەی کرد: سەربازەکان، بەچاوی خۆتان دەبینن چۆن شا پیاوێکی بێسوێند و بێخودا دەرچوو. خیانەتی تیسا فەرنەسیشتان دیت، هەر ئەو بوو خۆی بە هاوسێی یۆنان دەزانی و دەیگوت گوایە پەرۆشی گەورەی بۆ ئێمە هەیە کە بە ساغی بگەڕێینەوە. لەو رێککەوتنەدا خۆی سوێندی خوارد و خۆی دەستی راستەی داینێ و خۆی فێڵی لە جەنەراڵەکان کرد و گرتنی و رێزێکی زۆر کەمی پیشاندا بەرانبەر زیۆس، چاودێری مەزنی میوانداریێی تەنانەت لە خواردنی جەمێکدا لەگەڵ کلیرخۆس بەشداری کرد کەچی هەر ئەو هەلکەوتەی بۆ گرتنی ئەوان قۆستەوە. لینجا لەگەڵ ئاریا، کە نیازمان هەبوو بیکەینە شا، بەڵێنمان بە یەکتر دابوو خیانەت لە یەکتر نەکەین بەڵام ئەویش بەبێ ئاوڕدانەوەیەك لە یادی کۆڕووش و بەبێ هیچ ترسێك لە خواوەندەکان ئێمەی بەجێ هێشت و رەگەڵ دوژمن کەوت و دەیوسیت زەبرمان لێ بدات. دوعا دەکەم خواوەندەکان لەم شتانەیان لەگەڵدا بکەن

که لێیان دەوەشێتەوە. سەبارەت ئێمەش دەبێ هیچیتر تەفرە نەدرێین و تا پێمان بکرێت شەڕی توند بکەین. جا ئەوەی ئاسمان دەیکا پێی رازی دەبین.

پاش ئەمە زینۆفۆن هەستا باشترین بەرگی پۆشتبوو. بیری کردبۆوە که ئەگەر خواوەندەکان سەرکەوتنی پێ ببەخشن، سەرکەوتن شایستەی پیاوی زرێپۆشی قۆزە. دەنا ئەگەر بمرێت، مافی خۆیەتی لەکاتی مەرگدا باشترین بەرگی پۆشتبێت. قسەکانی بەم جۆرە کرد: کلینۆر باسی خیانەت و بێسوێندیی خەڵکە ناوچەییەکانی کرد، واش بزانم کەس لاریی لە قسەی ناکات، جا مەگەر زۆر بێ ورە بین تا دیسان باوەڕیان پێ بکەینەوە و بەچەشنی جەنەراڵەکانمان بکەین کە باوەڕیان پێ کردن و خۆیان خستە بەر دەستیان. بەڵام ئەگەر مەبەستمان بێت چەکی خۆمان لەدەست بگرین و پێیان بپژێرین و لە ئایندەدا شەڕێکی بێهوودان لە دژیاندا بکەین، ئەوسا بە یارمەتی ئاسمانەوە ئومێدمان زۆرە کە سەلامەتییەکی سەربەرزانەمان پێ ببڕێت.

کە ئەم قسانەی دەکرد، یەکێك پشمی. کە سەربازەکان گوێیان لێ بوو، کەوتنە سەر ئەژنۆ و سەڵەواتیان بۆ خواوەندەکان بەرز کردەوە چونکە ئەمەیان بە نیشانەیەکی ئاسمانی دانا. زینۆفۆن بەردەوام بوو: سەربازان، وابزانم کەوا نیشانەیەك لەلایەن زیۆسی رزگارکەرەوە بە ئێمە گەیشت. ئێستا کە باسی رزگاربوون دەکەین وابزانم دەبێ خێر لەخۆمان بگرین کە ئەگەر گەیشتینە یەکەم جێگای ئاسوودە دەبێ یەکسەر شوکرانە بۆ خواوەند بکەین و بەگوێرەی توانا قوربانی بۆ خواوەندەکانی دیکە بکەین. ئەوەی بەم قسە رازییە با دەستی بڵند بکات. هەموو دەستیان بڵند کرد و سوێندیان خوارد و سرودی پایان خوێندرا.

کە رێورەسمە دینیەکان بەرێوە چوون، زینۆنۆفۆن دەستی پێ کردەوە و ئەم قسانەی کرد[1]: تازە دەمگوت کە ئێمە ئومێدمان زۆرە. یەکەم، ئێمە سوێندی خۆمان نەشکاندوە کەچی دوژمن بێسوێند بوون و ئاگربەستیشیان شکاند، ئەمە بای ئەوەیە کە باوەڕ بکەین خواوەندەکان دژی دوژمن دەوەستن و دەتوانن بێ دەسەڵاتێك بکەنە دەسەڵاتدار و بە ئاسانی خەڵکی لێقەوماو لە

---

[1] ئەم گوتارەی زینۆفۆن زۆر دوور و درێژە و باوەڕم وایە کە زۆری پێوەناوە.

مەترسی گەورە رزگار بکەن. دووەم، دەمەوێ بیرتان بێنمەوە چۆن باپیرەکانمان تووشی مەترسی بوونە و چۆن، بەیارمەتیی خواوەندەکانەوە، پیاوی ئازا رێگای خۆی بەنێو گەورەترین مەترسیدا دەردەکات. با لەبیرتان بێت چۆن فارس و هاوپەیمانەکانیان بە هێزێکی یەکجار زل هاتن وایاندەزانی دەتوانن ئەتینا لەسەر رووی زەمین بسڕنەوە، بەڵام ئەتینییەکان بای هەندە ئازا بوون کە بە تەنیا بەرەنگاریان ببنەوە و بەزاندیانن. لەکاتی خۆیدا خێریان بۆ ئەرمیتیس لەخۆ گرت کە بەرانبەر هەر پیاوێکی کە لە دوژمن بکوژرێت یەك بزن بکەینە خێر. بەڵام چونکە هەندە بزنیان نەبوو، بڕیاریان دا ساڵانە ٥٠٠ بزن بکەنە خێر و تا ئەمڕۆش بەردەوامن. دوایە کە زەرکیس Xerxes لەشکرە گەورەکەی هێنا سەر یۆنان، باوکانی ئێوە باوکانی ئەو دوژمنانەیان لەسەر زەمین و لەدەریادا بەزاند، بەڵگەش بە بەڵگەی ئەو جامەیە کە هەمانە بەڵام بەڵگەی گەورەتر ئازادیی ئەو شارانەیە کە ئێمە تێدا لەدایك بووین و پەروەردە کراین کەوا ئێوە هیچ پیاوێك ناپەرستن تەنیا خواوەندەکان نەبێت. ئەوانەبوون ئەو پیاوانەی کە ئێوە کوڕیانن. پێش چەند رۆژێکیش ئێوە لەبەرەی شەڕ بوون دژبە کوڕانی ئەو کۆنە دوژمنانە و ئەگەرچی ژمارەیان جارەها لە ئێوە زۆرتر بوو، پشت بە خواوەندان ئەستور بەزاندتانن و لەو مەیدانەشدا ئازایەتیی خۆتان نواند بۆ ئەوەی کۆڕووش بکەینە شا. بەڵام ئەمجارە شەڕەکە بۆ ئاسوودەیی خۆتانە بۆیەش دوو هەندە ئازایەتی لە ئێوە رادەبینم. هەروەها دەبێ باوەڕتان بە خۆتان گەورەتر بێت لەچاو دوژمن. جاری پێشو ئێوە شارەزا نەبوون، واش هەر رووحی باوکەکانتان تێدا بوو و توانیتان بەرەنگاریان ببنەوە. جا ئێستا کە شارەزایان بوونە، ئەوانە ئەگەر جارەهای جار لە ئێوە زۆرتر بن ئەو جەرگەیان نەماوە بەرەورووتان بوەستن.

ئایا چ هۆیەکتان ماوە بۆ ئەوەی ترستان نەشکێت؟ باوەڕ مەکەن کە ئێمە لەچاو ئەوان خراپترمان بەسەردا هاتووە بەهۆی کەوا خەڵکە ناوچەییەکانی کە لەلای خۆماندا بوون ئێستا لەگەڵ دوژمن وەستاون. ئەوانە نامەردترن لەوانەی کە بەزاندمانن، ئەوانە ئەم راستییەیان بەوە سەلماند کاتێك کە پشتی ئێمەیان بەردا. کەسانێکی کە لە یەکەم دەرفەتدا سەنگەر دەگۆڕن، باشتر ئەوەیە کە لە ریزی دوژمن بن نەك لە نێو ریزەکانی ئێمە.

ئەگەر کەسێکتان وره‌ی بەرداوە بەهۆی کەوا ئێمە هێزی سوارەمان نیە و دوژمن دەیان هەزار سوارەی هەیە، دەبیّ بزانێت کەوا ١٠,٠٠٠ سوارە، واتە ١٠,٠٠٠ پیاو، دەنا لە شەڕدا کەس بە لوشکەی ولاغان نەکوژراوە. ئەوەی کە لە شەڕدا دەکرێت هەموو پیاو دەیکات، کەواتە لە کاتی پێشڕەوییدا ئێمە تەنیکی توندترین کەچی ئەوان لە ئاسمانن و لەسەر پشتی ئەسپەکانن، لە ئێمەش دەترسن و لەوەش دەترسن کە بکەونە خوار، کەچی ئێمە کە پێمان لەسەر زەوی چەقاندوە دەتوانین زەبری توندتر بوەشێنین. تەنیا یەك شت هەیە کە سوار تێدا بالأدەستە ئەمەش ئەوەیە کە دەتوانیّ زووتر هەڵێت!

گومان نیە کە دەبیّ باوەڕتان لەشەڕدا گەورەتر بێت بەلاّم بیّزارن کەوا لەمەوپاش تیزافەرنە رێگاتان پێشان نادات و شا رێ نادات خۆراك دابین بکەن. ئەگەر وایە کەواتە بیر لەوە بکەنەوە ئایا باشتر ئەوەیە دوژمنێکی وەکو تیزافەرنە رێنماییمان بکات یان ئەو ئەسیرانەی کە دەیانگرین و ناچاریان دەکەین رێگامان پێشان بدەن ئەوان رێگامان پێشان بدەن باشترە؟ ئەوانە دەزانن کە ئەگر هەڵەیەك بکەن ئەوسا بەسەر ژیانی خۆیاندا دەشکێتەوە. سەبارەت بە خۆراکیش، لەخۆتان بپرسن کامە باشترە، ئەوان رێگامان بدەن خۆراك بکڕین (کەوا زۆرکەس پارەشی نەماوە) یان باشتر ئەوەیە کە بیانبەزێنین و ئەوسا هەرکەس بە ئارەزوی خۆی پێداویستییەکان دابین بکات؟

لێرە هەست دەکەن رووباری بەرین پشتان لێ دەگرێت و رەنگە ناچار بین بچینە نێو بۆتەیەکی دوژمن. بەلاّم دەبیّ ئەوەش بزانن کە دوژمن نەفامن، سەرچاوەی رووبارەکان لێرە نزیکن لەوێدا ئاوەکە یەك ئەژنۆ قوڵە، تەنانەت ئەگەر ئێمە نەتوانین رووبارەکان ببڕین و نەشتوانین کەس رێگامان پێشان بدات، ئەوانە بای ئەوەنین کە ورە بەردەین. خۆ خەڵکی میسیا لە ئێمە پیاوتر نین، واش هەر کۆمەڵێك شاری گەورەیان ئازاد کردووە لەنێو ولاّتی شادا و دژ بە ویستی شادا. هەمان شت پیسیدیەکان کردوویانە و بەچاوی خۆمان ئەم راستیانەمان دیت کە خەڵکی لیکۆنیا دەستیان بەسەر زەوی و زارێکی گەورەدا گرتووە و لێی دەخۆن. لەحاڵەتی ئێمەدا ناتوانم بڵێم بەم زوانە بەرێ دەکەوینەوە، تەنانەت دەبیّ حیسابی خۆمان بکەین کە رەنگە ماوەیەك لێرە دابکوتین. لام مسۆگەرە کە شا هەموو ئەو رێناسانە دابین دەکات کە میسیەکان داوایان

،ردوون و بارمتەشیان دەداتێ وەکو گەرەنتی کەوا بەسەلامەتی دیاننێرێتەوە بۆ ولاتی خۆیان و ڕێگای ئەوهاشیان بۆ دروست دەکات ڕێگای عەرەبانەی چوار ولاغیش داوا بکەن، هەر بۆیان دەکات. جا من تاکیدم کە ئەگەر شا بزانێت نیازی مانەوەمان لەمێشك دایە ئەوسا ئامادە دەبێت سێ هەندە بۆ ئێمە بکات.

بەلاّم نا، من لەوە دەترسم ئەگەر لە ژیانی تێر و نەرم ڕاهاتین و حەزمان کرد کە بیینە هاورنشینی ژن و کچی میدی و فارسەکان ئەوسا وەکو گولەبەڕۆژە لەگەلّ خۆر بسوڕێین و گەڕانەوەمان لەبیر بچێتەوە[1]. بۆیە دەبێ یەکەم ئەرکی سەر شانمان ئەوە بێت کە بچینەوە یۆنان و پێشانیان بدەین چۆن خەلکێکی خۆیان وا دەولەمەند بورنە. بۆ ئەوەی کە تێیان بگەیێنین کەوا لەو هەژاری و گرانییەی کە ئەوان تێدان، ئەمە شتێکە کە خۆیان هەلّیان بژاردوە. سەربازین، پێویست ناکا لێی قولّ ببمەوە، دیار و ئاشکرایە کە ئەو هەموو شتە باشانە دەشێ بەدەست داگیرکەرێکی سەرکەوتو بکەون.

پێویستە مەسەلەی گەڕانەوە شی بکەمەوە کە چۆن بەباشترین شێواز بیکەین و ئەگەر توشی شەڕ بوین، چۆن باشترین ئەنجامی لێ دەرکەین. یەکەم پێشنیاز ئەوەیە کە هەموو عەرەبانە و ڕەشماڵەکان بسوتێنین تاکو ناچار نەبین بەدوا بارگینەکان بکەوین، بەلّکو کوێ باش بوو بەوێدا دەڕۆین، ڕەشماڵەکانیش بارمان گران دەکەن. هەروەها هەموو شمەکی نا پێویست لەکۆلّ بکەینەوە تەنیا چەك خۆراك و شمەکی ئاشپەزی. با زۆربەمان چەك هەلّگرین، تەنیا هەندێکمان بارەکان بەرن. دواتر کە دەیانبەزێنین ئەوسا هەموو شمەکی ئەوان بۆ مە دەبن و ئەوان بۆمان هەلّدەگرن.

---

[1] نایخۆم تاڵە. وەك بلّێی ژنە میدی و فارس وا لەبەر دەرگا بۆ زینۆفۆن وەستاون!. خۆی ڕاستیەك هەیە کە چۆن ئێستا گەنجی خۆمان چاوی لە شارستان و ئافرەتی ئەورووپایە، ئەوسا خۆرهەلاّتی ناوەڕاست هەمان شت بوو. بەلاّم ئەم قسەی زینۆفۆن وێڕای قسەکانی کە پێشتر باسی ئەوەی کرد گوایە (پیادە لە سوار باشترن)، دەیسەلمێنن کە مەیلی زیادڕۆیی و خۆدەرخستنی هەبووە.

یەك شت ماوەتەوە باسی بکەم کە لەهەموو شتێك گرینگترە. بزانن دوژمن چۆن بیر دەکەنەوە. ئەوان دەستیان نەوەشاند تا زانیان کەوا جەنەراڵمان نەماون چونکە زانیان کە تا پابەندی جەنەراڵەکانمان ببین پێمان ناوێرن. ئێستا وادەزانن رابەرایەتی و پابەندیمان نەماوە، بۆیەش دەبێ جەنەراڵەکانی ئێستا پەرۆشێکی گەورەتریشیان هەبێت، وە ئەگەر یەکێك پابەندیی نەنواند دەبێ هەموو پشتی بەردەین و پێکەوە سزای بدەین، ئەمە دەبێتە مایەی گەورەترین خەفەت بۆ دوژمن چونکە لەباتی یەك کلێرخۆس ئەوسا تووشی ١٠,٠٠٠ کلێرخۆس دەبنەوە کە هیچیان چاوپۆشی لە بچووکترین رەفتاری ناسەربازییانە ناکات.

کاتی ئەوە هات کۆتایی بەقسەکانم بێنم. رەنگە هەرئێستا دوژمن بگەنە سەرمان. ئەگەر بە پێشنیازەکانی من رازین، با بەزووترین کات بەتێکرای سەربازەکان رابگەێندرێت و زوو جێبەجێ بکرێت. وە ئەگەر کەسێك رایەکی باشتری هەیە لەوانەی کە من باسم کردن دەبا بای هەندە ئازا بێت کە باسیان بکا تەنانەت ئەگەر سەربازێکی بچووکیش بێت. ئاسوودەیی کە ئامانجی هەموومانە، دەبێ ئەرکی هەموومان بێت.

پاش ئەمە خیریسۆفۆس قسەی کرد: ئەگەر بمانەوێ هیچ مەسەلەیك لەوانە زیاتر بکەین کە زینۆفۆن باسی کردن با بە یەك – دوو خولەك بیکەین. من دەڵێم دەنگدانێك لەسەر پێشنیازەکانی زینۆفۆن بکرێت کەوا ئەمە باشترین رێگایە. ئەوانەی پەسندی دەکەن با دەست بلند بکەن.

هەموو دەستیان بلند کرد و زینۆفۆن هەستایەوە ئەم قسانەی کرد: سەربازینە، گوێ لەم پێشنیازانەش بگرن کە دەمەوێ بیانخەمە روو. پێویستە بە رێگایەکدا برۆین کە خۆراکی تێدا دەسکەوێت. وابزانم چەند گوندێکی باش دوو فەرسەخ لێرەرا دوورن بەلام رەنگە دوژمن وەك سەگی ترسنۆك رەفتار بکەن و هەرکەسێك بچێتە وێ دەیگەزن، کەچی ئەوەی راویان بنێت لەبەری هەلدێن، بەسەیریشی نازانم کە لێرە رۆیشتین بەدوامان بکەون. رەنگە باشتر ئەوە بێت کە هۆپلیتەکان چوارگۆشەیەکی فەوارە بۆش پێك بێنن تا ئەوانەی کە بارەکان هەلدەگرن، جەنەراڵ و خەلکەکانی دیکە لەنێویدا ئاسوودەتر بن. ئێستا ئەگەر پێمان بگوترێت کێ لە پێشەر

ەروات و هێزی پێشڕەوی ڕێك بخات و دەبێ کێ لەسەر باڵەکان بێت و کێ بەرپرسی بشتەوە بێت. ئەوسا ناچار نابین لەکاتی پەلاماری دوژمن ئەمانە بکەین، بەڵکو هەرکەس ئەرکی خۆی دەزانێ دەگەیێنێت. ئەگەر کەسێك پێشنیازی باشتری هەیە با بیکات. ئەگەر نا، من دەڵێم با خریسۆفۆس لەسەر تاقمی پێشەوە بێت[1]. ئەو باڵادەستیەکی هەیە کەوا سپارتییە. دوو جەنەراڵی بەتەمەنیش با لەسەر باڵەکانی ڕاست و چەپ بن و ئەوەی لە هەموومان گەنجترە، تیماسیۆن و خۆم، دەبێ بەرپرسی پاسەوانانی پاشەر بێت. ئەم پێشنیازە دەکەم وەکو پلانێکی کاتی. دواتر دەتوانین بزانین چ جۆر دەستکاری نەخشەکان بکەین بەگوێرەی بار و پێداویستیی کاتی خۆی. ئەگەر کەسێك پێشنیازی هەیە با بیخاتە ڕوو.

کە کەس لاری نەبوو، زینۆفۆن گوتی: ئەوانەی ڕازین با دەست بلند بکەن. پێشنیازەکە پەسند کرا.

زینۆفۆن بەردەوام بوو و گوتی: ئێستا دەبێ بڕیارەکانی خۆمان جێبەجێ بکەین. ئەو کەسەی دەیەوێ چاوی بە خزم و کەسی خۆی بکەوێتەوە دەبێ سەربازێکی ئازا بێت، ئەمەش تاکە ڕێگایەکی ئەو مەبەستەیە. ئەوەی ژیانی دەوێ با سەرکەوتن بکاتە ئامانج، تەنیا سەرکەوتووەکان دەتوانن خەڵکی دیکە ببەزێنن دەنا بەزیوەکان هەر دەکوژرێن. وە ئەوانەی پارەیان گەرەکە دەبێ هەوڵ بدەن شەڕ ببەنەوە. براوەکان نەك هەر ماڵی خۆیان لەدەست دەمێنێت بەڵکو دەتوانن ماڵی دۆڕاوەکانیش بخۆن.

---

[1] وابزانم ئەمەش هەر یەکێکە لە زیادڕۆییەکانی زینۆفۆن. وای دیار دەخات گوایە خۆی سەرلەشکری نوێی دەستنیشان کردووە.

## چاپتەر -٣-
# لەژێر تیربارانیدا

لە کۆتایی ئەم گوتارەدا هەستان ئاگر لە عەرەبانە و رەشماڵەکان بەردەن. کە کەسێك پێویستی بە شتێك دەبوو، لەنێوان خۆیان بەشیان دەکرد دەنا تێکرای شمەکەکانیان سووتاند. کە ئەمە کرا، نانیان خوارد. میترادیس بە ٣٠ سوارێکەوە هات داوای کرد جەنەراڵەکان لێی نزیك بینەوە و ئەم قسانەی کرد: برادەرە یۆنانیەکان، دەزانن کە من دڵسۆزی کۆرووش بووم و هێشتا برادەری ئێوەم. ئەگەرچی لێرەدا هەڵوێستی من مایەی دڵتەنگییە بۆ ئێوە بەڵام ئەگەر نیازتان هەیە رێگایەکی ئاسوودە بدۆزنەوە تاکو لێرە دەرباز بن، حەز دەکەم رەگەڵتان بکەوم. پێم بڵێن چ نیازێکتان هەیە، وا بزانن بە برادەرێکی رادەگەیێنن کە دەیەوێ لەم رێیپوانەدا لەگەڵتان بێت.

پاش گفتوگۆ جەنەراڵەکان بڕیاریان دا ئەم وەڵامەی بدەنەوە، خیریسۆفۆس بوو بە بێژەر[1]: ئەگەر رێگامان بدەن بگەڕێینەوە وڵاتی خۆمان ئەوسا بە کەمترین زیان گەیاند بەنێو وڵاتەکەدا تێدەپەڕین، دەنا ئەگەر رێگامان لێ بگرن ئەوسا بەوپەڕی توندی و بەشەڕ رێگای خۆمان دەکەینەوە.

میتراداتیس خەریك بوو پێیان بسەلمێنێ کە دەربازبوونیان ئومێدێکی نەبودەیە (موستەحیل). لەم قسانەشدا هەستیان کرد کە شا بۆ مەبەستێکی نهێنی ناردوویەتی، مسۆگەریشە کە تیزافەرنە جاسووسی لەسەر میتراداتیس داناوە. جەنەراڵەکان بڕیاریان دا کە بەبێ گفتوگۆ شەڕ بکەن چونکە باڵوێزەکانی شا دەیانویست یۆنانییەکان تەفرە بدەن. تەنانەت یەك لە کاپتنەکان، نیکارخۆسی ئەرکادی، بە خۆ و بە سەربازەکانیەوە هەڵات بۆ لای دوژمن.

پاش نانخواردن لە رووباری زاپاتاس پەڕینەوە و بەشێوازی جەنگی پێشڕەوییان کرد. بارگین و شمەکی ئۆردوگاکە لەنێو چوارگۆشەکە دانران و پێش ئەوەی شوێنەکە بەجێ بهێڵن میتراداتیس لەگەڵ ٢٠٠ سوار و ٤٠٠ تیرەنداز، چەکیان زۆر سووك بوو، بە شێوازێکی ئاشتیانە هاتە پێش

---

[1] بێژەری چی؟ جەنەراڵ خیریسۆفۆس پاش جەنەراڵ کلێرخۆس بوو بە سەرلەشکر.

کەچی هەرهەندە نزیك بوونەوە پیادە و سوارەکان تیریان هاویشت وێرای بەردی قۆچەقانی. هەندێك زیان بە یۆنانیەکان کەوت و بەتایبەتی پاسەوانەکانی پاشەر زیانێکی گەورەتریان پێ گەیشت، بەڵام نەیاندەتوانی تۆڵە بکەنەوە چونکە تیری تیرەنداز کریتیەکان هەندی تیری فارسەکان نەدەرۆیشت. هەروەها چونکە لە پیادە سووکەکان بوون، ئەوانە لەناوەندی چوارگۆشەکەدا پەنایان گرتبوو. سەبارەت بە رمب هاوێژەکانیش، ئەوانە رمبەکانیان نەدەگەیشتە بەردهاوێژە فارسەکان.

زینۆفۆن بیری کردەوە کە دەبێ بکشێنەوە بۆ دوا، ئەمەش بەو هۆپلیت و پەلتاستانە ئەنجام درا کە لەگەڵی بوون، واش هەر لە راوەکەدا نەیانتوانی یەك کەس لە دوژمن بگرن چونکە یۆنانی هێزی سوارەیان نەبوو، پیادەکانیش توانایان نەبوو بە پیادەکانی دوژمن رابگەنەوە، ئەوان پێش ماوەیەکی گونجاو هەڵدەهاتن و نەشدەکرا بەدوایان بکەون و لە لەشکر دابېڕێن. سوارەکانی دوژمن لە کاتی هەڵاتنیشدا پشتاوپشت تیریان دەهاویشت و هەندێکیان بریندار کردن[1]. هەروەها کە پیادە یۆنانیەکان راویان دەنان، دەبایە دواتر رێ و رێ بگەڕێنەوە و ئەنجام ئەوە بوو کە بەدرێژایی رۆژەکە تەنیا دوو فەرسەخ و نیویان بڕی. بەڵام هەر نەبێ پاش نیوڕۆکە گەیشتنە گوندێك.

لێرەشدا دیسان بێزاری بڵاو بۆوە. خیریسۆفۆس و جەنەراڵە پیرەکان گلەییان لە زینۆفۆن کرد کەوا دوژمنی راو نابوو دوور لە لەشکرەکە و نەشیتوانیبوو هیچ زیانێکیان پێ بگەیێنێت. زینۆفۆن گوێی لە رەخنەکان راگرت و دانی نا کە رەخنەکان بەجێن و دایە دەستیان کە قسەکانیان بکەن واش هەر ئەم قسانەی کرد:

کە دیتم زیان بە ئێمە دەگەیێنن ناچار بووم وابکەم کە بکشێنەوە و دەستمان پێکرد دووریان بخەینەوە. قسەکەتان راستە، نەمانتوانی زیانیان پێ بگەیێنین و زۆر بە سەختی توانیمان بگەڕێنەوە. دەبێ سپاسی خواوەندەکان بکەین کە ژمارەیان کەم بوو دەنا زەبرێکی گەورەتریان دەوەشاند. ئەوانە پێشانیان داین کەموکوڕییەکانمان لە کوێن. ئێستا، مەودای تیرەندازی دوژمن لە مەودای

---

[1] شایانی گوتنە کە هێزەکانی مەغۆلیش دوژمنیان بۆ مەیدانێك رادەکێشا و پشتاوپشت تیربارانیان دەکردن تا تەنك دەبوون ئەوجار بۆیان دەگەڕانەوە و قەلاچۆیان دەکردن.

تیرەندازە کریتییەکانە ئێمە درێژترە، بەردهاوێژەکانیش هەمان شتن بەرانبەر رمبهاوێژەکانی مە، هەروەها کە پاشەکشەیان پێ دەکەین ناکرێ زۆر بەدوایان بکەوین دوور لە لەشکر، کە نزیکیش دەبینەوە ناتوانین بە پیادە سوورکەکانی دوژمن رابگەین، ئەمە لەکاتێکدا کە ئەوان پشتاوپشت تیر دەهاوێن.

بۆیە دەبێ بەزووترین کات سوارە و قۆچەقانی دابین بکەین، بیستومە هەندێك رۆدی (خەڵکی رۆدس) هەن ئەوانە دەزانن چۆن قۆچەقانی بەکار بێنن، تەنانەت بەردیان دووهەندی فارس دەڕوات. بەردهاوێژەکانی فارس دوور ناهاوێن چونکە بەردیان هەندی مستێك گەورەن و بەکەڵکی هاویشتن نایەن، بەڵام رۆدییەکان گوللەی مس بەکار دێنن.

کەواتە ئەگەر بزانین کێ لەم لەشکرەدا قۆچەقانیی هەیە و پارەش بدەینە کەسانێکی کە ئامادەبن گوللە کۆ بکەنەوە ئەوسا خەڵکێك بۆ ئەم ئەرکانە دێنە پێش. هەروەها هەندێك ولاغمان هەیە، هەندێکیان هی خۆمن و هەندێکیان هی کلێرخۆس بوون وا ئێستا بۆ بار بەکار دێن، جا ئەگەر باری هەندێکیان بخەینە سەر ئەوانی دیکە رەنگە ئەوسا گرفتێك بۆ دوژمن دروست بکەین.

## چاپتەر -٤-
# تیزافەرنە راویان دەنێت

بۆچونەکە پەسند کرا و ئەو شەوە نزیکەی ۲۰۰ بەردهاوێژ هاتنەپێش، شەوی دواتر ٥٠ سوارە ساز کران. یەلەگی چەرم و زرێی سینگیان وەرگرت. لینیسیۆس کوڕی پۆلیسترانۆس، ئەتینی بوو، رابەرایەتی سوارەکانی دەکرد.

رۆژێك لەوێ مانەوە و رۆژی دووەم زووتر هەستان چونکە ئاوێك لەوێ هەبوو دەبایە لێی بپەڕنەوە. دەترسان کە لەکاتی پەڕینەوەدا پەلامار بدرێن. لەشکر بە پەڕینەوە راگەیشتن پێش ئەوەی کە میتراداتیس پەیدا ببێتەوە، ئەمجارە ۱۰۰۰ سوار و ٤٠٠ تیرەنداز و بەردهاوێژی لەگەڵ بوو. ئەو هێزەی لە تیزافەرنە وەرگرتبوو، باوەڕیشی بەخۆی پەیداکردبوو بەهۆی هێرشەکانی پێشوو کە توانیبوی بە هێزێکی بچووکەوە زەبری کاریگەر لە یۆنانییەکان بدات.

یۆنانیەکان فەرسەخێك لە ئاوەکە دوور کەوتبوونەوە کە میتراداتیس و هێزەکەی پەڕینەوە. یەکسەر فەرمان بە هۆپلیت و پەلتاستەکان درا کە دەبێ دوژمن دوور بخەنەوە و بە سوارەکانیش گوترا کە دەبێ پشتیوانی لەم هێزە بکەن. کە میتراداتیس و تیرەندازەکان نزیك بوونەوە، شەیپوور ژەنرا و بە یەك تەن (یەك پارچەیی) هێرشیان کرد. دوژمن نەوەستا تا نزیك دەبنەوە و یەکسەر کشانەوە بۆ لای ئاوەکە. لەم هێرشەدا ژمارەیەکی زۆر لە دوژمن کوژرا و ۱۸ سوار بە زیندویی گیران. سەربازە یۆنانیەکان لەخۆڕا تەرمی کوژراوەکانیان پارچە کرد تاکو چاوترسیان بکەن.

پاش ئەم بەزینە دوژمن کۆڵیان دا و یۆنانی بە ئارامی رۆیشتن تا گەیشتنە رووباری دیجلە. شارێکی گەورە، بەڵام چۆڵ کراو، لەوێ هەبوو بەناوی لاریسا کە لەسەردەمی کۆندا میدی تێیدا دەژیان. دیواری هەبوو ۲٥ پێ بەرین و ۱۰۰ پێ بەرز بەدرێژایی بازنەیەکی شەش فەرسەخ. بناخەکە بەرد بوو، بەشی سەرێش کەرپوچ بوو. ئەو کاتەی کە فارس دەستیان بەسەر ئیمپراتۆرییەتی میدیدا گرتبوو، شای فارس گەمارۆی دابوو بەڵام نەیتوانیبوو بیگرێت. هەورێك

بەسەر شارەکەدا هات بزری کرد، خەڵکەکەش چۆڵیان کرد ئینجا شارەکە گیرا. هەرەمێکی بەردین هەبوو لە نزیك شارەکە، ١٠٠ پێ پان و ٢٠٠ پێ بەرز بوو، خەڵکێکی زۆر لەم شارە و گوندەکانی نزیك خۆیان لەوێ شاردبۆوە.

لێرەوە بە یەك رۆژ ١٨ فەرسەخیان بڕی بۆ شارێك بەناوی میسکیلا Mescila کە لەسەردەمێکدا میدیی تێدا دەژیا[1]. بناخەی شارەکە لە جۆرە بەردێکی گەش دروست کرابوو وردە قەپێلکی قەوغە (قوقع) ی تێدابوو. ٥٥ پێ بەرین و ٥٠ پێ بەرز، لەسەرێش دیوارێکی کەرپوورچ دروست کرابوو بە پانایی ٥٠ پێ و بەرزایی ١٠٠ پێ و درێژی هەشەت میل. گوایە کە ئیمپراتۆریەتەکەیان لەدەست چووە، ژنی شاهەکەیان پەنای بۆ ئێرە بردووە و کە شای فارس گەمارۆی داوە، نەبە هێرش و نەبە چاوەڕێکردنێکی درێژ پێی نەگیراوە، بەڵام زیۆس بروسکێکی لەشارەکە داوە، خەڵکە هۆشیان نەماوە و لە شار دەرپەڕیون. شارەکە بەم جۆرە گیراوە[2].

پاش ئەوە بە یەك رۆژ ١٢ فەرسەخ بڕا و لە رێگادا تیزافەرنە بەدەرکەوت. سەرباری هێزی خۆی هێزەکەی ئۆرۆنتایش، زاوای شا، و هێزەکەی کە لەگەڵ کۆڕووش هاتبوون و هێزەکەی

---

[1] دوور نیە شاری مووسڵ بێت. شایانی گوتنە کە ئێستاش گۆران و شەبەك لەدەوری مووسڵ دەژین. باوەڕم وایە کە لەهجەکانی ماچۆ (وەکو هەورامی و شەبەك و زازا) ئەوانە پاشماوەی میدیەکانن، دەنا زمانە کرمانجیەکان (کرمانجی سەروو و خواروو) پاشماوەی میدیا نین بەڵکو پاشماوەی عەشایەری ساکاییەکایین (ساکا، سکیت، اسکیت، هتد) ناویان لە مێژوودا بە چەندین جۆر هاتووە. عەشایەری ساکا لەگەڵ سەکسۆنیەکان (ئەڵمان و ئینگلیز) خزمایەتیان هەیە و لە میدی و فارسەکان جودان، بەڵام ئەوەیە کە تێکەڵاویەکی زمانەوانیی توندمان لەگەڵ پاشماوەکانی فارس و میدیا پەیدا کرد بە تایبەتی پاش رووخانی ئیمپراتۆریەتی ساسانی چونکە بەو رووخانە رێگا بۆ سێ قۆڵ لافاوی عەشایەری خۆش کرا بەسەر بانی ئێران و زاگرۆس و عیراقدا بگەرێن.

- یەکەم، عەشایەری عەرەب لە بیابانی شامەوە بەرەو عیراق.
- دووەم، عەشایەری کرمانج (کورد-ماد) لە قەفقاسەوە بەرەو ئازەربایجان و زاگرۆس.
- سێیەم، عەشایەرەکانی ئاسیا (تورك و مەغۆل) کە لە ئەنجامدا هەموو خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیان خستە ژێر رکێفی خۆیان.

[2] ئەمە تەفسیرێکی ئەفسانەییە لە خەڵکی ناوچەکەی بیستووە.

براکەی شا وێڕای هەموو هێزەکانی کە شا ناردبوونی هەموو هاتبوون، بەوەش لەشکرەکەی تیزافەرنە دیمەنێکی یەکجار گەورەی هەبوو. کە هات، هێزێکی نارد بۆ لای ریزەکانی پشتەوەی یۆنانیەکان و ئەوانی دیکە بەدەوری باڵەکاندا سوڕاندەوە، بەلام نەوێرا هێرشێکی راستەوخۆ بکات. لەباتی ئەوە فەرمانی دا پیاوەکان تیر و بەرد بهاون. رۆدییەکان لەنێو ریز یۆنانییەکاندا بلاو کرابوونەوە، قۆچەقانییان بەکار هێنا و تیرەندازەکانیش تیریان هاویشت و کەسیان تیرێکی بە فیڕۆ نەدا (لەراستیدا هەنگەوتنیان زۆر ئاسان بوو). ئیسافەرنیس و لەشکرەکەی کشانەوە.

لە پاشماوەی ئەو رۆژەدا یۆنایەکان دەرۆیشتن و فارس بەدوایانەوە بوون. لەوساوە شەڕی دووربەدووریان پێڕەو نەکردەوە چونکە مەودای بەردی رۆدییەکان لەمەودای وان درێژتر بوو. فارس کەوانی گەورەیان هەبوو، جا تیرەکان هەڵدەگیرانەوە و بەکەڵکی تیرەندازە رۆدییەکان دەهاتن کەوا دەستیان زۆر بەرز دەکردەوە و تیریان بەرەو هەرە دوور دەهاویشت. هەروەها لە گوندێکدا هەندێك ژێی کەوان و هەندێك مس دۆزرایەوە کە بەکەڵك دەهاتن.

یۆنانیەکان گەیشتنە گوندێك و ناوچەییەکان کشانەوە پاش ئەوەی کە لەم رۆژەدا تووشی بەدترین شەڕی دووربەدووری ببوون. یۆنانی رۆژی دوەمیان لەو گوندە بەسەر برد، خۆراك زۆر بوو. رۆژی دواتر بەنێو دەشتەکەدا کەوتنە رێپێوان و تیزافەرنە بەدوایانەوە بوو دوور بەدووری پەلاماری دەدان. لەم شوێنەدا یۆنانی گەیشتنە باوەڕێك کە ئەم سیستەمە چوارگۆشەییە کەڵکی نەماوە، فارس لە پشتەوە پەلاماریان دەدان و کە دەگەیشتنە تەنگەبەرێك یان کە لە پردێك دەپەڕینەوە یان کە بە دۆڵێکی تەسکدا دەرۆیشتن باڵەکانی چەپ و راست ناچار دەبوون وێك بێنەوە و دەبوو بە قەرەباڵغایی و پشێوی و هۆپلیتەکان بێکەڵك دەبوون. ئینجا کە باڵەکان لێك دەکشانەوە دەبایە خێرا بلاو ببنەوە و ناوەندەکش پڕ نەدەکرایەوە، لەو حاڵەتشدا کەوا دوژمن لەدوایان دان تووشی بارگرانییەکی زۆر دەهاتن. جا لە هەر جارێکدا رێگاکە تەسك دەبۆوە پیاوەکان بە ڕاکەڕاکە دەپەڕینەوە. ئەمە دەرفەتێکی باشی دەرەخساند بۆ دوژمن کە هێرش بکات.

جەنەراڵەکان هەستیان بەم راستییە کرد، هەستان شەش تیپیان پێك هینا هەر یەك لە ١٠٠ کەس، ئەمەش بەش دەکران بۆ تاقمی ٥٠یی ئینجا ٢٥ی. کاپتنیان بۆ تیپەکان دانا، هەرکاتێك

باڵەکان وێك هاتبانەوە ئەم تیپانە لەملا ئەولا رادەوستان تا قەرەباڵغایی دروست نەبێت. ئینجا کە باڵەکان لێك دەکشانەوە، تیپەکان بە ڕیزی ٦ی و ١٢ی و ئەگەر لە پێشەوە بان بە ڕیزی ٢٥ی ناوەندەکەیان پڕ دەکردەوە. بەمە ناوەندی چوارگۆشەکە هەمیشە بە پڕی دەمایەوە و لەهەر شوێنێکدا تووشی پرد و تەنگەبەر هاتبان کاپتنەکان شێوازی خۆیان تێك نەدەدا و هەمیشە ئامادە و دەستبەکار دەبوون.

بەم شێوازە چوار ڕۆژ بەڕێوە بوون. لە ڕۆژی پێنجەمدا شتێکیان دیت وەك تەلارێك بوو، چەند گوندێکیش لەدەوریدا بلاو ببوونەوە. ڕێگا بە زەوییەکی بەرزدا دەرۆیشت بە کەنار گردەکانی بناری چیاکە، ئەوەی کە گوندەکەی لێ بوو. بەلام کە لە گردی یەکەم ئاوابوون و ویستیان بەسەر گردی دووەم هەلگەڕێن دوژمن هێرشی کرد، لەسەر بەرزاییەکانەوە بە تیر و بەرد دایانگرتن و ژمارەکیان بریندار کرد. پەلتاست لەنێو هۆپلیتەکان چەقیبوون، بەردهاوێژ و تیرەندارەکان لەنێو چوارگۆشەکەدا بلاو ببوونەوە و کەلکیان نەمابوو. کە هۆپلیت ویستیان هێرش بکەن، پێیان نەکرا بەسەر هەورازەکە بکەون و پەلتاستەکانی دوژمن زوو کشانەوە. ئینجا کە گەڕانەوە نێو لەشکر ئەوسا وەکو جاری یەکەم زیانیان پێ گەیشت. لە گردی دووەمیشدا هەمان شت ڕووی دا، بۆیە بڕیار درا نەهێلن بەسەر گردی سێیەم هەلگەڕێن. پێشێ هێزێکی پەلتاستیان ناردە سەر بەرزاییەکەی بالی ڕاست. پەلتاستەکان جێگەیەکی بەرزیان داگیر کرد بەسەر دوژمندا دەیڕوانی. دوژمن وازیان هێنا، ترسیان هاتێ کە گەمارۆ بدرێن. ئەو ڕۆژەیان ئەوها بەسەر برد، لەشکرەکە بەسەر گردەکاندا دەرۆیشت و هێزێکیش بە بناری چیاکەدا دەچوو تا گەیشتنە گوندێك، لەوێ هەشت دکتۆریان لەسەر بریندارەکان دانا.

سێ ڕۆژ لەوێ مانەوە هەم لەبەر بریندارەکان و هەم بەهۆی کەوا خۆراکێکی زۆر لەوێ دەست دەکەوت، ئاردی گەنم و شەراب و کولجی و ئالیك. ئەم تفاقە بۆ شارەوانی ناوچەکە دالرابوو.

لە ڕۆژی چوارەمدا بۆ نێو دەشتەکە شۆڕ بوونەوە و تیزافەرنە پێیان ڕاگەیشت. دەرسیان وەرگرتبوو کەوا یەکسەر خۆ لە نزیکترین گوند قایم بکەن نەوەکو جاران کە لەلایەکەوە ڕێگا ببڕن و لەلایەکی دیکەوە بەرگری لەخۆ بکەن، ئەوش چونکە بریندارانیان زۆر بوو. ئەوانەی کە

بریندار ببوون و ئەوانەی کە هەڵیان دەگرتن و ئەوانەی چەکی بریندار و پاوەری بریندارەکانیان هەڵدەگرت، هەموو کەلکی شەڕیان نەمابوو. واش هەر کە گەیشتنە گوندەکە و دوژمن هێرشی کرد، یۆنانیەکان لەشەڕی دووربەدووردا زۆر باشتریان پێ کرا. جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان ئەوەی یەکێك لە ماڵی خۆی را هێرش بەرێت لە چاو ئەوەی کە بەرێگادا بڕوات و دوژمن بەدوایەوە بێت.

ئێستا کە یۆنانی زانیان وا دوژمن خەریکن بۆ مانەوەی شەو خۆیان داکەن، یۆنانیەکان بە دەنگی بەرز فەرمانیان بلاو کردەوە کە هەموو بەخۆکەون. دوژمن دیسان راسانەوە و تا درەنگ لە حاڵەتی ئامادەباشی مانەوە. ئەوسا ماندوو بوون و گەڕانەوە بۆ ئۆردوگاکەیان.

یۆنانی گومانیان نەما کەوا دوژمن بۆ حەسانەوە داکەوتون، بارگەیان تێك نا و بەرێ کەوتن، شەش فەرسەخیان بڕی. ئەم رێپێوانە وای کرد کە دوژمن تا سێ رۆژ سۆراغی نەبێت، لە رۆژی چوارەمدا دوژمن پێشیان بە یۆنانیەکان گرت و لەسەر جێگەیەکی بەرز دامەزران. شوێنەکەیان جیایەکی بەرز بوو بەسەر ناوچەکەدا دەیڕوانی. خیریسۆفۆس کە دیتی وا بەرزاییەکە داگیر کراوە بەدوا زینۆفۆنی دا نارد کە پەلتاستەکان بێنێتە لای پێشەر. زینۆفۆن کە هێزەکانی تیزافەرنەی دیت وا خیریسۆفۆس لەبەرانبەریان وەستاوە برسی : بۆچی بانگم دەکەیت؟ خیریسۆفۆس وەلامی دایەوە کە بەباشی نەزانیوە پشتی لەشکرەکە چۆڵ بکات. بەلام بەراستی کاتی ئەوە هاتووە گردەکەیان پێ چۆڵ بکەن.

لەم کاتەدا زینۆفۆن دیتی کەوا لوتکەی چیاکە لەو پانتایە بەرزتر بوو کە دوژمنی لەسەر وەستابوو، گوتی: خیریسۆفۆس، باشترین شت ئەوەیە بەخێرایی بگەینە سەر لوتکەکە، ئەوسا ئەوان یەکسەر جێگەیان چۆڵ دەکەن. ئەگەر حەز دەکەی تۆ لەگەڵ لەشکرەکە بمێنە، من بە خۆبەخش دەچم. یان ئەگەر حەز دەکەی تۆ بڕۆ، من لێرە چاوەڕێ دەکەم. خیریسۆفۆس گوتی: بە ئارەزوی خۆت بکە.

زینۆفۆن بڕیاریدا خۆی پێشرەوی بکاتە سەر چیاکە چونکە خۆی گەنجترە، بەلام داوای لە خیریسۆفۆس کرد هەندێك چەکداری پێشەری بداتێ چونکە تا دەچێتە پشتەوە ماوەیەك دەبات. خیریسۆفۆس پەلتاستەکانی دایێ و پەلتاستەکانی ناوەڕاستی لەشکرەکەی هێنا بۆ شوێنی وان.

ئەوجار خێرا کەوتنە رێ بەلام کە دوژمن دیتیان ئەوانیش بەرەو لوتکەکە چوون و بوو بە پێشبڕکێ. هاوار و هەرا لە هەردووك لەشکر بلند بۆوە و هەرکەس تاقمی خۆی هان دەدا کە زووتر بگەنە سەر لوتکەکە. زینۆفۆن لەسەر پشتی ئەسپ بەنێو چەکدارەکاندا رۆیشت هانی دەدان: سەربازان، وابزانن کەوا لەپێناو یۆناندا ئەم شەرە دەکەن، وا بزانن بەرەو ژن و مندالی خۆتان دەچنەوە، ئەگەر هەندێك گورج بن دەتوانن بەبێ تەگەرە بیبڕن.

سۆتەریداس Soteridas، پیاوێك بوو خەلکی سیکیۆن Sicyon گوتی: زینۆفۆن، ئێمە وەکو یەك نین، تۆ سواری و من ئەم قەلغانە قورسەم پێیە. کە زینۆفۆن ئەم قسەی بیست، لە ئەسپەکە دابەزی و سۆتەرادیسی لە ریزەکە دەرهێنا، قەلغانەکەی لێ ستاند و بەغار بۆ پێشەوە چوو، خۆو بەخت زرێی سوارەکانیشی لەبەردا بوو، ئیتر بەو هەموو قورساییەوە سەربازەکانی هان دەدا کە گورج بن و سەربازەکانی دوای خۆیان هان بدەن کە پێی رابگەنەوە، کەچی خۆی دوا دەکەوت واش هەر سەربازەکان لە سۆتەریداسیان دا و بەردیان تێگرت و جنێویان پێ دا تا هەستا قەلغانەکەی خۆی وەرگرتەوە کەوتەوە رێ.

زینۆفۆن سوار بۆوە و بەپێشیان کەوت تا گەیشتنە شوێنێك کە هیچیتر ئەسپ رێگای نەبوو بڕوات. لەوێ دابەزی و غاری دا، ئیتر پێش دوژمن گەیشتە سەر لوتکەکە.

## چاپتەر -٥-
# لەنێوان دیجلە و چیاکاندا

دوژمن گەڕانەوە و هەرکەس بەلایەکدا هەڵات یۆنانیەکانیش لوتکەکەیان داگیر کرد. لەشکرەکانی تیسافەنیس و ئاریا ڕێگایان چۆڵ کرد و بە لایەکی دیکەدا ڕۆیشتن. پیاوەکانی خیریسۆفۆس هاتنە خوارێ بۆ نێو دەشتاییەکە و چونە گوندێك پڕبوو لە شتی باش. ئەو ناوە لە دیجلە نزیك بوو و کۆمەڵێك گوندی تر هەبوون هەموو بە هەمان شێوە خۆراکی باشیان لێ بوو.

بەڵام پاش نیوەڕۆ دوژمن لەناکاو پەیدابوو، هەندێك لە یۆنانیەکانی دابڕی ئەوانەی بڵاو ببوونەوە و خەریکی تالانکاری بوون، دەستیان بەسەر هەندێك گاڕاندا گرتبوو لەوبەری ڕووبارەکە. تیزافەرنە و پیاوەکانی ویستیان گوندەکان بسوتێنن بەوەش هەندێك لە یۆنانییەکان سەغلەت بوون چونکە پەرۆشیان بوو کە ئەگەر گوندەکان بسوتێن لەوسا خۆراکیان دەست ناکەوێت.

خیریسۆفۆس و پیاوەکانی تازە لە دەشتەکە گەڕابوونەوە بۆ رزگارکردنی پیاوە دابڕاوەکان، زینۆفۆن لە گردەکە هاتە خوار و تووشی ئەم تاقمە بوو و گوتی: یۆنانیەکان، ئایا دەبینن، ئەوانە دان بەوە دەنێن کە ئەمە خاکی خۆیان نیە بەڵکو هی خۆمانە. کاتی کە گفتوگۆیان دەکرد زۆر مەراقیان بوو گوندەکانی شا نەسوتێن، کەچی ئێستا وا خۆیان ئەو گوندانە دەسوتێنن وەك بڵێی هی خۆیان نین. جا ئەگەر لەوان خۆراکیان لەشوێنێك دانابێت ئەوسا ئێمەش دەچینە ئەو شوێنە. بەڕاستیمە خیریسۆفۆس، با ئەو ملکانە بە هی خۆمان دابنێین و نەهێڵین بسووتێن.[1]

---

[1] ئەم تێبینیەی زینۆفۆن زۆر گرینگە و دیاری دەخات کە میدیەکان لە باکووری مووسڵ نەژیاون و بە وڵاتی خۆیان نەزانیوە. ئێستاش ئەم جیاوازیە ماوە لەنێوان ناوچەکانی زابی گەورە و دەوروبەری مووسڵ کە شەبەك و گۆرانی لێیە، کەچی لە باکووری مووسڵەوە بەرەو سەر ئێزدی و کرمانج (کرمانجی باکوور) بڵاوبوونەتەوە.

خیریسۆفۆس گوتی: زینۆفۆن، باوەڕ ناکەم، بەڵام دەزانی چی؟ با لە سووتاندا یارمەتیان بدەین. ڕەنگە ئەوسا زووتریش بوەستن.

کە گەڕانەوە جێی خۆیان جەنەراڵ و کاپتنەکان کونگرەیەکیان بەست، ئەوانی دیکە خەریکی شمەك و خۆراك بوون. ئێستا کەوتبوونە بارێکی زۆر تەنگ، لە لایەکیان چیای زۆر بەرز هەبوو، لایەکی دیکەشدا ڕووبارێکی قووڵ کە خۆیان لە ڕووبارە دەدا ڕمیش نەدەگەیشتە بنەکەی ئیتر جەنەراڵەکان نەیاندەزانی چ بکەن. پیاوێکی ڕۆدیسی هاتە پێش و گوتی: ئەگەر شتم بۆ دابین بکەن دەتوانم وا بکەم هەر جارە بە تاقمی ٤٠٠٠ کەسی بپەڕنەوە. بەڵام دەبێ یەك تالەنت بەمن ببەخشن.

کە لێیان پرسی چیی پێویستە؟ گوتی: پێویستم بە ٢٠٠٠ کەوڵە بەرخ و بزن و گا دەبێت، ئەگەر فوو بدرێن و تێك ببەسترێنەوە ئەوسا بەئاسانی دەپەڕینەوە. هەروەها پێویستم بە گوریس و تەنگەی بارەکان دەبێت ئەوانەی کە لە سندووق و باولەکان بەستراون. باولەکان تێك دەبەستم و بە بەرد قورسیان دەکەم تا ئاو نەیانبات، ڕایاندەکێشم و لەمبەر ئەوبەری ڕووبارەکە قایم دەکرێن، ئینجا دار و چیلکەیان لەسەر دادەنێنم و بەخۆڵ سەریان دادەپۆشم. لاتان مسۆگەر بێت کە هیچ مەترسییەکی نیە.

جەنەراڵەکان گوێیان گرت، بەڵام بیریان کردەوە کە پلانەکە جێ بەجێ ناکرێت چونکە سوارەکانی دوژمن لەوبەر ژمارەیان زۆرە و ناهێڵن ئیشەکە ئەنجام بدرێت.

ڕۆژی دواتر گەڕانەوە سەر ڕێگا کۆنەکەی دوێنێ کە گوندێکی نەسووتاوی لێ بوو. گوندەکانی دیکە سووتابوون، دوژمنیش لەدوورەوە هاتووچۆیان دەکرد لەو شوێنانەی کە باوەڕیان وابوو ڕەنگە یۆنانیی پێیدا بڕۆن. جەنراڵەکان کۆبوونەوەیەکی تریان بەست، ئەسیرەکانیان هێنا کە هەندێك زانیاری دەربارەی ئەو وڵاتەی دەوروبەریان وەربگرن. وەڵامەکان ئەمە بوون کە وڵاتی باشوور ڕێگای بابل و میدیایە کە هەر ئەم ڕێگا بوو پێدا هاتبوون. ڕێگای خۆرهەڵات دەگەیێنێتە سوسە و ئەکبەتانە کە دەڵێن هاوینە هەواری شاهن. ئەگەر کەسێك ڕووبارەکە ببڕێت بەرەو خۆرئاوا، ڕێ بەرەو لیدیا و ئایۆنیا دەڕوات. ڕێگای باکووریش بەودیوی چیاکاندا دەچێتە نێو کاردوخییەکان. گوتیان ئەو خەڵکە لە چیاکاندا دەژین و زۆر

..ەرانگێزن و سەر بە شا نین. لەراستیدا جارێکیان لەشکرێکی ١٢٠,٠٠٠ پیاوی شا چوونە نێو ولاتەکەیان و یەك کەس لێی دەر نەچوو[1] بەهۆی سروشتی یەکجار سەختی ئەو خاکە، واش هەر لە دەرفەتی دیکەدا لەگەڵ شارەوانی ناوچەکە، ئەوەی دەشتەکە کۆنترۆڵ دەکات، گەیشتنە رێککەوتنێك. لەوساوە پێوەندییەکی دووسەرە لەنێوان کاردۆخی و ئەواندا هەیە.

جەنەراڵەکان گوێیان لەم راپۆرتانە گرت و ئەوانەی شارەزاییان هەبوو هەریەك لەو بەخسیرانەیان بۆ لایەك جودا کردەوە و پێشانیان نەدەدان نیازی کام رێگایان هەیە. هەرچۆنێك بێت بیریان کردەوە کە دەبێ ولاتی کاردۆخی لەودیوی چیاکان داگیر بکەن چونکە، بگوێرەی لەسیرەکان، ئەگەر لەو خەڵکە تێپەڕ بن ئەوسا دەگەنە ئەرمینیا کە ولاتێکی گەورە و دەوڵەمەندە و لەژێر حوکمی ئۆرۆنتاە. یەخسیرەکە گوتی لەوێڕا دەتوزانن بە ئاسانی بۆ هەر لایەك بڕۆن.

خێر و قوربانییان کرد بۆ پیرۆزکردنی پرۆژەکەیان تا یەکسەر دەست بە رێپیوان بکەن. دەترسان کە رێگای چیاکەیان لێ گیرابێت جا فەرمانیان دەرکرد کە پاش نانی ئێوارە هەموو شمەکیان خڕ بکەنەوە و ئامادەبن.

---

[1] دیسان دەبینین کە ژمارەکە جێی باوەڕ نیە.

## چاپتەر -١-
# بەرەو کوردستان

لەگەڵ دوا نۆرەی خەفەر کە ئاسمان هێشتا تاریك و رۆن بوو بای ئەوەی کە دەشتەکە بەتاریکی ببڕن، هەستانەوە و ئاماژەیان دا کە بەرەو چیاکە بڕۆن و، بەری بەیانی پێی گەیشتن. خیریسیۆفۆس لەگەڵ هێزی خۆی و تێکڕای هێزە سووکەکان پێشڕەوی دەکرد. لە کاتی پێهەڵگەڕاندا وا دیار بوو هیچ مەترسی لە ئارادا نەبێت کە لەدواوە پەلامار بدرێن.

پێش ئەوەی دوژمن هەست بە هیچ شتێك بکات خیریسیۆفۆس گەیشتە سەر لوتکەکە و راستە و راست رۆیشت. کە لەشکرەکە رێگاکەیان بڕی، بەدوای کەوتن بۆ نێو کۆمەڵە گوندێك کە لە دۆڵەکانی بنارەکە بڵاو ببوونەوە. کاردۆخییەکان یەکسەرماڵەکانیان چۆڵ کرد و یەکسەر بە ژن و منداڵەوە هەڵاتن بۆ چیاکان. خۆراکێکی زۆر مابۆوە بۆ یۆنانیەکان، هەروەها شمەك و مۆبیلیای نێو ماڵەکان زۆر جوان بوون. یۆنانیەکان هیچ شتێکیان دەستکاری نەکرد و بەدوایان نەکەوتن، ویستیان بە نەرمی رەفتاریان لەگەڵدا بکەن چونکە کاردۆخی دوژمنی شا بوون، ئومێدیان کرد کە رەنگە حەز بکەن بەشێوەیەکی ئاشتیانە لە وڵاتەکەیان رەت بن، بەڵام خۆراك شتێکی پێویست بوو و هەرچی دەستیان گەیشتیّ لە خۆراك هەموویان برد. کاردۆخییەکانیان بانگ کرد، ئەوان گوێیان نەدا و هیچ ئاماژەیەکی دۆستانەیان دیار نەخست[1].

---

[1] بەشێکی زۆر لە گەنجەکانمان بەدبەختی کورد دەخەنە ئەستۆی شێخ محمودی حەفید گوایە تۆقەی لەگەڵ ئەفسەرێکی ئینگلیز نەکردووە و دەڵێن بۆیە (دەوڵەتمان نەبووە)! بەڵام با بزانین باپیرەکانمان ٢٤٠٠ساڵ پێش شێخ محمود چ عەقڵیەتێکی سیاسیان هەبووە؟ ئەوان خۆیان لە هەموو جیهان دابڕیبوو. ئەو کاردۆخیانە دژایەتی میدیەکانیان کردووە، دژایەتی فارس و شایان کردووە، دژایەتی یۆنانیەکانیشیان کردووە، تەنانەت دواتر دەبینن کە دژایەتی ئەرمەنەکانیشیان کردووە و هەمیشە پەلاماریان داون. کەواتە پێش ئەوەی گلەیی بکەین گوایە (هەر شاخ برادەرمانە) لە راستیدا ئێمە بەدەستی خۆمان تەنیا برادەرایەتی شاخمان کردووە بێ لەهیچ شتێك.

تاریك داهاتبوو ئەوکاتەی کە دوا سەربازی یۆنانی گەیشتە گوندەکە چونکە ڕێگاکان تەسك بوون، ئیتر هەڵگەڕان و داگەڕانەکە هەموو ڕۆژەکەی برد. لەو کاتەدا هەندێك کاردۆخی کۆبوونەوە و تەنێکیان پێك هێنا و هێرشیان کردە سەر دواترین سەربازە یۆنانییەکانیان. بەتیر و بەرد هەندێکیان کوشت و هەندێکی تریان بریندار کرد، بەڵام کە لەناکاو یۆنانیەکان گەیشتنە سەریان، ژمارەیان هەندە زۆر نەبوو. لە ڕاستیدا ئەگەر لەم ڕوداوەدا بە ژمارەیەکی گەورەتروە هاتبان ڕەنگبوو بەشێکی گەورەی یۆنایەکان ڕامالّن.

ئەو شەوە وەکو خۆیان لە گوندەکە مانەوە، کاردۆخییەکانیش لە چیاکانی دەوریاندا کۆمەڵێك ئاگریان هەڵکرد وەکو جۆرێك ئاگاداری بۆ یەکتر. بەیانی جەنراڵ و کاپتن کۆبوونەوە و بڕیار درا کە هەرچی شمەکی زیادە و تێکڕای ئەسیر و یەخسیرەکان بەجێ بهێڵن و لەنێو بارگینەکان تەنیا هەرە باشەکان بەرن چونکە ئەو هەموو بارگە و یەخسیرانە ڕێپێوانەکەیان قورس دەکرد و دەبایە چاودێر بۆ ئەوانە تەرخان بکرێت، هەروەها دەبایە بارگە و خۆراکیشیان بۆ دابین بکەن. بڕیارەکە بە راگەیێندرا کە دەبێ جێبەجێی بکەن.

کە نانی بەیانی خورا و بەرێ کەوتن، جەنەراڵەکان لەسەر زەقایەکی تەنگەبەرێك وەستان تا شمەکە قەدەغەکراوەکان لە سەربازەکان بستێننەوە. هەندێکیان شتی خۆیان بەجێ نەدەهێشت، سەربازەکان بەقسەیان دەکردن بەڵام هەندێك حاڵەت هەبوو کە سەربازەکان شتیان دەدەزییەوە، ئەم حاڵەتانەش ئەوە بوون وەکو ئەگەر یەکیان عاشقی کوڕێکی جوان یاخۆ عاشقی ئافرەتێك بایە (دەیانویست یادگاریەك لەگەڵ خۆ بەرنەوە). بەدرێژای ئەو ڕۆژە ڕێگایان دەکوتایەوە و تووشی شەڕ دەبوون، جار بەجاریش دەحەسانەوە.

ڕۆژی دواتر ڕەشەبایەکی توند هات بەڵام نەدەبایە بوەستن چونکە خۆراکیان کەم بوو. خیریسیۆفۆس لەسەر پێشەر بوو و زینۆفۆن لەگەڵ پاسەوانانی پاشەری لەشکر بوو، دوژمن پەلاماری توندی دەدان و لە هەندێك تەنگەبەردا بە قۆچەقانی و کەوانەکانیان زۆر نزیك دەبوونەوە و دەرەنجامدا کاروانەکە بە هێواشی بەرێوە چوو چونکە دەبایە هەموو جارێك دوژمن ڕاو بنێن ئینجا دیسان بگەڕێنەوە سەر ڕێ. زینۆفۆن ناچار دەبوو لەکاتی پەلامارە توندوتیژەکاندا زۆربەی جار بوەستێت و هەندێك جار کە خەبەر بۆ پێشەری لەشکرەکە ڕەوان دەکرا

سیرسۆفۆس رادەوەستا، بەلام لەیەك روداودا خیریسۆفۆس لەباتی ئەوەی بوەستێت خێراتر رووت و خەبەری رەوان کردەوە کە بەدوای بکەون. دیاربوو شتێك لە ئارادایە، بەلام نەدەکرا رانرێت کە ئەم پەلەکردنە لەبەر چی بوو؟ ئەنجام ئەوە بوو کە پاسەوانانی پاشەر لەباتی بتوانن پش بکەون ناچار بوون پاشەکشە بکەن. سەربازێکی مەردی سپارتی بەناوی لیۆنیخۆس کوژرا کەوا تیرێك بەنێو قەڵغان و پەلەگیدا رۆیشت و کەمەری بڕی، هەروەها باسیاسی ئەرکادیش کوژرا، راستەوخۆ بە سەری کەوت. کە گەیشتنە جێگەی مانەوەی ئەم شەوە، زینۆفۆن چوو بۆ لای خیریسۆفۆس و گلەیی لێ کرد کە بەجێی هێشتووە و لە ئەنجامدا سەربازەکانی ناچار بوون فونەشەڕ بکەن و کەوا دوو سەربازی هەرە مەردانەی تاقمەکەی کوژراون، تەرمەیان بەجێ ماوە و هێشتا نەنێژراون.

خیریسۆفۆس وەڵامی دایەوە: تەماشای ئەو چیایانە بکە، هەموو لایەکیان سەختە. تاکە رێگایەکی هەبێت وەکو دەیبینی زۆر لێژە و دەبینی وا پیاو لەسەری وەستاون. قەرەباڵغاییەکی گەورەی لەسەردایە، رێگاکەیان داگیرکردووە و لەوێ راساون. لەبەر ئەوە ئەوها پەلەم کرد و لەسەر تۆ نەوەستام، بیرم کردەوە ئەگەر دەرفەتم هەبێ زووتر بگەمە وێ تا رێگاکە نەگیراوە. ئەو رێناسانەی کە هەمانە دەڵێن هیچ رێگای دیکە نیە.

زینۆفۆن گوتی: دوو پیاوم گرتووە رێگایان لە ئێمە گرتبوو، بۆتەمان دانایەوە تا بتوانین هەناسەیەك هەڵکێشینەوە. هەندێکیشمان کوشت و ئەوەشمان دانابوو کە هەندێکیان لێ بگرین بۆ ئەوەی وڵاتەکە بناسین.

یەکسەر دوو پیاوەکەیان هێنا و بەجودا پرسیارایان لێ کردن تا بزانن ئایا رێگای دیکە هەیە؟ یەکیان ئەگەرچی جۆرەها هەڕەشەی لێ کرا گوتی هیچ نازانێت. کە دیتیان سوودی نیە ئەمەیان لەبەر چاوی پیاوەکەی دیکە کوشت، ئەوەی کە مایەوە گوتی پیاوەکەی پێشو بۆیە ئینکاریی دەکرد چونکە کچێکی هەیە شووی بە یەکێك کردووە خەڵکی ئەو ناوچەیە کە دەتانەوێ پێیدا برۆن. گوتیشی ئامادەیە کە بەرێگایەکدا بیانبات کە وڵاغیشی پێیدا دەڕوات. لێیان پرسی ئایا هیچ بەشێکی رێگاکە سەختایی تێدایە؟ وڵامی دایەوە کەوا یەك هەورازی سەختی هەیە کە ناتوانن پێدا برۆن مەگەر پێشەکی داگیری بکەن.

بڕیار درا کە کاپتنەکان کۆ بکرێنەوە تا فیکرەیەك وەربگرن و پرسیاریان کرد کێ ئامادەیە بە خۆبەخش کاری چاك بکات و بۆ ئەم ئەرکە بێتە پێش؟ کە هۆپلیتەکان هاتنە پێش ئەریستۆنیمۆسی مەتیدیری و ئاگاسیاسی ستێمفالێی و کالیماخۆسی پەرهاسیا هاتن، لەمەیان داوایەکی تایبەتیی کرد کە ئەگەر بڕوات دەیەوێ بەئارەزوی خۆی هەندێك پیاو هەڵبژێرێت، گوتی: ئەگەر خۆم سەرپەرشتیی کارەکە بکەم ئەوسا زۆر کەس ئامادە دەبن بە خۆبەخش ئەم کارە بکەن. ئەوجار پرسیار کرا کە کێ لە تاقمە سووکەکان بۆ ئەم ئەرکە دێتە پێش؟ ئەریستێسی خیۆس هاتە پێش، پیاوێك بوو کە لە زۆر ڕووداوی هەمەجۆردا سوودی گەورەی بۆ لەشکرەکە هەبوو.



## چاپتەر - ٣-
## شەڕ لە چیادا

نیوەڕۆ بە سەربازەکانیان گوت نان بخۆن و ئینجا دەست پێ بکەن، ئەسیرەکەیان قۆڵبەست کرد و خستیانە بەر دەستیان، واش ڕێککەوتن کە ئەگەر هەورازەکان داگیر بکەن شەو لەوێ بمێنن و بەیانی بە شەیپوور ئیشارەت بدەن بۆ ئەوەی کە هێزی سەر هەورازەکە پەلاماری ئەو کاردۆخییانە بدەن کە ڕێگاکەیان داگیر کردووە. ئەوانی دیکەش خێرا ببزوون و فریایان بکەون.

کە پلانەکەیان دانا، چەکدارە خۆبەخشەکان (کە ۲۰۰۰ کەس دەبوون) ئەوانە بەڕێ کەوتن. باران دەباری، زینۆفۆن لەگەڵ پاسەوانەکانی پاشەر بە ڕێگا ئاساییەکەدا چوونە پێش بۆ ئەوەی سەرنجی دوژمن بۆ لەو بەشە ڕاکێشن. گەیشتنە ئاوێك دەبایە لێی بپەڕنەوە، بەلاّم لەوێدا دوژمن تاوێرەبەردی گلۆر کردەوە، بەردەکان هەندی باری عەرەبانەیەك دەبوون و هەندێکیان لەوەش گەورەتر بوون، گلۆر دەبورنەوە و بە ڕەوەزەکان دەکەوتن و دەپرژان، ئیتر تەنانەت ڕێگای ئەوە نەبوو کە نزیکیش بکەونەوە. هەندێك کاپتن خەریکی ڕێگای دیکە بوون تا تاریك داهات، ئەوسا کە هەستیان کرد کشانەوەیان لەلایەن دوژمنەوە نادیترێت، گەڕانەوە دوا بۆ نانی نێوارە. هەندێك لەو پاسەوانانەی پاشەر نانی بەیانیشیان نەخواردبوو. هەرچۆنێك بێت، دوژمن هەر خەریکی گلۆرکردنەوەی تاوێرە بەردەکان بوون و بەدرێژایی شەو دەنگیان دەهات.

لەو میانەدا هێزەکەی کە ڕێناسەکەیان لەگەڵ خۆ بردبوو بە پشت دوژمندا سوڕانەوە و دەوری کامپەکەیان لێ گرتن کە لەوێدا ئاگرێکیان هەڵ کردبوو، هەندێکیان کوشتن و ئەوانی دیکەیان لەسەر گردەکە دەرپەڕاندن. لەوێ مانەوە وایان دەزانی هەورازەکەیان کۆنترۆڵ کردووە بەلاّم مەسەلەکە وا نەبوو. لەسەرووی ئەوانەوە گردێکی بچووك هەبوو، ئەمەیان ڕێگا هەورازەکەی کۆنترۆڵ دەکرد بەلاّم هەرنەبێ لەوێڕا ڕێگایەك هەبوو کە دەیگەیاندنەوە سەر ڕێگا سەرەکییەکە. ئیتر هەلاّتن و ژمارەیەکی کەمیان لێ کوژرا چونکە هەلاّتنەکەیان خێرابوو.

پیاوەکانی خیریسۆفۆس کە گوێیان لە شەیپوورەکە بوو یەکسەر پەلاماری هەورازەکەیان دا و هەندێك جەنەراڵ بە لاڕێ بۆیان چوون و هەر هەندەیان زانی وا بەسەر شاخەکە دەکەون و بە ڕمب یەکتریان رادەکێشا. ئیتر گەیشتنەوە ئەوانەی کە پێشتر شوێنەکەیان داگیر کردبوو.

زینۆفۆن لەگەڵ نیوەی پاسەوانانی پاشەو ڕێگای خۆبەخشەکانیان بەکار هێنا چونکە ئەمەیان بۆ بارگین و وڵاغەکان ئاسانتر بوو، نیوەکەی دیکەی لەدوای وڵاغەکان دانا. لەڕێگادا گەیشتە تەلانێك بەسەر ڕێگاکەدا دەیڕوانی، دوژمن لەسەر تەلانەکە ڕاسابوون، دەبایە لەوێیان دەربپەڕێنن دەنا لە لەشکر دادەبڕان. دەستیان بە هاوار و هەڕەشە کرد و بە چەند ڕیزێکەوە هێرشیان کرد، بەڵام واشیان کرد کە ڕێگایان هەبێ پێدا هەڵێن و بڕۆن. کە سەربازەکان بۆیان چوون دوژمن تیریان هاویشت و بەردیان گلۆر کردەوە، بەڵام شەڕی بەرەوڕوویان نەدەکرد، تەنیا شەڕی دووربەدووری، و کە لێیان نزیك بوونەوە، شوێنەکانیان چۆڵ کرد و هەڵاتن.

یۆنانیەکان کە لەم گردە ئاوابوون، دیتیان وا گردێکی تر لە پێشیان دایە و ئەویش سەری بە دوژمن گیراوە. بڕیاریان دا پەلاماریان بدەن بەڵام زینۆفۆن بیری کردەوە ئەگەر ئەم گردەی ئێستا چۆڵ بکەن ڕەنگە دوژمن بۆیان بسوڕێنەوە و ئەوسا دیسان گردەکە بگرن و پەلاماری وڵاغەکان بدەن (بارگینەکان هێڵێکی درێژیان دروست کردبوو چونکە ڕێگا تەسك بوو) بۆیەش کاپتن سەفیسۆدۆرۆس کوڕی سەفیسۆفۆنی ئەتینی و کاپتن ئەرخاگۆراس، ئاوارەیەکی ئارگۆس بوو، ئەوانەی لە وێ بەجێ هێشت و خۆی لەگەڵ هێزەکەی بەرەو گردەکە پێشڕەوی کرد و بەهەمان پلانی پێشوو داگیری کرد.

هێشتا گردی سێیەم مابوو کە خریکی بن، ئەمەیان لەهەموویان لێژتر بوو. ئەوانەی کە بەیانی زو بەسەریان دادەرابوو و هەڵاتبوون، ئەوانە چوبوونە سەر گردی سێیەم. بەڵام ئەمجارە بەبێ شەڕ چۆڵیان کرد. خەڵکەکە زۆر سەیریان پێ هات و گوتیان داخۆ لەوە ترساون کە دەوریان لێ بگیرێت.

زینۆفۆن سەربازە گەنجەکانی لەگەڵ خۆی برد بۆ سەر گردەکە و بەوانی دیکەی گوت بەکاوەخۆ بێن چونکە بارگینەکان بەهێواشی دەڕۆن. ئەرخاگۆراسی ئارگۆس بەغار هات و خەبەری هێنا کەوا پاسەوانانی پاشەو لەسەر گردەکە دەرکراون و کەوا سەفیسۆدۆرۆس و

لەمفیکراتیس لەگەڵ تێکڕای ئەوانەی کە پێرانەگەیشتن خۆ هەڵدەنە خواری، هەموو کوژراون. پاش ئەو سەرکەوتنە خەڵکە ناوچەییەکان لەسەر تەلانێك لە بەرانبەر گردی سێیەم دەرکەوتن. زینۆفۆن لەرێگای تەرجومانێکەوە قسەی لەگەڵ کردن، پێشنیازی ئاگربەستێکی کرد و داواشی کرد تەرمی کوژراوەکان بدەنەوە. وەڵامیان دایەوە کە بەمەرجێك رازی دەبن ئەگەر یۆنانی خانوەکانیان نەسوتێنن. زینۆفۆن بەمە رازی بوو کەچی کە ئەم گفتوگۆیە دەکرا و لەشکرەکە پێش دەکەوت، تێکڕای ناوچەییەکان چونە سەری. کە لەشکر شۆڕ دەبۆوە بۆلای شوێنی جبەخانەکە ئەوسا بەژمارەیەکی گەورە و بەدەنگ هاوارێکی بەرزەوە هێرشیان کرد، کە گەیشتنە سەر لوتکەی ئەو گردەی کە زینۆفۆنی لەسەردا بوو، دەستیان کرد بە گلۆرکردنەوەی تاوێرە بەرد. یەك لە پیاوەکان لاقی شکا، هەروەها و ئەوی کە قەڵغانەکەی زینۆفۆنی هەڵگرتبوو بەقەڵغانەوە هەڵات، بەڵام یوریلۆخۆسی لوسیا، هۆپلیتێك بوو، هاتە سەری و قەڵغانەکەی لەپێش خۆی و زینۆفۆن راگرت بۆ کشانەوە. ئەوانەی دیکەش گەڕانەوە لای فەرماندەکانیان کەوا بە شێوازی شەڕ ریز ببوون.

پاش ماوەیەك دابڕان، لەشکری یۆنانی ببۆوە یەك پارچە. ئۆردوگایان دانا و هەندێك خانوو و خۆراکیان دەست کەوت، شەڕابێکی زۆریان دۆزیەوە کە ژێرزەمینێك دانرابوون و سەرەکانیان داپۆشرابوو. زینۆفۆن و خیریسۆفۆس رێککەوتنێکیان لەگەڵ دوژمن ساز کرد کە ئەوان تەرمی مردوەکانیان بدەنەوە، لەبەرانبەردا رێناسە ئەسیرەکە بەردەن.

مردووەکان بە رێورەسمێك نێژران کە شایستەی پیاوی ئازا بوو. رۆژی دواتر بەبێ رێناس بەرێ کەوتن و دوژمن شەڕیان دەکرد، تەنگەبەرەکانیان داگیر دەکرد، هەر جارێك کە تووشی ئەمە دەبوون زینۆفۆن دەچوو بۆ جێگەی لەوان بەرزتر و پەکی دەخستن، و ئەگەر پەلاماری پاسەوانانی پاشەریان دابایە خیریسۆفۆس ئەو هەوڵانەی پەك دەخست بە رێگا گۆڕین و بە داگیرکردنی شوێنی بەرز، واتە هەمیشە بەهانای یەکتر دەهاتن و پشتیوانیەکی بەنرخیان لە یەکتر دەکرد. زۆر جاریش ئەوانەی کە بەسەر شوێنی بەرز دەکەوتن لەگەڕانەوەدا زۆر بە سووکی دەبزوین و هەڵ نەدەهاتن و نەدەگەیشتنە سەریان.

تاکە چەکی کاردۆخیەکان کەوان و قۆچەقانی بوو، لەراستیشدا تیرەندازی باش بوون، کەوانەکانیان ٤—٥ پیّ دریّژ بوون و تیرەکان ٣ پیّ دەبوون. کە تیریان دەهاویشت لاقی چەپیان پێش دەخست ئینجا پەتەکەیان رادەکێشا. تیرەکانیان زرێی سینگپۆش و قەڵغانەکانیان دەبڕی، کە دەکەوتنە دەست یۆنانیەکان پەتەکانیان چاك دەکردەوە و بەکاریان دەهێنانەوە. لە ولاّتی ئەوهادا تیرەندازە کریتییەکان کەڵکێکی بێئەندازەیان هەبوو، ستراتۆکلیس کە خۆی کریتی بوو رابەرایەتیی دەکردن.



## چاپتەر -٣-
# پەڕینەوە بۆ ئەرمینیا

ئەو رۆژە ئۆردوگایان لەم گوندە داکوتا کە بەسەر دەشتێکدا دەیڕوانی بۆ ئەوبەری رووباری سەنتریتیس Centrites. رووبارەکە ٢٠٠ پێ بەرین بوو و سنووری نێوان ئەرمینیا و ولاتی کاردۆخی پێك دەهێنا. یۆنانیەکان بەدیتنی دەشت گەشانەوە. رووبارەکە نیو فەرسەخ لە چیای کاردۆخییەکان دوور بوو، خەنی ببوون بەو دیمەنە و بەو هەموو خۆراکەی کە هەبوو، باسی ئەم دەردەسەریەیان دەکرد کە تووشی ببوون چونکە بەدرێژایی هەفتەی رابردوو کە ولاتی کاردۆخیان بڕیوە بەبەردەوامی شەڕیان کردووە و لەوێدا زیانەکانیان لەهەموو زیانەکانی شەڕ دژبە تیزافەڕنە و شا زۆرتر بوو. جا کە بەبیریان هاتەوە ئەو دەردەسەرەیان لەکۆڵ بۆتەوە، خەرێکی خۆشیان لێ کەوت. کەچی بەیانی هەندێك سوارەیان لەوبەری رووبارەکە دیت خۆیان ساز کردبوو کە رێگای پەڕینەوەیان لێ بگرن، و لەولاتر لەسەر دەشتەکە تیپی پیادە ریز ببوون. ئەوانە بەکرێگیراوی ئەرمەن و ماردی Mardian و خالدەیی Chaldaean[1] بوون لە خزمەت ئۆرۆنتا و ئەرتۆخاس دا بوون. دەڵێن خالدەیی خەڵکێکی سەربەخۆ و شەڕکەرن، رمب و قەڵغانی درێژیان هەیە. دەشتاییەکەی کە پیادەکانی لێ ریز ببوون ٣٠٠ یان ٤٠٠ پێ لە رووبارەکە دوور بوو، تاکە رێگایەك هەبوو لەوێدا بەسەر گردەکە دەکەوت، وا پی دەچوو کە بەتایبەتی بۆ ئەو هەورازە دروست کرابێت.

کە یۆنایەکان ویستیان بپەڕنەوە، ئاوەکە لە سینگیان بەرزتر بوو و بنی رووبارەکەش تەخت نەبوو بەڵکو پڕ بوو لە گاشە بەردی لەق و گەورە، پێیان نەدەکرا چەك و قەڵغانەکانیان بەرنە نێو ئاو چونکە ئەگەر لەوهایان کردبایە ئاو دەیبردن، و لەگەر چەکیان خستبایە سەر سەریان ئەوسا بەرگەی تیر و بەردەکانی دوژمنیان نەدەگرت. بۆیە لە ئاوەکە کشانەوە و لە رۆخی رووبارەکە دامەزران، ئینجا ئاوڕیان دایەوە دیتیان کاردۆخی بەچەکەوە جێگەی ئۆردوگای

---

[1] ئێستاش عەشیرەتێکی کورد هەیە بەناوی خالدی، دەیانگوت گوایە لە نەوەی (خالد بن ولید) ن بەلام لە راستیدا ناوبراو وجاغکوێر بووە؟!

دوژمنییان داگیر کردووە. ورەی یۆنانیەکان نزم بوو، پێشتر دیتبویان وا رووبارەکە قووڵە و دوژمن لەوبەر راساون، و ئێستا وا کاردۆخیش پشتیان لێ گرتوون. ئەو رۆژە و شەوەکەی کە بەسەریاندا هات لەجێگەی خۆیان چەقین و نەیاندەزانی چ بکەن.

زینۆفۆن خەونێکی دیت. لە خەونەکەیدا بەزنجیر بەستزابۆوە بەلام زنجیر لەخۆڕا کرانەوە و دەست و پەلی ئازاد بوون. پێش رۆژهەلات چوو بۆ لای خیریسۆفۆس و پێی گوت کە هەست دەکات ئیشەکان باش دەبن و خەونەکەی بۆ گێڕایەوە. خیریسۆفۆس پێی گەشایەوە و کاتی رۆژ هەلات جەنەراڵەکانی بانگ کرد و قوربانیی کرد، قوربانییەکە نیشانەیەکی زۆر باشی دا، قوربانیەکانی بەجێهێشت و فەرمانی دا نان بخورێت. کە زینۆفۆن نانی دەخوارد، دوو گەنج بەپەلە بۆی هاتن، هەموو دەیانزانی کە دەتوانن لەهەر کاتێکدا قسەی لەگەڵ بکەن، ئەگەر لەسەر نانی بەیانی بایە یان نانی ئێوارە یان لە کاتی خەو، هەمیشە گوێی لێ رادەگرتن. گەنجەکان گێڕایانەوە کە ئەوان لەبەر ئاگر دانیشتبوون، ژن و مێردێك و چەند منداڵێکیان دیت لە ئاوەکە پەڕینەوە، شوێنەکە پڕ بوو لە بەرد و شاخ کە سوارەی دەوژمنی نەدەگەیشتێ، ئەوانیش چوون جلیان فڕێدا، سەرو خەنجەرێکیان لەگەڵ خۆ برد و لە ئاوەکە پەڕینەوە بۆ ئەوبەر و ئینجا گەڕانەوە بەبێ ئەوەی کە ئاو بگاتە ئاستی گۆچانێك.

زینۆفۆن شوکرانەیەکی کرد و داوای لەگەنجەکان کرد لەگەڵیدا شوکرانە بکەن کە رێگای تەنکاوەکەیان پێشان دراوە. یەکسەر گەنجەکانی بردە لای خیریسۆفۆس و ئەم مەسەلەیان گێڕایەوە، خیریسۆفۆسیش یەکسەر شوکرانەیەکی کرد و پاش ئەوە خەلکەکەی دەنگ دا کە شەکیان تێك بنێن. کۆبوونەوەیەکی بەست تا لەگەڵ جەنەراڵکان باشترین پلان پێڕەو بکەن بۆ پەڕینەوە کە چۆن هێزەکانی پێشیان ببەزێنن بەبێ ئەوەی لە دواوە زیانیان پێ بگات. بڕیاریان دا کە پێشێ خیریسۆفۆس و نیوەی هێزەکە بپەڕنەوە، زینۆفۆن و نیوەکەی دیکە لێرە بمێنن بۆ پەڕاندنەوەی بار و بارگەکان.

کە ئیشەکان رێکخران، دوو گەنجەکە بەپێشیان کەوتن و رووبارەکەیان خستە لای چەپیان. شوێنی تەنکاوەکە نیو فەرسەخ دوور بوو، سوارەکانی ئەوبەر بەتەریبی لەگەڵ لەشکرەکە دەجولانەوە. کە گەیشتنە شوێنەکە چەکیان لەسەر زەوی دانا و خیریسۆفۆس جل و خودەکەی

دانا و دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و داوای کرد هەموو لاسای بکەنەوە، بە کاپتەکانی گوت کە بەریز بپەڕنەوە، هەندێکیان بەلای چەپ و هەندێکیان بەلای راستی خیریسۆفۆسدا. فالگرەوەکان سەری قوربانیەکانیان لەسەر رۆخی رووبارەکە بڕی و دوژمن تیر و بەردی تێ دەگرتن بەڵام نەدەگەیشتە وان. قوربانیەکان نیشانەی باشیان دەر خست، ئەوجا سەربازەکان سروودیان خوێند و نەعرەتەی شەڕیان بەرز کردەوە، تەنانەت ئافرەتەکانیش لەو هاوارەدا بەشدار بوون چونکە هەندێك سەرباز کەنیزەکانی خۆیان لەگەڵدا بوو.

خیریسۆفۆس و سەربازەکان چونە نێو رووبارەکە. زینۆفۆن و پاسەوانانی پاشەر کە جوڵەیان سووکتر بوو بەغار بۆ لای رووبارەکە چوون بۆ ئەو شوێنەی کە لەبەرانبەر ئەرمەنەکان بوو، وایان دیار دەخست گوایە دەیانەوێ بەوێدا بپەڕنەوە و بەپشت سوارەکاندا بسوڕێنەوە تا لە پیادەکان دابڕێن. دوژمن دیتیان وا خیریسۆفۆس لە تەنکاوەکە دەپەڕێتەوە و لەلایەکی دیکەشدا زینۆفۆن و پیاوەکانی بەرەو شوێنی کۆنی خۆیان غار دەدەن، ترسان کە پشتیان لێ بگیرێت و یەکسەر بەخێرایی لە رووبارەکە دوور کەوتنەوە. هەر کە گەیشتنە سەر رێگاکە بایانداییەوە بەرەو هەورازەکان، لوسیۆس، فەرماندەی سوارەکان و ئەسخینیس، فەرماندەی پەلتاستەکانی کە لەگەڵ خیریسۆفۆس بوون، ئەوانە بەدوا دوژمن کەوتن. سەربازەکان هاواریان دەکردە یەکتر کە دوا نەکەون و تا چیاکە راەویان بنێن بەڵام کە خیریسۆفۆس پەڕییەوە بەدوا سوارەکان نەکەوت و یەکسەر بەرەو دەشتاییەکە چوو و هێرشی بۆ پیادەکان برد. کە چاویان بە سوارەکانیان کەوت وا هەڵدێن و هۆپلیتە یۆنانیەکان بۆیان دێن، ئەوانەش دەشتە بەرزەوەکەیان چۆل کرد. زینۆفۆن کە دیتی ئیشەکە لەوبەر باش دەڕوات، بەخێرایی گەڕایەوە لای تەنکاوەکە چونکە خەمی کاردۆخیەکانی بوو، ئەوانە بەنیازی پەلاماردان دەهاتنە خوار. خیریسۆفۆس ئێستا دەشتاییەکەی داگیرکردبوو هەروەها لیکیۆس خەریکی گرتنی هەندێك شمەك و بارگین بوو کە ئەوان بەجێیان هێشتبوون، هەندێك جل و پەرداغی خواردنەوەشیان کەوتە دەست. زۆربەی لەشکرەکە خەریکی پەڕینەوە بوو، زینۆفۆن پیاوەکانی لەسەر شێوازی مەیدان بەرانبەر کاردۆخیەکان ریز کرد، فەرمانی دا کە کاپتەکان تاقمی ٢٥ی پێك بێنن، چەند تاقمێکی بەگژ کاردۆخییەکاندا برد و هەندێکی هێشتەوە کە روویان لە رووبارەکە بێت.

کاردۆخی دەیاندیت کەوا بەشی گەورەی لەشکرەکە لەم بەرەی خۆیاندا تەنك بۆتەوە و کەمیان ماون، دەستیان پێکرد خێراتر بێنە پێش و سروودێکیان دەگوت. بەلآم خیریسۆفۆس کە لە جێیەکی ئاسوودە بوو، پەلتاست و تیرەنداز و بەردهاوێژی بۆ زینۆفۆن ناردەوە و گوتی دەبێ فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن. زینۆفۆن ئەوانەی دیت وا دەپەڕنەوە، خەبەری نارد کە لەوبەر بوەستن و پیاوەکانی خۆی دەستیان پێکرد بپەڕنەوە لەوبەر. دەبایە پیاوەکانی زینۆفۆن بەملا و ئەولای تیرەندازەکاندا بپەڕنەوە، تیرەندازەکانیش دەبایە وا پێشان بدەن گوایە دێنەوە ئەم بەرە، بەلآم زۆر نەیەن بۆ نێو ئاوەکە. فەرمانەکانی ئەوە بوون کە ئەگەر هاتو پیاوەکانی کەوتنە بەر مەودای بەردەکانی دوژمن و گوێیان لە تەقەی بەردەکان بوو کە بە قەلغانەکان دەکەون، دەبێ سروودی پایان بخوێنن و هێرش بەرن، کە دوژمن هەلآتن و شەیپوورژەنەکان ئاوازی هێرشیان ژەنی، پیاوەکانی پاشەر بەرەو دەستە راست بسوڕێنەوە و بڕۆن، ئینجا دەبایە هەر هەموو بەرەو رووبارەکە غار بدەن و بەزووترین کات بەقەدبڕ بپەڕنەوە بۆ لەوەی قەرەبالغایی دروست نەکەن و هەی لەوەی خۆی دەگەیێنێتە ئەوبەر.

کاردۆخیەکان دیتیان چەکدارێکی کەم لەلای بارگەکان ماون چونکە زۆر لەوانەی کە بە پاسەوان دانرابوون بارگەکانیان بەجێ هێشتبوو سەیری شەڕ و پەڕینەویان دەکرد کەوا هەندێکیان کەنیزە و برادەرەکانیان گەیشتبوونە لەوبەر. کاردۆخیەکان دەستیان پێکرد بەرد و تیر بهاوێن، یۆنانی سروودی پایانیان خوێند و بۆیان چوون، کاردۆخی بەرگەیان نەگرت چونکە کاردۆخی لەو زرێیەیان نەپۆشتبوو کە بەکەلکی شەڕی نزیك بێت. لێرەدا شەیپوورەکان ژەنران و دوژمن زۆر بە خێرایی کشایەوە، کەچی یۆنانیەکان یەکسەر روویان وەرسوڕاند و یەك بەخۆ لە رووبارەکە دەرباز بوون. هەندێك لە دوژمنەکان تێگەیشتن و خۆیان گەیاندەوە نزیك رووبارەکە و توانیان هەندێك کەس بەتیر بریندار بکەن، بەلآم تەنانەت کە هەموو یۆنانیەکان گەیشتنە لەوبەر، هێشتا زۆربەی کاردۆخیەکان لە هەلآتندا بوون. لەوەی کە خۆشە ئەمەیە کە هەندێك یۆنانی دەیانویست ئازایەتی خۆیان دیار بخەن، لەوانە هەندە هاتنە پێش تا گەیشتنە لای کاردۆخیەکان و تا هەموو پیاوەکانی زینۆفۆن دەرباز بوون ئەوجار گەڕانەوە، تەنانەت هەندێکیان برینداریش کران.

## چاپتەر -٤-

## ئۆردوگای تیریباز گەمارۆ دەدەن

پاش پەڕینەوە، خۆیان کۆکردەوە و ١٥ فەرسەخیان بەنێو ئەرمینیادا بڕی. ولاتێکی دەشتایی بوو لەگەڵ هەندێك گرد کە لێژاییەکی نەرمیان هەبوو. بەهۆی جەنگی کاردۆخی و ئەرمەن گوند لەو نزیکانەدا نەبوون[1]، بەلام لە کۆتایی ڕێپێوانی ئەو ڕۆژە گەیشتنە گوندێکی گەورە کە تەلارێکی تێدا بوو هی شارەوانەکە. زۆربەی خانووەکان بەقەلات دەچوون، خۆراکێکی زۆریش هەبوو. ئینجا بە دوو ڕۆژ ٣٠ فەرسەخیان بڕی تا گەیشتنە سەرچاوەکانی ڕووباری دیجلە. لەوێڕا بە سێ ڕۆژ ٤٥ فەرسەخیان بڕی و گەیشتنە تلێبواس Tleboas، ڕووبارێکی جوانە بەلام بچووکە.

هەندێك گوند لە نزیك ڕووبارەکە هەبوون، تێکڕای ئەم بەشە پێی دەگوترا ئەرمینیای خۆرئاوا. تیریباز ، برادەری شا بوو، لەوێ حوکمی دەکرد. کە لەو لەئارادا بایە کەس بۆی نەبوو جڵەوی ئەسپەکەی شا بگرێت و سواری بکات. ئێستاش وا بەتاقمێك سوارەوە هاتە لای یۆنانیەکان، تەرجومالەکەی نارد کە دەیویست قسە لەگەڵ فەرماندەکان بکات. جەنەراڵەکان بڕیان کردەوە کە بزانن بڵێن چی، لێی چوونە پێش بای ئەوەی کە گوێیان لێ بێت و پرسییان چی دەوێت؟ گوتی دەیەوێ لەگەڵیان ڕێك بکەوێ کەوا ئەو زیان بە یۆنانیەکان ناگەیێنێت و لەبەرانبەردا دەبێ ئەوان خانووەکان نەسوتێنن. یۆنالیەکانیش بۆیان هەیە پێداویستییەکانیان دابین بکەن. جەنەڕاڵەکان لەو پێشنیازەیان پەسند کرد.

پاش ئەوە، بە سێ ڕۆژ لەسەر خاکێکی تەختدا ڕۆیشتن و٤٥ فەرسەخیان بڕی، وتیریباز هەمیشە لە دووری یەك فەرسەخ بەدوایانەوە بوو. لە ڕێگادا ژمارەیەك گوند هەبوون پڕ لە شمەك و خۆراك، شەو بەفرێکی زۆر باری، لەگوندەکەدا بڕیاریان دا هەر تاقمە و گەڕەکێکی گوندەکە کۆنتڕۆڵ بکەن چونکە دوژمن سۆراغی نەبوو لێر وا پێ دەچوو کە بای هەندە ئارامە

---

[1] دیارە کاردۆخی کەسیان نەهێشتوە دژایەتی نەکەن!؟

کە ئەوها بلاَو ببنەوە. گەڕەکەکان خۆراك و گۆشت و دەرە و شەرابی کۆن و مێوژ و جۆرەها سەوزەیان لێ بوو.

هەندێك سەرباز لەو ناوە گەڕابوون، راپۆرتیان دا کە هەندێك ئاگری ئۆردوگای دوژمنیان دیتوە. جەنراڵەکان بڕیاریان دا کە باشتر ئەوەیە هەموو لە یەك جێگا بن. لەشکر هاتەوە لای یەکتر بەلاَم بەفرێکی زۆر باری کەوا ئەو خەلکەی کە لەسەر زەوی بوون بە بەفر داپۆشران، بارگینەکانیش هەر بە بەفر داپۆشران، سەربازەکان هێزیان نەمابوو هەستنەوە، کەچی هەر ئەو بەفرەی کە لەسەریان نیشتبوو لەشیانی بە گەرمی هێشتەوە.

زینۆفۆن بای ئەوەندە هێزی تێدابوو کە بەبێ جلی ئەستور هەستایەوە داری شکاند، ئینجا ئەوانەی دیکە هەستانەوە دار بشکێنن و ئاگر داگیرسێنن و مەرهەمیان لە لەشیان هەڵسواند. مەرهەمێکی زۆر لەم ناوە هەبوو لە بەزی بەراز و بادەمی تاڵ و تەربەنتین دروست کرابوو، لەباتی زەیتی زەیتون ئەمەیان بەکار دەهێنا. روونێکی تریشیان هەبوو، روونێکی بۆندار.

پاش بەفرەکە، بڕیار درا کە دیسان بەنهێنی لە گەڕەکی جودا بلاَو بنەوە. سەربازەکان بە پێکەنین و هەرا چوونەوە بۆ خانوو و عەنبارەکانی خۆراك، ئەوانەی کە جاری یەکەم وەکو شەقاوە رەفتاریان کردبوو و جێگەکانیان سووتاندبوو تووشی داوی خۆیان بوونەوە و ناچار بوون شەوەکە لە هەمان جێگا بەسەربەن کە پێشتر پیسیان کردبوو. جەنەراڵەکان تاقمێك سەربازیان دایە دەست دیمۆکراتیسی تەمەلنۆس کە بچن بۆ چیاکان بزانن ئەو ئاگرانە چ بوون؟ ئەم پیاوەیان هەڵبژارد چونکە لە زۆر حاڵەتی هەمەجۆردا زانیاریی باشی کۆ کردبۆوە، کە دەیگوت وا شتێك لەوێیە، قسەی راست دەردەچوو، و کە دەیگوت هیچ نیە، دەردەچوو کە هیچ نیە.

بۆ چیا رۆیشت و هاتەوە گوتی هیچ ئاگری لێ نەبوو بەلاَم ئەسیرێکی هێنایەوە، کەوانێکی فارسی پێبوو لەگەڵ تەبەرێك لەو تەبەرانەی کە ئەمەزۆنەکان هەڵیان دەگرن[1]. پرسیاریان لێ کرد، گوتی من فارسم و لە لەشکری تیریباز هاتووە خۆراك پەیدا بکەم. پرسیاریان لێ کرد

---

[1] ئەمەزۆن واتە (بێ مەمك) و لە ئەفسانەدا (پێش دۆزینەوەی ئەمەریکا) یۆنانی ئەم ناوەیان لە ناوچەیەکی باکووری تورکیا نابوو.

دەربارەی چەندێتی لەشکرەکە و بۆچی بزوێندراوە؟ وەڵامی دایەوە کەوا تیریباز سەرباری هێزەکانی خۆی چەکداری بەکرێگیراوی خالیبی Chalybes و تەوخی Toachi کۆ کردۆتەوە، و نیازی هەیە لە دەربەندێکی چیاکەدا پەلاماری یۆنانیەکان بدات. کە ئەمەیان بیست بڕیاریان دا دیسان لەشکرەکە کۆبکەونەوە، پاسەوانیان لەگەڵ سۆفەینەتۆسی ستیمفالی بەجێهێشت و ئەوانەی دیکەیان لەگەڵ ئەسیرەکە برد بۆ ئەو جێگەی کە باسی دەکرد.

کە لەچیاکان ئاوابوون پەلتاستەکان پێش کەوتنەوە و ئۆردوگای دوژمنیان دۆزیەوە، لەسەر هۆپلیتەکان نەوەستان و یەکسەر هێرشیان کرد. دوژمن کە گوێیان لەو هەرایە بوو خۆیان نەگرت و هەڵاتن. سەرباری ئەمەش، هەندێکیان کوژران و نزیکەی ٢٠ وڵاغ گیران و رەشماڵەکەی تیریباز و قەنەفەی پێچکە زیو و گوڵدانی تێدا بوو، وێڕای هەندێك پیاویش کە نانەوا و نۆکەر بوون.

کە جەنراڵ و هۆپلیتەکان ئەمەیان دیت، بڕیاریان دا بەزووترین کات بگەڕێنەوە ئۆردوگاکەیان چونکە رەنگە پاسەوانەکانی ئۆردوگا پەلامار بدرێن. شەیپووری گەڕانەوە ژەنرا و لەهەمان رۆژدا گەیشتنەوە جێ.

## چاپتەر -٥-
## گەشتی نێو بەفر

دواتر بڕیاریان دا کە دەبێ خێرا هەڵێن پێش ئەوەی خەڵکی ناوچەکە هێزیان کۆ بکەنەوە و دەربەندەکە بگرن. شمەکیان تێك نا و هەندێك ڕێناسیان لەگەڵ خۆ برد بەو بەفرەدا و، لەهەمان ڕۆژ لە دەربەوندەکە تێپەڕین. لێرەوە بە سێ ڕۆژ ٤٠ فەرسەخیان لە چۆڵەوانیەك بڕی تا گەیشتنە ڕووباری فورات، لێی پەڕینەوە بەبێ ئەوەی سەرناوکیان تەڕ بێت، دەیانگوت سەرچاوەی ڕووبارەکە لەو نزیکانەیە. ئینجا بە سێ ڕۆژە ڕێ بە دەشتاییەکی تەختدا ٤٥ فەرسەخیان بڕی پڕ لە بەفر. ڕێپێوانی ڕۆژی سێیەم زۆر سەخت بوو کە بای شەماڵ بەچەشنی چەقۆ خەڵکەکەی دەبڕی و ڕەقی دەکردنەوە.

یەك لە فاڵگرەوەکان پێشنیازی کرد قوربانیەك بکەن. بەقسایان کرد، ئەوسا هەموو هەستیان کرد کە هەندێك ڕەشەبایەکەی شکاند. بەفرەکە شەش پێ ئەستوور بوو و زۆر بارگین و یەخسیر تێدا بزر بوون، هەمان شتیش بەسەر ٣٠ سەربازدا هات. ئاگریان نەکوژاندەوە بەدرێژایی شەو، چیلکە لەوێدا زۆربوو بەلاّم ئەوانەی کە بەدرەنگەوە گەیشتنە ئۆردوگا، داریان پێ پەیدا نەکرا و ئەوانەی زووتر گەیشتبوونە جێ ڕێگای ئەوانەی دیکەیان نەدەدا خۆیان گەرم بکەنەوە مەگەر هەندێك دەرە و خۆراکیان دابانێ. کە ئاگرەکان داگیرسان بەفرەکە توایەوە و ژمارەیەك کون و قەوارە کەوتنە بەفرەکە، ئەمە دەرفەتی دا قوولایی بەفرەکە بپێون.

ڕێپێوانی ڕۆژی دواتر هەموو لەنێو بەفر بەڕێوە چوو. هەندێك سەرباز تووشی دەردە بولیمیا Bulimia بوون. زینۆفۆن کە لەسەر پاسەوانانی پاشەر بوو بەسەر سەربازی پەککەوتەدا دەگەڕا و نەیدەزانی ئەم دەردە چیە، بەلاّم یەکی شارەز گوتی بێگومان ئەمە حاڵەتی بولیمیایە و ئەگەر خواردنیان بدرێتێ هەڵدەستنەوە، جا بەنێو کاروانی بارگینەکاندا چوو و هەرچی کەڵکی خواردنی هەبوو بۆ نەخۆشەکانی نارد. هەروەها ئەوانەی کە هێزی جوڵەیان هەبوو ناردنی کە بەسەر تیپەکانی دیکەدا بگەڕێن و خواردنەکان ببەشنەوە. پەککەوتەکان هەر کە شتێکیان دەخوارد یەکسەر هەڵدەستانەوە.

کاتێ شەو خیریسۆفۆس گەیشتە گوندێك، لەسەر بیری بەر قەلاتەکە تووشی چەند ژن و کچێك بوو ئاویان دەبەرد. لە یۆنانیەکانیان پرسی ئەوان کێن؟ تەرجومانەکە بە فارسی وەلامی دانەوە کەوا لەلایەن شاوە بۆ لای شارەوان دەچن. ژنەکان گوتیان ئێستا شارەوان لێرە نیە و لەدووری سێ فەرسەخ دایە. کاتەکە شەو بوو، ئیتر لەگەڵ ژنە ئاوهەڵگرەکان چوو بۆ نێو قەلاتەکە تا کێخوای گوندەکە ببینێت، ئەوەی لەگەڵ خیریسۆفۆس بوون لەنێو قەلاتەکە مانەوە بەلام ئەوانی دیکە زۆربەیان لە دەرەوە مانەوە و رێگاکەیان پێ تەواو نەدەکرا، شەوەکەیان بەبێ ئاگر و خۆراك بەسەر برد و هەندێکیان مردن، هەندێك لە دوژمنەکانیش بە کۆمەڵ خڕ دەبوونەوە و دەستیان بەسەر بارگینە تۆپیوەکاندا دەگرت و لەسەریان بەشەڕ دەهاتن. سەربازەکان کە چاویان بە بەفر کوێر ببوو یان پەلجەکانیان بە بەفر بڕابوون، ئەوانە بەجێ مان.

ئەگەر شتێکی رەشیان بەسەر چاویاندا دابایە چاویان کوێر نەدەبوو، و دەبایە هەمیشە بجولێنەوە و هەرگیز نەوەستن و دەبایە بەشەو پێلاوەکانیان داکەنن، لەگەر بە پێلاوەوە نوستبان قەیتانەکان گۆشتی دەبڕین و پێیان لەنێو پێلاوەکاندا دەیبەست، ئەمەش چونکە پێلاوەکانیان دڕابوون و بە ناچاری چەرمی گا و بارگینەکانیان لەپێ کردبوو. سەربازەکانی کە تووشی ئەو دەردانە ببوون بەجێ مابوون. پارچەیەك رەشاییان لەسەر بەفرەکە دیت، وایانزانی لەوێدا بەفرەکە تواوەتەوە، کەچی لەراستیدا بەهۆی تینی هەڵمێك بوو کە لە درەختەکان دەردەچوو. سەربازەکان گەڕانەوە بۆ وێ و بەهیچ نەدەجولانەوە. هەر کە زینۆفۆن ئەمەی بیست، گەڕایەوە و لێیان پاڕایەوە کە بەجێ نەمێنن، گوتی دوژمن بە ژمارەیەکی زۆرەوە لەدوایاندان. لەکۆتاییدا توڕەبوون، پێیان گوت با بیبانکوژێت چونکە توانای جوڵەیان نەماوە. باشترین شت ئەوەبوو کە دوژمنەکان بترسێنێ تاکو بەسەر ئەم سەربازە پەککەوتانە رانەگەن. تاریکی داهات، دوژمنیش دەنگێکی زۆریان لێوە دەهات چونکە لەسەر دەسکەوتەکان بەشەڕ دەهاتن. ئیتر پاسەوانانی پاشەر کە توانای جوڵەیان هەبوو هەستانەوە و پەلاماری دوژمنیان دا، پەککەوتەکانیش بە گوێرەی توانا لەگەڵ ئەوان دەنگ و هاواریان دەکرد و تەقەیان بەقەڵغان و رمبەکانیان دەکرد بۆ ئەوەی دەنگە زۆر بێت. دوژمن تۆقین و خۆیان هەڵدایە نێو قەوارەی پۆشەلانە رەشەکە و لەمە بەولا یەك دەنگی تریان لێ نەهات. زینۆفۆن بە نەخۆشەکانی گوت کە سبەینێ تاقمێك

دەنێرێتەوە لایان و خۆی بەرێ کەوتەوە، کەچی تا ڕۆژ داهاتەوە تەنیا نیو فەرسەخی بڕی. لەو ڕێگادا تووشی زۆر سەربازی تر بوون کە بەبێ پاسەوانی لە قەراغ ڕێگا کەوتبوونە ژێر بەفر، زینۆفۆن راستی دەکردنەوە بەلاَم گوتیان ریزەکانی پێشەو راوەستاون و نارۆن.

زینۆفۆن پەلتاستە باشەکانی هەڵبژارد و ناردنی بۆ پێشەوە تا بزانن کاروانەکە بۆچی وەستاوە، خەبەریان دایەوە کەوا تێکڕای لەشکرەکە بەم جۆرە دانیشتون. زینۆفۆن بەگوێرەی توانا پاسەوانی بلاَو کردەوە و شەوەکەی بەبێ نان و ئاو بەسەر برد. پێش ڕۆژهەلاَت، زینۆفۆن پیاوە هەرە گەنجەکانی ناردەوە لای نەخۆشەکان کە بە تۆبزی هەڵیان بستێننەوە و بیانخەنەوە سەر ڕێگا. لەم کاتەدا خیریسۆفۆس تاقمێك پیاوی نێو قەلاَتەکەی نارد تا بزانن پاسەوانانی پاشەر چییان بەسەر هاتووە؟ پیاوانی زینۆفۆن بەمە شاد بوون و نەخۆشەکانیان دانێ تا بیانبەن بۆ ئۆردوگا. ئەوجار خۆیان بەرێ کەوتنەوە، دوو فەرسەخیان بڕی تا گەیشتنە گوندەکەی کە خیریسۆفۆس ئۆردوگا لێ دامەزراندبوو. ئێستا کە هێزەکان بوونەوە یەکپارچە هەستیان بە ئاسوودەیی کرد بای ئەوەی کە تیپەکان لە گەڕەکەکانی گوندەکە بلاَو بکەنەوە. زینۆفۆن لە جێگەی خۆی مایەوە و ئەوانەی دیکە هەرکەس بۆلای هاورێکانی خۆی چوو.

لەو میانەدا پۆلیکراتیس، کاپتێکی ئەتینی بوو، روخسەتی خواست کە لەگەڵ هەندێك لە پیاوە لەشسووکەکانی نێو ئەو گوندەی کە بۆ زینۆفۆن تەرخان کرابوو بچن بەسەر خەڵکی گوندەکە و کێخواکەیاندا بدەن کەوا هەندێك ئۆکەری لێ بوو لەگەڵ ١٧ ولاَغی رەسەن کە تەرخان کرابوون بۆ شا. هەروەها کچی کێخواکە کە تەنیا نۆ ڕۆژ بوو مێردی کردبوو، مێردەکەشی لەوێ نەبوو، بۆ راو دەرچووبوو.

خانووەکانی ئێرە لەبن زەوی دروست کرابوون، دەرگاکان وەکو بیر وابوون بەلاَم لەخوارێ فرەوان دەبوونەوە، تونێل بۆ ئاژەڵەکان لێ درابوو کەچی خەڵکەکان بە پێژە دەچوونە خوارێ، لەنێو ماڵەکانیشدا مەڕ و بزن و مانگا هەموو بەچەکەوە لەوێ بوون. گەنم و جۆ و شەرابی جۆ لەنێو کووپە دانرابوون کووپەکان پڕکرابوون و لێیان دەڕژا، قەمیشیان تێ راکرابوو، کەسێك تینو بایە قەمیشی لە شەرابەکە رادەکرد و هەڵی دەلووشت. شەرابەکە توند بوو، دەبایە ئاوی تێکەڵ بکرێت، پیاو کە لێی راهاتبایە پێی دڵخۆش دەبوو. زینۆفۆن کێخواکەی بۆ نانی ئێوارە

بانگ کرد و پێی گوت دەبێ دڵی نەرم بێت چونکە منداڵەکانی لێ ناستێنن و ئەگەر تا ئەوکاتەی کە دەڕۆن چاکە لەگەڵ لەشکرەکە بکات ئەوسا ماڵەکەی پڕ دەکەن لە خۆراك و تفاق. کابرا بەڵێنی دا کە هاوکاریان بکات، پێشانی دان کە شەرابی باش لەکوێ نێژراوە. جا ئەو شەوە هەموو سەربازەکان بەو هەموو شتە باشانەی کە لەبەر دەستیاندا بوو لەو گوندە دامەزران و لەوێدا نوستن، پاسەوانیشیان لەسەر کێخوا و منداڵەکانی دانا.

ڕۆژی دووەم زینۆفۆن سەردانی خیریسۆفۆسی کرد و کێخوای لەگەڵ خۆ برد. بەهەر گوندێکدا تێپەڕیبایە سۆراغی سەربازەکانی ئەو شوێنەی دەکرد، هەموو نانیان دەخوار و ڕایاندەبوارد و لێ نەدەگەڕان بەبێ ناخواردنێك بڕوات. لەسەر هەموو خوانێك گۆشت مریشك و بەرخ و نانی گەنم و نانی جۆ و دانرابوون، ئەگەر کەسێك ویستبای کە بەخۆشی کەسێك بخواتەوە دەیبردە سەر کوپەیەکی زل و دەبایە بەچەشنی گا سەری داینێتەوە و شەرابەکە هەڵبلووشێت، کێخواکەشیان بانگ دەکرد بەڵام ئەو ڕەتی دەکردەوە مەگەر خزمێکی خۆی دیتبایە، ئەوی لەگەڵ خۆ دەبرد. کە هاتە لای خیریسۆفۆس ئەوانیش خوانەیان ڕازاندبۆوە. کوڕە ئەرمەن بە جلی ناوچەی خۆیانەوە خزمەتیان دەکردن، بە دەست و بە ئاماژەکردن مەبەستەکانیان تێ دەگەیاندن وەك بڵێی قسە لەگەڵ کەڕ و لاڵ دەکەن. پاش سڵاو، خیریسۆفۆس و زینۆفۆن لەڕێگای تەرجومانێکەوە بە فارسی لە کێخواکەیان کۆڵیەوە ئەم وڵاتە کوێیە؟ وەڵامی دایەوە کە ئێرە ئەرمینیایە. ئینجا پرسیان ئەسپەکان بۆ کێ دانراون؟ گوتی بۆ ڕێزلێنانی شا، گوتیشی وڵاتەکەی پاش ئێرە وڵاتی خالیبیە و ڕێگاکەش وا لەولایە.

زینۆفۆن ڕۆیشت و کێخواکەی بردەوە لای خەڵکی خۆی. یەك لەم ئەسپانە (کە پیر بوو) دایەوە کێخواکە و پێی گوت کە قەڵەوی بکات و بیکاتە خێر چونکە بیستبوی ئەو خەڵکە قوربانی بۆ خواوەندی خۆر دەکەن، و دەشترسا کە بتۆپێت چونکە ڕێگاکە ماندووی کردبوو. یەك لە ئەسپەکانی بۆخۆی برد و ئەوانەی دیکەی دایە هەر یەك لە جەنراڵ و کاپتنەکان. ئەسپەکانی ئەم وڵاتە لە ئەسپی فارسەکان بچووکترن بەڵام خزمەتیان باشترە. کێخوا گوتی هەر کاتێك تووشی بەفر هاتن با کیسەی بچووك لە پێچکەی وڵاغ و بارگینەکان بنێن دەنا تا زگ لەنێو بەفردا دەچەقن.

## چاپتەر -٦-
# بە مانۆڕێك ڕێگایەك دەگرن

لە ڕۆژی هەشتەمدا زینۆفۆن کێخوای گوندەکەی وەکو ڕێناسێك دایە دەست خیریسۆفۆس. هەموو خێزانەکەی بەجێ هێشت تەنیا کوڕێکی نەبێت کە هەلاشە ببوو، کوڕەکەی دایە دەست پلستینیسی ئەمفیپۆلیس تا ئاگای لێ بێت، بەنیازی ئەوەی کە ئەگەر باوکەکەی ڕێناسێکی باش بێت ئەوسا دەیتوانی کوڕەکە لەگەڵ خۆی بەرێتەوە. هەموو خۆراکی ماڵی کێخوایان تێك نا و بەڕێ کەوتن.

کێخوا بەرەڵا کرا کە لەم بەفرەدا بەئازادی پێشیان بکەوێت. پاش سێ ڕۆژ خیریسۆفۆس لێی تورە بوو کەوا لەو بەشەی ولاتەکە هیچ گوندی لێ نیە، لێی دا بەلام قۆڵبەستی نەکرد، لەئەنجامدا کێخوا بەشەو هەلات و کوڕەکەی خۆی بەجێ هێشت. ئەم ڕوداوە لە تێهەڵدانی لەسیرێك و ئینجا بەرەڵلا کردنی، تاکە ڕوداوێك بوو کە خیریسۆفۆس و زینۆفۆن تێدا نشوستی بێنن[1]. پلیستینیس خۆی بۆ ئەم کوڕە تەرخان کرد و لەگەڵ خۆی بردەوە و بوو بە برادەرێکی جێباوەڕ.

ئینجا هەفت ڕۆژ ڕۆیشتن تا ڕووباری فاسیس کە ١٠٠ پێ بەرین بوو، ئینجا ڕێپێوانێکی ٣٠ فەرسەخی بە دوو ڕۆژ گەیشتنە دەربەندێك بەرەو دەشتاییەکە شۆڕ دەبۆوە، لەوێدا خالیبی و تەوخی و فاسی ڕێگایان گرتبوو. کە خیریسۆفۆس دوژمنی دیت وا ڕێگایان گرتووە، لەشکرەکەی لە دووری ٣ فەرسەخ بەرابەر دوژمن ڕیز کرد، و بەدوا ئەفسەرەکانی دیکەی دا نارد کە بێن تاقمەکانیان لە باڵەکانی ڕیز بکەن. کە پاسەوانەکای پاشەر گەیشتنە شوێنی دیارکراوی خۆیان، کۆبوونەوەی بە جەنەراڵەکان کرد و ئەم قسانەی کرد: وەك دەبین وا دوژمن

---

[1] سەرنج بدەن کە زینۆفۆن بە هەموو جۆرێك خۆ ڕەگەڵ دەدات گوایە بڕیارەکان تەنیا لەلایەن خۆی و خسریسۆفۆسەوە دەدران !

ڕێگای چیاکانی گرتووە، دەبێ بڕیار بدەین کە چ پلانێك پێڕەو بکەین. با جەمە نانێك بدەینە لەشکر ئینجا بڕیارێك دەدەین.

کلینۆر گوتی: بەڕای من دەبێ پاش نانخواردن هێرشیان بۆ بکەین دەنا ئەگەر ئەمشەو لێرە بمێنین، ڕەنگە باوەڕیان بەخۆ پتەو بێت و ژمارەیان زیاد بکات.

پاش ئەمە زینۆفۆن قسەی کرد: بۆچوونی من ئەمەیە. ئەگەر شەڕ بکەین دەبێ بزانین چۆن کاریگەر دەبین، بەڵام ئەگەر بمانەوێ لە چیاکە ئاوا بین دەبێ بەلانی کەم و بەگوێرەی توانا وابکەین ژمارەی کوژراو و بریندارمان کەمتر بن. چیاکە شەش فەرسەخ پانە و چەکدارەکان تەنیا لەسەر ڕێگا سەرەکییەکە وەستاون، پلانی باش ئەمەیە کە بەبێ ئەوەی بدیترێین لایەکی چۆڵی چیاکە داگیر بکەین، ئەوها باشترە نەك ڕاستەوخۆ هێرش بکەینە سەر دوژمنێکی کە لەسەنگەردا خۆی ساز کردبێت. پیاو ئەگەر بەتەنیا بەسەر گردێك هەڵگەڕێت ئاسانترە لەچاو ئەوەی کە ئەملا و ئەولای بە دوژمن گیرابن، هەروەها پیاو ئەگەر بەبێ شەڕ بڕوات، ئەگەر بەشەویش بێت هەر دەتوانێ پێش خۆی ببینێت. دەتوانین بەدزی بەڕێگایەکی دووردا بۆیان بسوڕێینە و لە هەمان کاتیشدا بێرەدا هێرشێکی بەدرۆ بکەین، ئەوسا ڕەنگە هەموو هێزەکەیان بخەنە ئێرە. بەڵام من ئەو کەسە نیم باسی دزی بکەم. خیریسۆفۆس، وابزانم ئێوەی سپارتی، مەبەستم لە ئەفسەرەکانە، لە منداڵییەوە دەرس دەدرێن چۆن دزی بکەن. واش بزانم لەباتی ئەوەی کە بەسەرشۆڕیی بزانن، دزی بۆتە مایەی سەربەرزی ئەگەر شتێکی وا بدزن کە یاسا قەدەغەی نەکردبێت. ئێوە دەبنە دزێکی شارەزا و خەریك دەبن دزیارییەکان بشارنەوە. لە یاساتان دانراوە کە مەگەر لەکاتی دزیدا بتگرن تەنیا لەم حاڵەتەدا تێهەڵدان دەخۆیت. کەواتە لێرەدا دەرفەتێکی باشتان هەیە پێشانمان بدەن کە ئێوە چۆن پەروەردە کراون، بەمەش هەندێك زەبر و تێهەڵدانی دوژمن لەکۆڵ ئێمە دەکەنەوە کە لە کاتی دزینی ئەو بەشە چیایەدا دەمانگرن[١]

[١] ئەم نوکتەبازیەی و زینۆفۆن لەگەڵ جەنەراڵ خیریسۆفۆسی سپارتی سەیرە و هەست دەکرێت کە لە کاتی خۆیدا نەکراوە. وەك بڵێی بە تێهەستان خستوویەتە نێو باسەکە!

خیریسۆفۆس گوتی: سەربارەی ئەوەی کە دزی کارێکرێکی مەترسیدارە بۆ ئەو کەسانی کە دەیکەن، من بیستومە کە لێوەی ئەتینی لە دزینی دارایی گشتیدا شارەزاییەکی باشتان هەیە و کەوا پیاوە گەورەکانتان باشترین شارەزای ئەم بوارەن. ئەوەش مەگەر کەڵە پیاوانی حوکمەتەکەتان بیزانن، کەواتە ئەمە دەرفەتێکە بۆ تۆش تا پێشانمان بدەیت کە تۆ چۆن پەروەردە کراویت![1]

زینۆفۆن گوتی: ئامادەم هەر کە نان خورا پاسەوانانی پاشەر دەبەم و سەری چیاکە دەگرم. هەندێك ڕێناسم هەیە چونکە چەکدارەکانم بۆتەیان بۆ خەڵکێك دانابۆوە کە بەدوامان کەوتبوون بۆ کۆکردنەوەی شمەکی بەجێماو، ئەوانە دەڵێن چیاکە سەخت نیە و لەوەڕگەی مەڕ و مانگای تێدایە. ئەگەر لایەکی باشمان گرت ڕەنگە ڕێی بارگینەکان بێتەوە، و ئەگەر بگەینە ئاستی وان یاخۆ لەوان بەرزتر، باوەڕ ناکەم خۆیان ڕابگرن چونکە دەبینین کەوا ئێستا ئەوان ئامادەنین بەرەوڕوومان بینەوە.

خیریسۆفۆس گوتی: بەڵام بۆچی پاسەوانانی پاشەر بنێرین؟ با خەڵکی دیکە بنێرین، مەگەر خۆبەخش دەست نەکەون؟

ئەریستۆنیمۆسی میتیدەریا فەرماندەی هۆپلیتەکان و ئریستیاسی خیۆس و نیکۆماخۆسی بۆیۆتیا فەرماندەکانی پیادە سوکەکان هاتنە پێش و کە بەرزاییەکانیان داگیرکرد دەبایە چەند ئاگرێك هەڵکەن وەکو ئیشارەت. لەسەر ئەم پلانە ڕێك کەوتن و نانیان خوارد، ئینجا خیریسۆفۆس بۆ یەك فەرسەخ پێشڕەویی کرد تا پێشان بدات گوایە بەرێگا ئاساییەکادا دێت.

کە نانی ئێوارەیان خوارد و تاریك داهات، تاقمە خۆبەخشەکە بۆ گرتنی بەرزاییەکان دەرچوون، ئەوانی دیکە لە جێی خۆیان دانیشتن. کە دوژمن زانی بەرزاییەکانیان گیراون، کۆمەڵێك ئاگریان هەڵکرد و ڕاسان. بەیانی خیریسۆفۆس قوربانیی پێشکەش کرد و ئینجا بە

[1] لە کاتی خۆیدا ئەتینی پارەیان لە شارە یۆنانیەکان کۆکردەوە بەناوی بەرەنگاری دژی فارس، کەچی دواتر هەموویان لە خۆیان خەرج کرد. بەمە ناوبانگیان دەرکرد کە ئەتینی دەزانن چۆن ماڵی گشتی بخۆن.

ڕێگاکەدا پێشڕەویی کرد. هێزەکەی سەر چیا هێرشیان کردە سەر دوژمن، تا لەشکر گەیشتە وێ یۆنانیەکانی سەر چیاکە شەڕکەیان دەبردەوە و دوژمنیان رادەدا، لەهەمان کات پەلتاستەکانی دەشتەکە بۆ دوژمن چوون، خیریسۆفۆسیش لەگەڵ هۆپلیتەکان بەدوایانەوە بوو. کە دوژمن دیتی هێزەکانیان لە شوێنە بەرزەکاندا دەشکێن ئەوانیش هەلاتن، کوژراویان زۆر نەبوو بەلاّم ژمارەیەك لە قەلّغانەکانیان بەجێ ما. یۆنانی بە شمشیر قەلّغانەکانیان لەتوپەت کرد تا کەلکیان نەمێنێت. کە گەیشتنە سەر لوتکەکە، لەوێ قوربانی و شوکرانەیان پێشکەش کرد، ئینجا شۆڕبوونەوە نێو دەشتاییەکە و گەیشتنە لادێیەکی پڕ لە خۆراك.

## چاپتەر – ٧–
# چاویان بە دەریا کەت

پاش ئەمە، بە پێنج رۆژ رێپێوان ٩٠ فەرسەخ برا، گەیشتنە ولاتی تەوخییەکان و خەریك دەبوو خۆراکیان لێ ببڕێت. تەوخییەکان لەنێو کۆمەڵێك قەلات دەژیان و هەموو تفاقیان لەوێدا دەشاردەوە. یۆنانیەکان چوونە لای یەکێك لەو قەلاتانە کە وەکو ئەوانی دیکە شار و گەڕەکی بەدەورەوە نەبوو، بەلام خەڵك و مێگەل و گاڕانێکی زۆری تێدا بوو و خیریسۆفۆس یەکسەر پەلاماری دان. یەکەم پێلی هێرشەکە ماندوو بوون، پێلی دووەمی نارد، لینجا پێلی سێیەم چونکە نەدەکرا گەمارۆ بدرێت چونکە بەرد و کەندەلانی لێ بوو.

کە زینۆفۆن گەیشتە لای خیریسۆفۆس هاواری کرد: لەکاتێکی باش هاتی، دەبێ هۆر شوێنە بگیرێت دەنا لەشکر بەبێ خۆراك دەمێنێت.

پێکەوە باسی حاڵەتەکەیان کرد و زینۆفۆن پرسی چ شتێك رایگرتوون، خیریسۆفۆس گوتی: ئەو رێگایەی ئەولا تاکە رێگایە، بەلام کە پیاوێك دەیەوێ پێدا بڕوات ئەوان لەو بەرزاییەوە تاوێرە بەرد گلۆر دەکەنەوە، ئەنجامەکەش وەکو ئەوانەیە کە دەیانبینی. ئاماژەی بۆ چەند سەربازێك کرد کە دەست و پەلیان شکابوو.

زینۆفۆن پرسی: بەلام ئەگەر تاوێرە بەردەکان نەبن، چ شتێك دەیانگەڕێنێتەوە؟ بەهەمووی چەند پیاوێك لەسەر دیوارەکە وەستاون کە تەنیا هەندێکیان چەکدارن، رێگاکەش ١٥٠ پێ دەبێت کە زۆربەی دار سنۆبەری گەورەی لێیە، ئەگەر بەو سنۆبەرانە و بە قەڵغانەکانیان خۆ لە تاوێرە بەردەکان بپارێزین ئەوسا هەر ٥٠ پێ دەمێنێ بۆ قەلاتەکە، دەشتوانن راوەستن تا بەردبارانەکە دەوەستێت ئەوسا خۆیانی تێکەن.

خیریسۆفۆس: بەلام هەموو جارێك دەچینە پێش تووشی بەردباران دەبین

زینۆفۆن گوتی: ئیمەش ئەوەمان دەوێ. با بچینە پێش، ئەوان هەموو بەردەکانیان بە خێرایی تەواو دەکەن ئەوسا دەتوانین هێرش بکەین، دەشتوانین بکشێینەوە.

ئینجا خیریسۆفۆس و زینۆفۆن بەیاوەری یەکێك لە کاپتنەکان چوونە پێش، کاپتنەکە کاریماخۆسی پەرهاسی بوو کەوا سەردەستەی ئەفسەران بوو لە پاسەوانەکانی پاشەر. کاپتنەکانی لە دواوە وەستاند لە شوێنێکی ئاسوودە، ئینجا نزیکەی ١٧ کەس خۆیان لە پەنا دار سنۆبەرەکان قایم کرد، نەك پێکەوە بەڵکو تاك تاکە دەچوون و دەبایە هەرکەس ئاگای لەخۆ بێت. ئاگاسیاسی ستێمفالۆس و ئەریستیمینۆسی میتیدەریا (ئەویش کاپتنی پاسەوانانی پاشەر بوو) ئەوانەش نزیك دارەکان وەستابوون بەلاّم هەندە نەچوبوونە ناوێ چونکە دارەکان لە یەك تاقم بەدەر جێگەی خەڵکێکی زۆریان لێ نەدەبۆوە.

کالیماخۆس فێڵێکی کرد. چەند هەنگاوێك لە دارەکە دوور دەکەوتەوە ئینجا کە بەردباران دەستی پێدەکرد خێرا دەگەڕایەوە پنا دارەکان، هەر جارە باری ١٠ عەرەبانە بەرد دەهاویشران. ئاگسیاس دیتی وا تێکڕای لەشکرەکە سەیری کالیماخۆس دەکەن و دەترسا خۆی یەکەم کەس نەبێت بگاتە قەلاّتەکە، بەبێ ئەوەی داوای یارمەتی لە ئەریستۆنیمۆس و یوریلۆخۆسی لوسیا بکات (کە هەردووك برادەری بوون و لەتەنیشتی وەستابوون) بەتەنیا پێش هەموان کەوتەوە. کە کالیماخۆس دیتی وا تێ دەپەڕێت، بە قەڵغانەکەی ڕێ لێ گرت، کەچی لە هەمان کاتدا ئەریستۆنیمۆسی میتیدەریا پێش هەردووکیان کەوتەوە، ئینجا یوریلۆخۆسی لووسیا. ئەو پیاوانە هەمیشە رقابەتیی یەکتریان دەکرد بۆ ئەنجامدانی ئازایەتی، لێرە پێش یەکتر دەکەوتنەوە و لەناکاو گەیشتنە ژوورێ و بەردبارانەکە راوەستا.

پاش ئەوە دیمەنێکی زۆر ترسناك رووی دا، ژن و پیاو بە منداڵەوە خۆیان لە قەلاّتەکە هەڵدەداشت. کە ئەم شت رووی دەدا ئیتیاسی ستیمفیلۆس یەکیانی دیت کە جلێکی جوانی لەبەر بوو، رای دەکرد کە خۆ هەڵدێرێت، ئیتیاس گرتی تا رای بگرێت، کەچی کابرا لەگەڵ خۆی رایکێشا و هەردووك بە فڕکە هەڵدێران و مردن. لە کۆتایدا ئەسیرێکی کەم گیران بەلاّم مەڕ و بەران و گایەکی زۆری لێ بوو.

ئینجا بەنێو ولاّتی خالیبەکاندا بەهەفت رۆژ ٥٠ فەرسەخیان بڕی. ئەوانە جەنگاوەرترین عەشایەری سەر ئەم ڕێگایە بوون و شەڕی نزیکیان لەگەڵ یۆنانیەکان دەکرد. زرێی کەتانیان دەپۆشت کە دەگەیشتە بەریان، و لەباتی تەننورەی زرێ، تۆڕێکیان لەبەر بوو لە گوریسی

ئەستوور دروست کرابوون. هەروەها خوودە و قایشبەند، چەقۆشیان لەکەمر دەبەست هەندی خەنجەری سپارتی درێژ بوون، بەو چەقۆیانە قوڕگی ئەسیرەکانیان هەڵدەدڕاند، ئینجا سەریان دەبڕین و سەرەکانیان هەڵدەگرت و بە سەما و سروودەوە لەبەر چاوی دوژمنەکانیاندا هاتوچۆیان دەکرد. هەروەها ڕمبی یەك چوکڵەیان هەبوو ٢٠ پێ درێژ، بەرەوشتی خۆیان لە شوێنێك دەوەستان تا یۆنانیەکان ڕەت دەبوون ئەوسا بەدوایان دەکەوتن، و هەمیشە ئامادەبوون بۆ شەڕ. خانوەکانیان لەجێگای قایم دروست کردبوو بە شوورە و دیوارەوە و هەموو تفاقەکانیان لەژووری دادەنا بۆیەش یۆنانی هیچیان دەست نەکەوت و هەر لەسەر دەسکەوتەکانی ولاتی تەوەخیەکان دەژیان.

ئینجا گەیشتنە رووباری هارپاسۆس کە ٤٠٠ پێ بەرین بوو. ئینجا بەنێو ناوچەی سکیتینی Scytheni دا ڕۆیشتن. ئەوجار بەچوار ڕۆژ ٦٠ فەرسەخ زەویەکی تەختیان بڕی تا گەیشتنە لادێیەك، سێ ڕۆژ لەوێ مانەوە، بارگە و خۆراکیان پڕ کرد ئینجا بە چوار ڕۆژ ٦٠ فەرسەخیان بڕی و گەیشتنە شارێکی گەورە و ئاوەدان و گەش بەناوی گیمنیاس Gymnias. خەڵکی شارەکە ڕێناسێکیان بۆ یۆنانیەکان نارد کە بیانباتە ناوچەیەك کە دوژمنیان بوون. کە ڕێناسەکە گەیشت، گوتی دەتوانێ بە پێنج ڕۆژ بیانگەیێنێتە شوێنێکی کە دەریایان لێ دیار بێت و گوتیشی ئەگەر وا نەبوو ئامادەیە بیکوژن. جا بەڕێ کەوتن تا گەیشتنە ناوچەی دوژمنەکانیان، ڕێناسەکە لەوێ داوای لێ کردن ناوچەکە بسووتێنن و ئاویان بەسەردا بگێڕن چونکە بۆ ئەم هۆیە یارمەتیی یۆنانیەکانی داوە نەك بۆ هیچ شتێك.

لە ڕۆژی پێنجەمدا گەیشتنە چیایەك بەناوی تەکیس Thekes، کە پیاوەکانی پێشەر گەشتنە سەر لوتکەکە و چاویان بە دەریا کەوت، لەخۆشیان هات و هاوارێکی گەورەیان کرد. زینۆفۆن و پاسەوانانی پاشەر گوێیان لەو هەرایە بوو وایانزانی کەوتوونەتە بەر هێرش چونکە خەڵکی ناوچەیی هەبوون کە لە دواوە دەستیان وەشاندبوو، پاسەوانەکان بۆتەیان بۆ دانابوونەوە و هەندێکیان لێ کوشتبوون و هەندێکی دیکەیان گرتبوو، دەستیشیان بەسەر ٢٠ خوودەدا گرتبوو لەسەڵکە گا دروست کرابوون و بە تورکەوە لەسەریان دەنان.

هەر چۆنێك بێت، دەنگەکە بەرەبەرە گەورە دەبوو و بەرەبەرەش خەلکەکە بەرەو پێش دەچوون و بوو بە راکەراکە بەرەو شوێنی هەراکە و دەنگەکەش هەر بەرزتر دەبوو، دیاربوو شتێکی یەکجار گرینگ لەئارا دایە، ئیتر زینۆفۆن سواری ئەسپەکەی بوو و لووکۆس سوارەکانی دیکەی هێنا و زوو گوێیان لێ بوو سەربازەکان هاوار دەکەن (دەریا، دەریا) و خەبەرەکەیان دەگەیاندە ریزەکانی دواوە. ئینجا هەموو خێرایی بە بار و بارگینەوە غاریان دا.

کە گەیشتنە سەر لوتکەکە، سەربازەکان بە بەفرمێسکەوە باوەشیان لە یەکتر و لە چەنەراڵەکان دەدا. لە چرکەیەکیشدا، لەسەر پێشنیازی یەکێك، قەڵایێك بەردیان کۆکردەوە و لەسەر کەڵەکە بەردەکاندا کۆمەڵێك کەوڵە گای خاو و هەندێك قەڵغانیان دانا. رێناسەکە قەڵغانێکی پارچە کرد و بەوانیشی گوت هەمان شەت بکەن، ئینجا یۆنانیەکان رێناسەکەیان ناردەوە، ئەسپێك و کووپێکی زیو و رۆبێکی فارسی و ١٠ داریکیان بەدیاری پێشکەش کرد. ئەویش بەتایبەتی داوای ئەم ئەنگوستیلانەی کرد کە سەربازەکان لە ئەنگوستیاندا بوو، ژمارەیەك لەم ئەنگوستیلانەیان دایێ. پێش ئەوەی بڕوات گوندێکی بۆ دەستنیشان کردن کە تێدا بمێنن، هەروەها رێگای نیشان دان کە دەگەیێنێتەوە وڵاتی ماکرۆنیز، کە رۆیشت ئێوارە داهاتبوو.

## چاپتەر -٨-
# گەیشتنە ترایەزۆس

یۆنانی بە سێ ڕۆژ ڕێپێوان ٣٠ فەرسەخیان لە ولاتی ماکرۆنیز Macrones بڕی. لە ڕۆژی یەکەمدا گەیشتنە ئەو ڕووبارەی کە سنووری نێوان سکیتینی و ماکرۆنیز پێك دێنێت. لەلای ڕاستدا قەلاسەنگەرێکی سەیری لێ بوو، بەلای چەپیشدا ڕووبارێکی دیکەی لێ بوو کە دەبایە لێی بپەڕنەوە. لیواری ڕووبارەکە پڕبوو لە دار و درختی کورت بەلام زۆر چڕ. یۆنانی پەلەیان بوو، دارەکانیان دەبڕی دەیانویست خێرا لەوێ دەرباز بن، و ماکرۆنیەکان بە ڕمب و قەلغان و پستەکەوە لە بەرانبەر سەنگەرکاریەکان ڕاسابوون، هاواریان دەکرد و یەکتریان بانگ دەکرد و بەردیان دەهاویشت، بەردەکان دەکەوتنە نێو ڕووبارەکە. لەو میانەدا پەلتاستێك هاتە لای زینۆفۆن گوتی ئەو زمانی ئەوانە دەزانێت چونکە لەئەسڵدا خەلکی ئێرەیە و لەکاتی خۆیدا لە ئەتینا ئەسیر بووە، جا دەتوانێ قسەیان لەگەڵ بکات. زینۆفۆن گوتی: باشە، قسەیان لەگەڵدا بکە و پێش هەموو شتێك بزانە کێن؟ پرسیاری کرد، گوتیان ماکرۆنین. زینۆفۆن گوتی: لێستا بپرسە بۆچی ڕاساون و دژایەتیمان دەکەن؟ وەلامەکەیان ئەمە بوو (چونکە ئێوەن هێرش دەکەنە سەر ولاتی مە).

ئینجا جەنەراڵەکان گوتیان بلێ: ئێمە بەنیازی خراپەوە نەهاتووین، ئێمە لە جەنگ بووین دژی شا، و بۆ یۆنان دەگەڕێینەوە و دەمانەوێ بگەینە دەریا.

ماکرۆنیەکان پرسیان ئایا بەلێن دەدەن کە قسەکەیان ڕاستە؟ وەلامیان دایەوە کەوا دەیانەوێ هەردوولا سوێند و بەلێن بدەنە یەك. هەر یەك ڕمبێکی کردە دیاری بۆ لایەکەی دیکە.

پاش سوێند و بەلێنی دووسەرە، ماکرۆنیەکان دەستیان پێکرد یارمەتیان بدەن کە دارەکان ببڕنەوە تا بپەڕنەوە، بە ئازادی لەگەڵ یۆنانیەکان تێکەڵ بوون و ڕێگایان دان خۆراك بکڕن و بەدرێژایی سێ ڕۆژ لەگەلیان بەرێدا ڕۆیشتن تا سنووری کۆلخیەکان Colchian. لێرەدا چیای بەرز هەبوون بەلام لێژاییەکانیان تیژ نەبوون. کۆلخیەکان لەسەر چیا ڕاسابوون، لە سەرەتادا

یۆنانی بەنیازی هێرش کردن لەبەرانبەریاندا بە پانی ریز بوون، جەنەراڵەکان بۆ پلاندانان کۆبوونەوە، زینۆفۆن ئەمەی دەربڕی کە باشتر ئەوەیە شێوازی ئێستایان بگۆڕن و بە هێڵی لەستوونی بۆیان بچن، گوتی: ئەگەر بە پانی پێشرەوی بکەین ئەوسا رەنگە بەشێکمان زوو بگەینێ و بەشێکمان بە هۆی کەند و لەندەوە درەنگ بگەینێ، ئیتر ریزەکان لێك دەبنەوە و ورەیان دادەبەزێت. رەنگە ئەوساکەش دەوری باڵەکانمان بگرن، بەلام ئەگەر بە چەند هێڵێکی قووڵ و لەستوونی ریز بین ئەوسا مەترسی لێکبوونەوە و بەردباران و پەلاماری هەزاران پیاو نامێنێت. پێشنیازم ئەوەیە کە بە شێوازی هێڵی ئەستوونی ریز بین بەمەرجێك کە تاقمەکانی سەر باڵەکان لەملا و ئەولای دوژمن بڕۆن، بەوە دەتوانین باڵەکانیان بگرین و لەکاتی پێشڕەویدا پیاوە هەرە ئازاکانمان دەتوانن خۆیان بگەیێنن بۆ ریزەکانی دوژمن. هەر ئەفسەرێك بە ئازادی نزیکترین رێگا هەڵدەبژێرێت بەرەو دوژمن. سەبارەت بە بۆشاییەکانی نێوان تاقمەکان، دوژمن ناتوانێ بەنێویاندا بڕوات کەوا لە چەپ و راستەوە تاقمی دیکە رادەوەستن و شتێکی ئاسان نیە کەسێك بتوانێ بەنێو دوو هێڵ سەربازی هێرشبەردا بڕوات. ئەگەر تاقمێکیش تووشی تەگەرەیەك هاتن، ئەو تاقمەی کە لێیان نزیکن بەهانایان دەچن. ئەوجار ئەگەر هەر یەك لە تاقمەکان گەیشتە سەر لوتکەکە، مسۆگەرە کە دوژمن هەڵدێن.

پلانەکە پەسند کرا و لەشکرەکەیان بە چەند هێڵێکی لەستوونی ریز کرد. زینۆفۆن بە سواری ئەسپ بەسەر هەمووناندا دەگەڕا و دەیگوت: برادەران، ئەو خەڵکەی دەیانبینن دواترین تەگکەرەن لەنێوان ئێمە و ئەو جێگەی کە خەباتی بۆ دەکەین، جا دەبێ بەزیندوویی بیانخۆین.

کە ریز بوون، هەمشتا تاقم هۆپلیتی ١٠٠ کەسی پێك هێنران، پەلتاست و تیرەندازەکانیان خستە سێ تیپ، یەك لەپشت باڵی راست، یەکیش لەپاڵ باڵی چەپ، یەکیش لەپاش ناوەڕاستی لەشکرەکە وەستابوو، و هەر تیپێك لە ٦٠٠ کەس پێك هێنرابوو. فەرمان بۆ سەربازەکان رەوان کرا کە سوێند بخۆن و سروودی پایان بخوێنن. کە ئەوانە کران، لەشکر پێشڕەویی کرد، خیریسۆفۆس و زینۆفۆن لەگەڵ هەندێك پەلتاست لە هێڵی دەرەوەی ریزەکانی دوژمن لەسەر باڵی چەپ پێشرەوییان دەکرد. دوژمن دیتیان، یەکسەر غاریان دا کە بەرەنگاریان ببنەوە، ئەوجا هەندێك لە راستەوە و هەندێك لە چەپەوە لێك بوونەوە و بۆشاییەکی گەورە کەوتە ناوەڕاستی

ریزەکان. پەلتاستەکانی تیپی ئەرکادی کە لەژێر فەرماندەیی لیسخینیسی ئاکارنانی بوون وایانزانی دوژمن هەلاتوون، هاواری شەڕیان بەرز کردەوە و غاریان دا. ئەوانە یەکەم تاقم بوون بگەنە سەر چیاکە، پاش ئەوان تیپێك هۆپلیتی ئەرکادی کە لەژێر فەرماندەیی کلینۆری ئۆرخۆمینۆس بوون، پاش ئەوان گەیشتن. هەر کە پەلاماریان دان دوژمن خۆیان رانەگرت و بە شەپرێوی هەلاتن.

یۆنانی لە چیاکە ئاوابوون و گەیشتنە لادێیەکی تێر و ئاوەدان. کۆمەڵە گوندێکی ئاسایی تێدابوو بەڵام ژمارەیەك شانەی هەنگی لێبوو تێکرای ئەو سەربازانەی کە هەنگوینیان خوارد تووشی ژانەسەر و رشانەوە و زگچوون بوون، ئەوانەی کەمیان خوارد گێژ و سەرخۆش بوون و ئەوانەی زۆریان خوارد وەکو شێتیان لێ هات، تەنانەت هەندێکیان مردن. ئیتر کۆمەڵێکیان لەسەر زەوی کەوتبوون وەك بلێی لە شەڕێك بەزیون. پشێویەکی گەورەیان دیت بەڵام رۆژی دواتر وەك هیچ رووی نەدابێت، هەموو چاك بوونەوە.

لێرەوە بە دوو رۆژ ٢١ فەرسەخیان بری بۆ تراپازۆس Trapazus، شارێکی ئاوەدانی یۆنانی بوو لە یوکسین Euxine کە کۆلۆنیەکی[1] خەڵکی سینۆپ Sinop بوو لە ناوچەی کۆلخیەکاندا(Colchians). لە گوندی کۆلخیەکان ٣٠ رۆژ مانەوە، گوندێکیان کردە بنکەی خۆیان و ولاتی کۆلخیەکانیان وێران کرد. خەڵکی تراپازۆس خۆراکیان بە یۆنانیەکان دەفرۆشت و دیاریان پێشکەش دەکردن لە گا و جۆ و شەراب، هەروەها ناوبژییان کرد لەنێوان یۆنانی و کۆلخیەکاندا، ئیتر لەمانەش هەندێك گایان بەدیاری نارد. ئەمجارە یۆنانیەکان خۆیان ساز کرد ئەو قوربانیە بەجێ بگەیێنن کە لەخۆیان گرتبوو. گارانێکی زۆریان بۆ هاتبوو کە دەشیا بۆ زیۆسی رزگارکەر بکرێنە قوربانی و بۆ هێرکلێ (هرقل) بۆ ئەو رێنمایەی کە کردبووی، و بۆ خواوەندەکانی دیکە. هەروەها لەو چیایەی کە ئۆردوگایان لێ کردبوو پێشبرکەی وەرزشییان

[1] Colony - (مستعمرە)

گیرا. سەرپەرشتیاری پێشبڕکە هەڵبژێدرا، ئەمەش دراکۆنیۆسە سپارتیەکە بوو کە لە منداڵیەوە شاربەدەر کرابوو بەهۆی کەوا یەکێکی بەخەنجەر کوشتبوو[١].

کە قوربانیەکە بەجێ هێنرا کەوڵەکانیان دایە دراکۆنیۆس تا پێشیان بکەوێت بۆ شوێنی پێشبڕکەکە،کەچی لەو هەمان شوێنی خۆی دەستیشان کرد و گوتی سەری ئەم گردە باشترین شوێنە کە دەتوانین لێرەوڕا بە ئارەزووی خۆمان بەهەر لایەکدا غار بدەین. پرسیار کرا: بەڵام چۆن زۆرانبازی لەسەر بەردی ئەوها رەق دەکرێت؟ وەڵامەکەی ئەمەبوو: رەقاییەکە بۆ ئەو کەسە دەبێت کە بەزەوی دادەدرێت.

کۆمەلێك کوڕ، کە زۆربەیان لە ئەسیرەکان بوون، پێشبڕکەی غاردانەی کورتیان ئەنجام دا، هەروەها ٦٠ کریتی غادرانەی درێژیان ئەنجامدا، هەروەها چالاکیی زۆرانبازی و شەڕە مست و گەلەکۆبازی[٢] ئەنجام دران. زەماوەندەکە بە خۆشی بەڕێوە چوو، بەشدار زۆربوون و لەبەر چاوی فەرماندەکانیاندا، کە سەیریان دەکردن، پێشبڕکەیەکی توندیان دەکرد. پێشبڕکەی غاردانەی ولاغیشی تێدابوو، سوارەکان تا دەریا چوون و هاتنەوە، لە کاتی چووندا ریگاکە زۆر نشێو بوو، سوارەکان یەك بەخۆ دەهەژان. لەگەرانەوەشدا هەورازێکی سەخت بوو، ئەسپەکان بەحاڵ دەرۆیشتن، ئیتر هانادان و هاوار و هەرا و پێکەنینێکی گەورەبوو.

---

[1] (دراکۆنیۆسی سپارتی) وارنەر لە پێشەکییەکەیدا دەڵێ گوایە لەگەڵ (ئاگاسیاسی ستێمفالی) بەشەڕ دێت. کەچی دواتر دەبینین کە شەڕەکە لەگەڵ یەکێکی دیکە روو دەدات بەناوی دێکسیپوسی سپارتی Dexipus the spartian

[2] وارنەر ئەوەهای نوسیوە (all-in wrestling). دیارە جۆرە زۆرانبازییەك بووە کە بە کۆمەڵ دەکرا. بەراستی، لە زاراوەی (گەلەکۆ) باشترم دەستنەکەوت.

## چاپتەر -١-
## خیریسۆفۆس کەشتیی پەیدا دەکات

پاش ئەمە کۆنگرەیەکیان بەست بۆ باسکردنی ئەم بەشە ڕێگایەی کە ماوە. سەرەتا لیۆنی تەوریی Leon of Thurii هەستا و قسەی کرد: سەربازان، بەش بە حاڵی خۆم لەو هەموو هەڵگرە و داگرە و برۆ و ڕاکە و چەك هەڵگرە و بەرێز برۆ و ئێشك بگرە و شەڕ بکە و ئەوانە ماندوو بوومە و دەمەوێ بحەسێمەوە، ئیتر کەوا گەیشتووینە دەریا، حەز دەکەم پاشماوەی ڕێگاکە بە کەشتی ببڕم و وەکو ئۆدیسیۆ لەسەر پشتی کەشتیەك پاڵ بدەمەوە تا دەگەمەوە یۆنان.

کە ئەمەیان بیست سەربازێکی دیکە بە پەسندی بۆ قسەکە هاواری کرد، یەکی تر هەستایەوە هەمان رای دەربڕی و هەموو هەمان قسەیان کرد. ئینجا خیریسۆفۆس هەستایەوە ئەم قسانەی کرد: سەربازان، ئەناکسیبیۆس برادەرمە، ئەگەر حەز دەکەن بەدوای دا دەچم، لەخۆم رادەبینم کەشتیی پەیدا بکەم، ئێوە کە دەتانەوێ کە بەڕێی دەریا برۆن لێرە چاوەڕێ بن تا دەگەڕێمەوە. سەربازەکان پێیان خۆش بوو دەنگیان بۆ دا.

ئینجا زینۆفۆن هەستا قسەی کرد: خیریسۆفۆس دەنێردرێت بۆ ئەوەی کەشتی پەیدا بکات و دەبێ ئێمە لێرە چاوەڕێی بکەین، جا دەمەوێ ئەوە دیار بخەمە کە لە ماوەی چاوەڕوانیدا چ پێویستە لەسەرمان. یەکەم شت ئەوەیە کە دەبێ خۆراك لە وڵاتی دوژمنان کۆبکەینەوە چونکە خۆراکمان کەمە، لەهەمان کاتیشدا هەندە پارەمان پێ نەماوە کە خۆراك بکڕین. ناوچەی دەوروبەر دژوارن، ئەگەر ئیشەکانتان بە شەپرێوی بکەن زۆر پیاومان لەدەست دەچن، بۆیە بەباشی دەزانم کاتێ کە دەچن بۆ پەیداکردنی خۆراك بەتاقمی تەواو بچن و بەتەنیا نەگەڕێن، و ئێمەی ئەفسەر دەبێ چاودێری ئەم شتانە بکەین.

پێشنیازەکە پەسند کرا و زینۆفۆن بەردەوام بوو: تکایە گوێ لە خاڵی چوارەم بگرن. هەندێکتان بۆ راوەروت دەردەچن، باشتر ئەوەیە کە پێشەکی پێمان رابگەیێنن بۆ کوێ دەرۆن تا سەرژمێری نێو ئۆردوگا و دەورەوەی ئۆردوگا بزانین. هەروەها ئەگەر هێزی پشتگیرمان بۆ

کەسێك نارد تابزانین بۆ کام لای بنێرین بۆ ئەوەی ئەگەر کەسانێك بیانەوێ بەسەر شوێنێکدا بدەن، ڕێنمایان بکەین کە بە چ هێزێکەوە بیکەن.

ئەم پێشنیازەش جێبەجێ کرا، زینۆفۆن گوتی: ئێستاش شتێك هەیە دەبێ بیزانین. دوژمن ڕەنگە دەستیان بێتەوە و تالانمان بکەن و زۆر ئاساییە کە ئێستا پلانی ئەوها دابنێن چونکە ئێمە دەستمان بەسەر ملکی ئەواندا گرتووە، جا دەبێ بە نۆرە پاسەوانی بکرێت، ئەگەر بە نۆرە پاسەوانی و پاترۆڵ بگێڕین دوژمن دەرفەتی نابێت. هەروەها خالێکی تریش هەیە، ئەگەر خیریسۆفۆس بای ئەوە کەشتی پەیدا کرد کە بەشمان بکات ئەوە زۆرباشە، بەلام کە هێشتا مسۆگەر نەکراوە کەواتە دەبێ خەریك بین لێرە کەشتی پەیدا بکەین. ئەگەر کەشتی هاتن ئەوە باشە دەنا ئەوسا کەشتیی خۆمان دەبێت. دیتومە کەشتی هاموشۆی لێرە دەکەن، ئەگەر لە خەلکی تراپازۆس بپرسین کەشتیی جەنگی لەکوێ پەیدا دەبن و ئەگەر لە لای لێوارەکان بەکرێن پەیدا بن و دەفەکانیان لێ بکەینەوە تا ئەو ڕۆژەی بای خۆمان ژمارەیان زۆر دەبێت، ئەوسا وابزانم تەگەرەیەکی لەوتۆمان نامێنێت.

ئەم پێشنیازەش پەسند کرا، ئینجا زینۆفۆن گوتی: خەمێك لەوە بخۆن کە ئێمە لە گیرفانی خۆمانەوە پارەی ئەو کەشتیوانانە دەدەین، چەندەش لەسەرمان ڕاوەستن هەندە کرێیان زیاد دەکات، چەندەش لەگەلیان باش بین، هەندە باش دەبن.

ئەم پێشنیازەش پەسند کرا، زینۆفۆن بەردەوام بوو: باوەڕم وایە ئەگەر هەولەکانمان بۆ دابینکردنی کەشتی سەرکەوتو نەبوون ئەوسا دەبێ داوا لە شارەکانی سەردەریا بکەین ڕێگەکان چاك بکەنەوە. وەك دەزانین ڕێگاکان زۆر خراپن، با ئەوان ئامادەی بکەن، هەم لەبەر ئەوی لێمان دەترسن، هەم لەبەر ئەوەی کە دەیانەوێ لەکۆلیان ببینەوە.

لەم حالەدا هاواریان کرد کەوا ئامادەنین هیچی تر بە پێ بڕۆن. زینۆفۆن زانی سەربازەکان خولقیان نەماوە هەموو ڕاستیەك ڕەچاو بکەن، ئەم پیشنیازەی نەخستە دەنگدان. واش هەر توانی بە خەلکی شارەکە بسەلێنێت کە ڕێگا و بان دروست بکەن بەبیانگەی ئەوی کە بەم جۆرە دەتوانن یۆنانیەکان لەکۆل خۆ بکەونەوە. یەك کەشتیی پێنج ڕیزی لەلایەن خەلکی تراپازۆسەوە پێشکەش کرا و دیکسیپۆس Dexippus، ئەفسەرێکی سپارتی بوو، بە سەرپەرشتیاری

کەشتییەکە دانرا. بەلاّم دیکسیپۆس بەبیّ هیچ هەستێك بە بەرپرسیتی و بەبیّ هیچ پەرژشێك بۆ کۆکردنەوەی کەشتی، کەشتییەکەی برد و هەلاّت. بەلاّم دواتر تووشی داوی خۆی بۆوە کە لە تراکیا لەسەرای سیوثیس پاشادا خۆی تێکەلّ بە پلان و کێشە کرد و بەدەست نیکاندەری سپارتیەوە کوژرا.

کەشتییەکی ٥٠ ریزی تر پەیدا کرا، خستیانە دەست پۆلیکراتیس، ئەتینی بوو، هەر کەشتییەکی کە دەستی گەیشتیّ بۆ ئۆردوگای هێنا، ئەو شمەك و بارگەی کە هەبوو یۆنانیەکان خستیانە ویّ و پاسەوانیان بۆ دانا، پاسەوانیەکە بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بوو.

لەمیانی ئەوانەدا یۆنانی خەریکی راوەرووت بوون. هەندێکیان سەرکەوتوو دەبوون و هەندێکیان هیچ. کلاینەتۆس، یەکێك بوو کە سەرباری هیزی خۆی هێزێکی دیکەشی بەگژ جێگەیەکی سەختدا برد، بەخۆ و بە چەند کەسێکەوە کوژران.



## چاپتەر -٣-
# هەڵمەتێك بۆ راوەروت

لەکۆتاییدا وای لیٚ هات خۆراك لەم نزیکانە دەست نەدەکەوت بای ئەوەی بەیەك رۆژ بۆی بچن و بگەرێنەوە ئۆردوگا. بۆیە، زینۆفۆن نیوەی لەکشکرەکە لەگەڵ خۆی برد ویٚرای هەندێك رێناس لە خەڵکی تراپازۆس، نیوەکەی دیکە بۆ چاودێریی ئۆردوگا بەجیٚ هێشت چونکە کۆلخییەکان لەماڵەکانیان دەرچوبوون و بەکۆمەڵ بەرزاییەکانیان داگیر کردبوو. خەڵکی تراپازۆس شوێنێکیان پیٚ نەدۆزرایەوە کە دەسکەوتی باشی تێدا بێت چونکە لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە بەئاشتی دەژیان، بەلاٚم ئامادەبوون رێگایان بەرەو وڵاتی دریلای Drilae پێشان بدەن چونکە ئازاریان لەدەستی ئەوانە چێشتبوو. ناوچەکەیان شاخاوی بوو و خەڵکەکەی وێش بەگشتی لە خەڵکی لێوارەکانی دەریای رەش جەنگاوەرتر بوون.

کە یۆنانی پەلاماریان دان دریلاییەکان کشانەوە دوا، سەرەتا ئاگریان لەهەموو ئاوەدانیەکان بەردا، وا پیٚ دەچوو بەرهەڵستی نەمابێت. لە چەند بەراز و ئاژەڵێك بەولاوە یۆنانی هیچ دەستکەوتیان نەبوو. یەك شوێنیان هەبوو خۆیان تێدا قایم کرد کە پایتەختیان بوو، هەموو تێدا خڕ ببورنەوە، شوێنەکە کەندی قوڵی هەبوو رێگاکانیش بۆ قەلاٚتەکە سەخت بوون.

پەلتاستەکان نیو فەرسەخ پێش هۆپلیتەکان کەوتبوونەوە. ئەوانە بەسەر رێگا سەختەکاندا دەرۆیشتن و کە لەو هەموو گاڕان و تالاٚنەیان دیت یەکسەر هێرشیان کردە سەر قەلاٚتەکە. هەندێك رمبەوانیش بەدوایان کەوتبوون بۆ تالاٚنکاری، لیٚز پیٚز لە ٢٠٠٠ کەس پەرینەوە. بەلاٚم شوێنەکەیان پیٚ نەگیرا، ئەمەش سەیر نەبوو چونکە خەندەکێکی پانی لیٚ بوو دەورەکەشی هەڵدێر بوو، پەلتاستەکانیان بەسەر ئەو کەندە و بەسەر بورجە دارینەکاندا بلاٚو کردبۆوە بۆیە ویستیان بکشێنەوە، کەچی دوژمن بەتوندی پالی پێوە دەنان، لیٚز نەیاندەتوانی بکشێنەوە چونکە ریگاکە بۆ خواریٚ تەسك بوو پانایەکەی بای تاکە کەسێك بوو، دەبایە بەریز پێدا بڕۆن. خەبەریان بۆ زینۆفۆن نارد، لەو سەرپەرشتی هۆپلیتەکانی دەکرد، نامەبەرەکە گوتی شوێنەکە پڕە لە تفاق

بەلاّم ناگیرێت چونکە دوژمن هاتوونە دەرێ و پەلاماری ئێمەیان داوە، ڕێگای گەڕانەوەشمان زینەکی سەختە.

کە ئەم خەبەرە بە زینۆفۆن گەیشت هۆپلیتەکانی برد بۆ لای خەندەکە هەورازەکە و لەوێ دیمەزراندن و خۆی لەگەلّ کاپتنەکان پەڕییەوە تا بزانێ ئایا باشتر لەوەیە هیزەکان، ئەوانەی پەڕیبوونەوە، بکێشێتەوە دوا یاخۆ ئەگەر گرێمان دەشێ شوێنەکە بگرێت، ئەوسا هۆپلیتەکانیش ڕەپیش بخات؟ بۆی دەرکەوت کە کشانەوە بەبێ زیانی گەورە ناکرێت. کاپتنەکان لەسەر ئەو رایە بوون کە دەتوانن قەلاّتەکە داگیر بکەن، ئیتر زینۆفۆن قسەکەی پەسند کرد چونکە فالگرەوەکان و قوربانیەکان وایان دیار خستبوو کە مەگەر بە شەڕێکی قورس بگیرێت. بۆیە کاپتنەکانی نارد کە هۆپلیتەکانی بپەڕێننەوە و خۆی لەوێ مایەوە، پەلتاستەکانی کشاندەوە و ڕێگای نەدان هیچی تر شەڕی دووربەدووری بکەن.

کە پەلتاستەکان گەیشتنە جێ، فەرمانی بە کاپتنەکان دا هەرکەس تاقمەکەی خۆی بەجۆرێك ریز بکات کە خۆی بەباشی دەزانێت چونکە ئەو کاپتنانە پێکەوە راهاتبوون کاری نەبەردی ئەنجام بدەن. چۆنیان پێ گوترا ئەوهایان کرد، زینۆفۆنیش فەرمانی بە هەندێك لە پەلتاستەکان دا کە لەکاتی پێویست هەموو ئامادەبن بە قۆچەقانی و کەوانەکانیانەوە تیرەکانیان تەنگە بدەن و ساز بن چونکە دەبێ لەگەلّ ئاماژەکە هەموو پێکەوە بەرد و تیرەکان بهاوێن. بە تیپە سووکەکانیشی گوت گیرفانیان پڕ بکەن لە بەرد هەروەها خەلّکی جێ باوەڕ بنێرن تا فەرمانەکان بەباشی رابگەیێنن بۆ ئەوەی بەباشی جێبەجێ بکرێن.

کاپتن و یاوەرەکان سازبوون، هەروەها ئەوانەی کە خۆیان بە فەرماندەی هەنووکەیی دەزانی هەموو لەشوێنی خۆیان دامەزران. لەراستیشدا هەموو بەرانبەر یەك وەستابوون چونکە بەهۆی سروشتی زەویەکە شیوەی نیوەبازنەیان وەرگرتبوو. ئینجا سروودی پایان خویندرا و شەیپووری هێرش ژەنرا، هۆپلیتەکان نەعرەتەی شەڕیان بەرز کردەوە و هێرش کرا، بەم شیوە هەموو تیر و بەردەکان پێکەوە هاوێژران، تیر و رمب و بەردی قۆچەقانی پێکەوە. زۆریشیان هەر بەدەست هاوێژران وێڕای تیری ئاگردار کەوا هەندێك کەس لەهێرشدا بەکاریان دەهێنن. لەژێر ئەو قورساییەدا دوژمن سەنگەر و بورجەکانی چۆل کرد، ئەمەش دەرفەتی بۆ ئاگسیاسی ستیمفالی

ڕەخساند، زرێکەی داکەند و تەنیا بە پەلەگەوە پێهەلگەڕا، ئینجا خەڵکی تر پێهەلگەڕان و یارمەتی یەکتریان دا تا شوێنەکە گیرا. پەلتاست و پیادە سووکەکان بەپەلە خۆیان تێکرد و هەرکەس پەلاماری کالایەکی دا، بەلام زینۆفۆن لەدەرێ وەستا و تا پێی کرا هۆپلیتی لەگەلێ خۆی هێشتەوە کەوا هەندێك تاقمی دوژمن لەسەر بەرزاییەکان دیاربوون دەهاتنە پێش[1].

هەندەی نەبرد دەنگەدەنگ لە ژوورێ هەستا و خەڵك هەلاتن بۆ دەرێ. هەندێکیان تالانیان هەلگرتبوو، هەندێکیشیان بریندار ببوون، ئەوجار گرمەی هەرەسێك هات، لەوەلامی پرسیاردا گوتیان بورجێك لەژوورێ مابوو سەربازەکان پێی هەلدەگران و هێزێکی دوژمنی تێدابوو، ئەو بورجە بەسەر پیاوەکاندا ڕما.

ئینجا زینۆفۆن فەرمانی بە تۆلمیدیس دا کە ئەوەی بۆ تالان دەچێتە ژوور با بچێت. خەلکێك پالەپەستۆیان خستە سەر ئەوانەی کە بۆ دەرەوە ڕایان دەکرد، دیسان دوژمنیان لە قەلاتەکە گەمارۆ دا، هەرچی لەدەرەوەی قەلاتەکە بوو تالان و برۆ کرا. هۆپلیتەکان ڕیزیان بەست، هەندێك لەلای دەروازەکە و هەندێکیش لەلای قەلاتەکە، زینۆفۆن و کاپتنەکان بیریان کردەوە ئایا دەتوانن قەلاتەکە بگرن؟ ئەگەر گیرابایە ئەمە وای دەگەیاند کە دکرا بە سەلامەتی بکشێنەوە دەنا ئیشەکە زۆر سەخت دەبوو، پاش تێروانینێك گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە قەلاتەکەیان پێ ناگیرێت و دەبێ بکشێنەوە.

هەر کەس سەنگەرێکی بۆ خۆی دروست کرد، ئەوانەی تالانیان پێ بوو کەلکی شەڕیان نەبوو، لەگەلێ زۆربەی هۆپلیتەکان ناردرانەوە بۆ دوا. هەریەك لە کاپتنەکان پیاوی جێباوەڕی خۆی هێشتەوە. کە دەستیان بە کشانەوە کرد ژمارەیەك لە دوژمن بە ڕمب و قەلغان و خوودەی پافلاگۆنی لە قەلاتەکەوە هێرشیان کرد. هەندێکیشیان چوونە سەربانەکانی ئەمبەر ئەوبەری ڕێگا، ئیتر کەلکی ئەوە نەما کە تەنانەت بە دەروازەکەشدا پالیان پێوە بنێن چونکە کۆلکە داری زلیان بۆ خوارێ ڕاکێشا، بەوەش وای لێ هات کشانەوە و مانەوەیان وەکو یەك بوو. هەروەها تاریك دادەهات ئەمەش مەترسیەکەی گەورەتر دەکرد.

---

[1] وەك بلێی پاکانە بۆ خۆی دەکات کەوا لە تاکە شەڕێکیشدا ڕاستەوخۆ بەشدار نەبووە.

بەلام هەرچۆنێك بێت، لەو کاتەی کە هێشتا شەڕیان دەکرد هەندێك خواوەند ڕێگایەکیان پێشان دان، یەك لە خانوەکانی لای دەستە ڕاست، ئەگەر لەخۆڕا بووبێت یان بەدەستی کەسێکەوە، لەپڕ ئاگری تێبەربوو. کە خانوەکە ڕما دوژمن ریزە خانوەکانی دەستە ڕاستیان چۆڵ کرد. زینۆفۆن خۆی بەخت دیتی و فەرمانی دا ئاگر لە خانوەکانی لای چەپیش بەردەن، ئەوانەش لە دار دروست کرابوون و هەر زوو ئاگریان گرت.

ئێستا تاکە هێزێکی دوژمن کە تواناى گێچەڵی مابوبێت ئەوانەی پێشەوە بوون، دیاریش بوو نیازیان هەیە بەرەو دەرێ و بەروە تەلانە قوڵەکە پاڵیان بدەن. زینۆفۆن فەرمانی دا ئەوانەی مەودای تیر و بەرد نایانگرێتەوە بەزووترین کات دار و چیلکە بخەنە نێوان خۆیان و دوژمن. کە دارەکان کەڵەکە کران ئەوسا ئاگر لەوانە و لەخانوەکانی سەر تەلانەکەش بەردا بە ئومێدی ئەوەی کە دوژمن پێیان بشێوێت. بەم جۆرە توانیان بەشێوەیەکی سەخت بکشێنەوە لەسایەی ئەم ئاگرەی نێوان خۆیان و دوژمن. هەموو شارەکە سووتا و تەخت بوو، خانوو و بورجەکان و سەنگەرەکان، تەنیا قەڵاتەکە نەبێت.

ڕۆژی دووەم یۆنانیەکان گەڕانەوە دەسکەوتەکانیان لەگەڵ خۆ برد. ڕێگای تراپازۆس تەسك و لێژ بوو، بەترسەوە پێدا ڕۆیشتن واشیان نواند گوایە بۆسەیان بۆ دوژمن ناوەتەوە. یەکی میسیایی هەبوو بەناوی میسۆس ١٠ کریتیی لەگەڵ خۆی بردە دارستانێك وای نواند گوایە خۆی لە دوژمن مات کردووە، قەڵغانەکانیان لە (بڕاس) دروست کرابوو، وا دانران کە بتریسکێنەوە و دوژمن بیبینێت. دوژمن وا تێدەگەیشتن بۆتەیان داناوەتەوە، ئیتر یۆنانیەکان بە ڕێی خۆیان شۆڕبوونەوە. کە زینۆفۆن هەستی کرد وا دوور کەوتوونەوە ئیشارەتی بە میسۆس دا کە خێرا بکشێتەوە، میسوس بە خۆ و بە پیاوەکانیەوە تێانتەقاند، کریتیەکانی کە هەستیان کرد بەجێ ماون لەڕێگاکەوە پازیان دایە نێو دارستان و بەتەقڵە و بە ڕاکردن دەرباز بوون، میسیەکەی کە بە ڕێگاکەدا هەڵدەهات، هاواری کرد و سەربازەکان فریای کەوتن و بەبریندارى هێنایانەوە. ئینجا ئیبی فریاکەوتن هەنگاو بە هەنگاو کشانەوە و تیرەندازەکانیان پشتاوپشت تیریان لە دوژمن دەگرت، ئیتر ئەوها هەموو گەڕانەوە بۆ ئۆردەگا.

## چاپتەر -٣-
# یۆنانییەکان گەیشتنە ترابەزۆس

خیریسیفۆس نەگەڕایەوە و کەشتیەکان هەندە نەدەبوون و نەدەکرا زۆرتر بمێنن. گەیشتنە باوەڕێك کە دەبێ ترابازۆس بەجێ بهێڵن. ژن و منداڵ و پیاوەکانی لە سەرووی چل ساڵیدا و بریندارەکان و هەموو بارێکی ناپێویست خرانە نێو کەشتیەکان، و تێکڕای ئەوانی دیکە بە ڕێگای زەویدا ڕۆیشتن کەوا ئێستا ڕێگاکانیش چاك کرابوونەوە.

پاش سێ ڕۆژ گەیشتنە سێراسۆس Cerasus، شارێکی یۆنانی بوو لەسەر دەریا و کۆلۆنییەکی سەر بە سینۆپ بوو لە وڵاتی کۆڵخیەکاندا، ١٠ ڕۆژ لەوێ مانەوە. سەرژمێری چەکدارەکان کرا، ٨٦٠٠ کەس بوون، ئەوانەی دیکە یان کوژرابوون یان ئەوەتا بە بەفر و نەخۆشی مردبوون.

لەم جیگەدا پارەیان بەش کرد، ئەو پارەی کە بە فرۆشتنی ئەسیرەکان دەستیان کەوتبوو. جەنەراڵەکان بۆ مەبەستی ئاینی ١٠٪ پارەکەیان بۆ خێری ئەپۆلۆ و ئەرتەمیسی ئەمنۆس جودا کردەوە. ئینجا هەر جەنەراڵێك ١٠٪ ی وەرگرت. نیۆنی ئاسین بەشی خیریسۆفۆسی وەرگرت.[1]

---

[1] لێرەدا زینۆفۆن باسی ڕۆژەکانی پاش هەڵمەتەکە دەکات کە گەڕاوەتەوە بۆ یۆنان و ماڵ و حاڵێکی بۆخۆی پێك هێناوە. من بەباشم زانی کە بخرێتە بەشی کۆتایی.

## چاپتەر -٤-
# مۆسینۆیکییە دڕندەکان

لە سیراسۆس هەمان خەڵکی پێشو لەگەشتە دەریاییەکە بەردەوام بوون، ئەوانی دیکە بە ڕێی زەمینیدا ڕۆیشتن. کە گەیشتنە سنووری مۆسینۆیکی Mossynoici ئەوسا تیماسیتیۆس، کە لە خەڵکە ناوچەییەکانی ترابازۆس بوو و پێوەندیی دیپلۆماسیی لەگەڵ مۆسینۆیکی هەبوو، ناردیان بزانێت ئایا دەهێڵن بە ئاشتیانە بە وڵاتەکەدا بڕۆن؟ مۆسینۆیکیەکان، پشتئەستوور بە ناوچە سەختەکەیان، وەڵامیان ئەمە بوو کە ڕێگا بە یۆنانیەکان نادەن.

ئەمجارە تیماسیتیۆس بە یۆنانیەکانی گوت مۆسینۆیکی هەن لەولاتر لەگەڵ مۆسینۆیەکانی ئێرە لە جەنگ دان و بڕیار درا بەدوایاندا بنێرن تا بزانن ئایا ئامادەن هاوپەیمانێتیان بکەن؟ تیماسیتیۆس پێوەندی لەگەڵدا کردن و لەگەڵ ئاغاکانیان هاتەوە و جەنەراڵەکان لەگەڵیان کۆبوونەوە. زینۆفۆن و تیماسیتیۆس کە تەرجەمەی دەکرد ئەم قسانەی کرد:

برادەرە مۆسینۆیکییەکانم، ئێمە کە کەشتیمان دەست نەکەوتووە، دەمانەوێ بە ئاسوودەیی بگەڕێینەوە بۆ یۆنان و ئەو خەڵکەی ئێرە کە دوژمنتانن ڕێگایان لە ئێمە گرتووە، جا لێوە دەتوانن بمانکەن بە هاوپەیمان و تۆڵەی زیانەکانی خۆتان لەوانە بکەنەوە و بۆ پاشەڕۆژ لەژێر دەستی خۆتان بن. ئەگەر ئەم دەرفەتەتان لەدەست بچێت، ئایا بیر لەوە ناکەنەوە دەرفەتی ئەوها هەڵ ناکەوێتەوە هێزێکی ئەوها گەورەتان دەست بکەوێت؟

ئاغای مۆسینۆیکی وەڵامی دایەوە کە ئەوان بەخێرهاتنی ئەم پێشنیازە دەکەن و هاوپەیمانێتیش پەسند دەکەن.

زینۆفۆن گوتی: زۆر باشە، ئێستا پێمان بڵێن چۆن سوود لە ئێمە وەردەگرن و چ یارمەتیەکمان دەدەن کەوا بێرەدا ڕەت بین؟

گوتیان ئێمە هێزمان ئامادەیە کە هێرش بکاتە سەر بەرەی خۆرئاوای دوژمن. دەشتوانین کەشتی بۆ ئێوە پەیدا بکەین و هێزێکیش بنێرین تا پێتان بڵێن پەلاماری کوێ بدەن و لەریزی ئێوەشدا شەڕ بکەن.

لەسەر ئەم مەرجانە رێك کەوتن و بەڵێنیان لەگەڵ یەکتر گۆڕیەوە، ئینجا ئاغاکان رۆیشتن. رۆژی دواتر بە ٣٠٠ بەلەم هاتنەوە، جۆرە بەلەمێك بوون لە قەدە داری کوڵدراو دروست کرابوون. هەر بەلەمێك سێ کەسی تێدا بوو، دوو کەس بەچەکەوە دادەبەزین و ریزیان دەبەست، یەکێکیشیان بەبەلەمەکە دەگەڕایەوە. چەکدارەکان بەم جۆرە وەستان، ریزی ١٠٠ کەسییان بەست هەر ریزێك رووی لە ریزەکەی بەرانبەر خۆی کردبوو وەك بلێی بۆ سەما وەستاون. قەڵغانیان پێبوو لەسەر شێوەی گەڵا کە لە کەوڵە گای توکنی سپی دروست کرابوون. رمبی یەك چوکڵەیان هەبوو هەر یەك نۆ پێ درێژ بوون و بە دەستی چەپ تەبەری ئاسن یاخۆ کوتەکی سەڵك خڕیان پێبوو بە دەسکەوە لە یەك پارچە دار دروست کرابوون. پەلەگە کورتەکانیان نەدەگەیشتنە ئەژنۆیان، بەرگیشیان لە تەلیسی کەتان ئەستورتر بوو. خودەکانیشیان لە چەرمە گا دروست کرابوون بەشێوازی پافلاگۆنی توکن بوون و دەزو خورییان لە دەوردا چنرابوو شێوەی تارایان دەکرد.

ئینجا یەکیان پێش کەوت و ئەوانی دیکە بەسرروودەوە بەداوی کەوتن. بەنێو هۆپلیتە یۆنانیەکاندا رۆیشتن و روویان لە سەنگەرەکانی دوژمن کرد بۆ هەندێك شوێنی کە دیار بوو گرتنیان ئاسانە. ئەم سەنگەر و دیوارانە لە قەراغ شارێك دروست کرابوون کە بە پایتەختیان دەزانی و لە بەرزترین ناوچەی مۆسینۆیکیەکاندا بوو. شار و قەڵاتەکان هۆی جەنگی نێوان ئەم دوو تاقمە بوو کەوا ئەوەی کۆنترۆلی کردبایە بە حوکمڕانی ناوچەکە دەزانرا. جا ئەم بەشەی کە ببوونە هاوپەیمانی یۆنانیەکان دەیانگوت کە ئەوانی دیکە ئەو مافەیان نیە کۆنترۆلی بکەن، دەبایە لەگەڵیان بەش بکرێت کەچی ئەوان دەستیان بەسەردا گرتووە و قازانجی نارەوای لێ دەکەن.

جا ئێستا هەندێك یۆنانی بەبێ فەرمانی ئەفسەرەکان بۆ تاڵانکاری بەدوایان کەوتن. ماوەیەکی زۆر بەریوە بوون، دوژمن جوولەیان نەکرد کەچی کە نزیك بوونەوە هێرشیان کرد و بەزاندیان. ژمارەیەك لە ناوچەییەکان و هەندێك یۆنانی کوژران و بەدوایان کەوتن تا نزیك،

لەوسا گەڕانەوە شوێنی خۆیان. سەری کوژراوەکانیان بڕی و هەڵیان واسین تا یۆنانیەکان و دوژمنەکانیان بترسن. ستڕانیکیشایان پێکەوە دەگوت.

یۆنانیەکان بەمە زۆر بێزار بوون. ئەم هێرشە وڕەی دوژمنی بەرز کردەوە و ئەوانەی کە رەگەلیان کەوتن شکستیان خوارد، ژمارەشیان کەم نەبوو، ئەمە یەکەم جار بوو بەدرێژایی گەشتەکە رووداوی لەوها بەسەر یۆنانیەکاندا بێت. زینۆفۆن کۆیکردنەوە و ئەم قسانەی کرد:

سەربازان، ورەتان بەم رووداوە دانەبەزێت، کۆمەلێک قازانج و زیان بە ئێمە گەیشت. یەکەم، بۆمان مسۆگەر بوو کە ئەم تاقمە دوژمنێکی راستەقینەن و ئەوانی دیکە هاوپەیمانن. دووەم، ئەوانەی کە بە بێباکی رەگەڵیان کەوتن وایان دەزانی لەگەڵ ناوچەییەکان دەتوانن سەرکەوتوو بن، بەلاّم دیتمان چ دەرسێك فێر بوون و لە ئایندەدا لەخۆڕا رەگەڵ کەس ناکەون. ئەوەی کە دەبێ ئێستا پێڕەوی بکەن ئەمەیە کە دەبێ بەجۆریك خۆ کۆنترۆل بکەن، دۆست و دژمن تێبگەن کە لەوان پیاوترن و کەوا ئەمجارە بەرەنگاری جۆرە خەلکێکی دیکە دەبنەوە.

ئەو رۆژە وەکو خۆیان مانەوە، رۆژی دواتر قوربانیان کرد و نیشانەکان باش بوون. نانیان خوارد و ریزی درێژیان بەست، چەکدارە ناوچەییەکانیشیان بەهەمان شێوە لەلای چەپیان ریز بوون، تیرەندازەکانیش لەنێوەڕاستدا. لەپاش وان بەماوەیەکی نزیك هۆپلیتەکان دەرۆیشتن، چونکە دوژمن هەندێك پیادەی سووکیان هەبوو دەهاتە خوارێ بەردیان دەهاویشت و دەکشانەوە، پەلتاست و تیرەندازەکان ئەوانەیان بەرپەرچ دایەوە، لەشکرەکەش بەرێکی پێش دەکەوت.

سەرەتا روویان کردە ئەو شوێنەی دوێنێ چونکە دوژمن خۆیان لەوێدا کۆکردبۆوە. دوژمن خۆیان بەرانبەر پەلتاستەکان راگرت بەلاّم کە هۆپلیتەکان نزیك بوونەوە دوژمن بەرەو شارەکەیان هەلاّتن و هۆپلیتەکان ریێوانی ریکوپێك راویان نان. هەورازەکەیان بڕی و گەیشتنە قەراغ شارەکە، دوژمن هێرشیان کرد، تیر و رمبیان هاویشت، رمبەکان هەندە گەورە بوون کە بەحاڵ هەڵدەگیران. دەیانویست بە شەڕی نزیك یۆنانیەکان بوەستێنن کەچی یۆنانی نەوەستان و لێیان چونە سەرتر، ئەوسا ئەوێشیان چۆل کرد. پاشاکەیان لەسەر بورجێکی دارین بوو، نە خۆی و نە ئەوانەی سەنگەریان گرتبوو جێگەیان چۆل دەکرد، ئیتر بە خۆ و بە بورجەوە سوتێندران.

لە تالآنکاریدا یۆنانیەکان خانوویان دیتەوە پڕ لە نانە ئەستوورك گوتیان نانەکان لە گەنمی ساڵی پێشوو و لە دەرەی ئەمساڵ دروست کرابوون، دەرەکە بەزۆری دەرەی درشت بوو. هەروەها قاورمەی گۆشت دۆلفین بە روونی دۆلفین لەگۆزە کرابوون، مۆسینۆیکی ئەم روونە لەباتی زەیتی زەیتون بەکار دێنن. کەستانەی دنك گەورە و قەپێلك لووس بە کۆمەڵی گەورە دانرابوون، کەستانەیان بەهەموو جۆرێك بەکار دەهێنا، دەهاڕدران و دەبوونە نان، دەکوڵران و دەخوران. هەروەها شەراب دۆزرایەوە کە بەبێ ئاو زۆر تاڵ بوو بەلآم ئەگەر ئاوی تێکرابایە ئەوسا بۆن و چێژێکی خۆشی دەبوو.

یۆنانی لەوێدا جەمێکیان خوارد و دیسان بەڕێ کەوتن و بەنێو ئەو مۆسینۆیکیانەدا تێپەڕین کە هاوپەیمانیان بوون، بەچەند شارۆچکەیەکدا رۆیشتن کە لایەنگری دوژمنەکانیان بوون و بەئاسانی داگیر دەکران، خەڵکەکە یان چۆلیان دەکرد یان ئەوتا خێرا بەرەو پیری یۆنانیەکان دەهاتن. ماوەی نێوان هەر شار و شارێك هەشت فەرسەخ دەبوو، واش هەر بە هاوار گوێیان لەدەنگی یەکتر دەبوو چونکە ولآتەکەیان شاخاوی و پڕ لە دۆل بوو.

کە یۆنانیەکان زیاتر رۆیشتن و گەیشتنە ناوچەی هاوپەیمانەکانیان، هەندێك کوڕیان پێشان دان کە لە چینی دەولەمەندەکان بوون، ئەو کوڕە دەولەمەندانە بەجۆریکی تایبەتی قەلەو دەکران، کەستانەی گولآویان دەرخوارد دەدان، چەندە درێژ بوون هەندەش پان بوون، پاش و پێشیان بەرەنگی گەش و بە نەخشی گوڵ کوترابوو. داوایان کرد کە ئەم کوڕانە لەبەر چاوی خەڵکەکە کاری جینسی لەگەڵ ئەو ئافرەتانە بکەن کە لەگەڵ یۆنانیەکاندا بوون، ئەمەش نەریتێکی ئاسایی خۆیان بوو.

ژن و پیاویان رەنگێکی زۆر کاڵیان هەبوو، ئەوانەی کە لەگەل هەڵمەتەکەدا بوون دەیانگوت ئەو خەڵکە لە هەموو خەڵکێك دواکەوتووتر بوون و لەچاو هەموو ئەوانەی کە تووشیان ببوون رەوشتیان لە رەوشتی یۆنانیەکان دوورتر بوو. لەنێو قەرەباڵغاییدا، پیاوەکانیان بەجۆرێك رەفتاریان دەکرد وەك بلێی بەتەنیان، کەچی کە بەتەنیا دەبوون ئەوسا وەك بلێی لەنێو خەڵکدان ئەوها دەجوولآنەوە. قسەیان لەگەل خۆ دەکرد و رادەوەستان و لەهەر شوێنێك بایە سەمایان دەکرد وەك ئەوە بوو خۆیان بۆ خەڵکی دیار بخەن.

## چاپتەر -٥-
## زینۆفۆن لەبری لەشکرەکە دەدوێت

یۆنانی هەشت رۆژ بە ولاتەکەدا رۆیشتن بەهەردووك بەشەوە، بەشی دۆستەکان و بەشی دوژمنەکان، تا گەیشتنە ولاتی خالبی. ئەوانە هۆزێکی بچووکن لەژێر دەستی مۆسینۆیکی دان زۆربەیان ئاسنگەری دەکەن.

پاش ئەمە گەیشتنە تیبارینی، ئەوانە ولاتەکەیان پەلترە و شارۆچکەیان لەسەر دەریا زۆر بوو هەندەش پاریزراو نەبوون. جەنەرالەکان ویستیان پەلاماری بدەن بۆیە دیاریەکانی تیبارینیەکانیان رەت دەکردەوە و پیان دەگوتن چاوەڕێ بن تا بیری لێ دەکەینەوە. قوربانیەکیان کرد و ژمارەیەك ئاژەڵیان کوشتەوە بەلام تێکرای فالگرەکان گوتیان خواوەندەکان لەگەڵ شەڕدا نین، ئەوسا دیاریەکانیان وەرگرت و بەرێی خۆیان دوو رۆژ بە ئاشتییانە رۆیشتن تاگەیشتنە کۆتیۆرا، شاریکی یۆنانیە و کۆلۆنیەکی سینۆپە لەخاکی تیبارینیدا Tibareni.

لەوێ ٤٥ رۆژ مانەوە، سەرەتا قوربانیان پێشکەش کرد بۆ خواوەندەکان و پارادێکیان کرد، هەر تاقمە و بەگوێرەی نەریتی خۆیان و، پێشبڕکەی وەرزشی کرا. خۆراکیان هەندێك لە پافلاگۆنیا و هەندێکیش لە خەلکی کۆتیۆرا وەردەگرت چونکە ریگەیان نەدەدا خۆراك بکڕن تەنانەت رێگای نەخۆشەکانیان نەدەدا بۆ نێو شار. لەم کاتەدا نامەبەرێك لە سینۆپەوە هات، ئەوانە لەبەر شاری کۆتیۆرا سەغلەت ببوون (کەوا ملکی خۆیان بوو باجیان دەدانێ) هەروەها لەبەر زەوی و زارەکان کەوا بیستبویان ویران دەکرێن، هاتنە نێو ئۆردوگا و هیکاتۆنیمۆس کە بێژەرێکی ناودار بوو، ئەم قسانەی کرد: ساربازان، شاری سینۆپ ئێمەیان نارد پیرۆزبایتان لێ بکەین چونکە ئێوە یۆنانین و بێگانەتان بەزاندووە. شادمانیی خۆمان دەردەبرین کەوا پاش ئەو هەموو دەردەسەریە بە سەلامەتی هاتوونەوە، بەلام ئێوە کە یۆنانین لێتان رادەبینین بە چاکە رەفتار بکەن و زیان بە ئێمە نەگەیێنن. خەلکی کۆتیۆرا خەلکی کۆلۆنیەکی خۆمانن و لێرە نیشتەجێن

و ئێمە زەویەکەمان لە خەڵکە ناوچەییەکان ستاندووە بۆ وان و بەچەشنی خەڵکی سیراسۆس و تراپازۆس باج دەدەن بۆیە هەر زیانێك بەوان بگات، خەڵکی سینۆپ بە زیانی خۆیانی دەزانن. بیستومانە هەندێکتان بەتۆبزی چوونەتە نێو شارەکە و بنکەتان داناوە و شمەك لە خەڵکەکە دەستێنن. ئەم رەفتارانە بە رەوا نازانین و ئەگەر بەردەوام بن ناچار دەبین هاوپەیمانەتی لەگەل کۆریلاس Corylas و پافلاگۆنیەکان و خەڵکی دیکەش بکەین.

ئەوسا زینۆفۆن هەستا وەلامی لەشکرەکە بداتەوە: پیاوانی سینۆپ، ئێمە کەوا بە پێست و پەلی خۆمان گەیشتینە ئێرە، لەراستیدا پێمان نەکرا شەری دوژمن بکەین و تالآنەکانیش بێنینەوە، جا کە گەیشتینە تراپازۆس، ئەوان رێگایان بۆ ئێمە خۆش کرد، خۆراکیان دەدا و ئێمەش پارەمان دەدا، ئێمە چاکەشمان کرد کەوا لەبەرانبەر ئەو رێز و دیاریانەدا دەستمان لەهیچ هۆزێکی هاوپەیمانی وان نەدا، تەنانەت زیانمان بە دوژمنەکانیان گەیاند. لێیان بپرسن ئێمە چ پیاوێك بووین، دەتوانن لە ریبانسەکان بپرسن کەوا خەڵکی وێن. بەلأم کە دەگەینە شوێنێك کە نەهێلن خۆراك پەیدا بکەین ئەوسا ئەگەر یۆنانی بن یان ناوچەیی ئێمە هەر دەبێ خۆراك پەیدا بکەین، لەبەر هیچ نا لەبەر ناچاری. ماکرۆنیەکان ناوچەیی بوون واش هەر بە برادەرمان زانین کەوا دەرفەتیان دەداین و ئێمەش هەرگیز دەستمان لە شتی وان نەدا.

سەبارەت بەخەڵکی کۆتیۆرا، ئێمە ئەگەر شتێکمان لەوان کردبێت ئەوە هەڵەی خۆیانە، دەروازەیان لە رووی ئێمە داخست و نەهێشتیان بچینە نێو شار و نە هیشتیان لە دەوری شار خۆراك بکرین، گوتیان ئەوەی لەم شتەدا بەرپرسە حوکمرانی شارەکەیانە کە سینۆپی دایناوە. سەبارەت بەم قسەش کە دەڵێن بەتۆبزی چووینەتە نێو شار و لەوێ دامەزراوین، راستیەکە ئەمانەن. ئێمە داوامان کرد نەخۆشەکان لای خۆیان دابنێن، کە ئەمەیان نەکرد، ئێمە رێگایەکمان دۆزیەوە و چووینە ژوور و دەستمان لەکەس نەدا. نەخۆشەکان بە پارەی خۆیان لە ماڵێك دانراون و لەبەر حاکمەکە پاسەوانمان بۆ دانان. بەلأم ئەگەر بەمە رازی نین، ئێمە بانگیان دەکەینەوە بۆ لای خۆمان کەو لەم دەشتە ماوین. سەبارەت بەو هەرەشەی کە تۆ کردت کە هاوپەیمانێتی لەگەل کۆرلیاس و پافلاگۆنیادا دەکەن، ئێمە ئەگەر ناچار بین ئامادەین شەری ئێوە

وئەوانیش بکەین. ئێمە شەڕی دوژمنی لەئێوە زۆر گەورەترمان کردووە، لەلایەکی دیکەوە ئەگەر ئێمە هاوپەیمانێتی لەگەڵ پاشای پافلاگۆنیا بکەن (بیستوشمانە کە پلانی خۆی بۆ ئەم شارانەی سەر دەریا هەیە) ئێمە هەوڵ دەدەین ببینە برادەری وی بۆ ئەوەی ئامانجەکانی بەدی بێنێت.

شاندەکە ئەم قسانە قەڵس بوون و یەکیان هاتە پێش و گوتی: ئێمە بۆ هەڵگیرساندنی جەنگ نەهاتوین بەڵکو بۆ برادەرایەتی. گوتیشی: ئەگەر بێن بۆ سینۆپ بە دیاریی برادەرانە پێشوازیتان دەکەین. ئێستاش با خەڵکەکە بەگوێرەی توانا شتتان بدەنێ، ئێمە دەزانین کە قسەکانتان راستن.

پاش ئەمە خەڵکی کۆتیۆرا دیاریان نارد و جەنراڵەکان مێواندارى شاندەکەی سینۆپیان کرد. قسەی برادەرانە کران و پرسیاریان لەیەکتر کرد کە چ شتێك بۆ پاشماوەی گەشتەکە پێویستە؟

## چاپتەر -٦-
## زینۆفۆن شاریك دەدۆزیتەوە

ئەو رۆژە ئەوها کۆتایی هات، رۆژی پاشی بریار درا کۆبوونەوە بە پیاوانی سینۆپ بکەن تا باسی گەشتەکە بکەن، ئەگەر بە زەویدا رۆیشتبان وا پێ دەچوو خەڵکی سینۆپ بەکەڵکیان بێن چونکە شارەزای پافلاگۆنیا بوون، وە ئەگەر بە دەریادا رۆیشتبان دیسان پێویستیان بە یارمەتی وان دەبوو چونکە هەندە کەشتیان نەبوو بای لەشکرەکە، جا باڵوێزەکەیان بانگ کرد تا ئامۆژگاری بدات و پێیان گوت کەوا بۆیە باوەڕی پێ دەکەن چونکە ئەوانیش لە نەتەوەی یۆنانین و باوەڕی پێدەکەن.

ئینجا هیکاتۆنیمۆس هەستا و پێشێ داوای لێبوردنی کرد کەوا گوتبوی هاوپەیمانەتی لەگەڵ پافلاگۆنیەکاندا دەکات. گوتی مەبەستی نەبوو جەنگ دژبە یۆنانی بکات بەڵکو دەتوانن برادەرایەتی هەموو لایەك بکەن و هەرچۆنێك بێت هەر لای یۆنانیەکان دەگرن. کە پرسیاریان لێ کرد ئامۆژگارییان بکات، ئەم قسانەی کرد: پاش نەوازش بۆ خواوەندەکان، ئەگەر ئامۆژگاریتان بکەم دوعا دەکەم چاکەم بنوسرێت. ئەگەر نا، دەبا تووشی ئەو شتە بم کە پێی دەڵێن (کۆڕ دەنگ). دیارە ئێرەش ئەم کۆڕەیە کە باس کراوە([1]). ئەگەر ئامۆژگاریەکەم باش بوو، مەدحێکی زۆرم بۆ دێت و ئەگەرنا، لەعنەت. ئێستا ئاگادارن کە ئەگەر بەدەریادا برۆن کێشەمان زۆرتر دەبێت چونکە دەبێ کەشتی دابین بکەن. بەڵام ئەگەر بەزەویدا برۆن ئەوسا دەبێ بەشەڕ برۆن، واش هەر پێویستە هەندێك راستی دەربارەی سروشت و دەرامەتەکانی پافلاگۆنیا باس بکەم. ئەم وڵاتە جوانترین دەشتایی و بەرزیترین چیای هەیە، ناچار دەبن هەندێك بەشی داگیری بکەن. تاکە رێگاییەك هەبێت رێگای لوتکە چیاکانە کە لەمبەر لەوبەری ریگەتانن، ئەوانە بە هێزێکی بچووك دەگیرێن و هەموو هێزی جیهان ناتوانن لەبن دەستتانی دەر بینێت. ئەگەر باوەڕ ناکەن، حەز

---

[1] وەرگێڕ ئەمەی نوسیوە Counsel is sound دیارە دەقاودەقی گوتەیەکی یۆنانی کۆن تەرجەمە کراوەتەوە. رەنگە بەواتای ئەم بێت کە (راستی لەنێو خەڵکدا بزر نابێت) یان شتێکی ئەوها!

دەکەن خەڵکم لەگەڵدا بنێرن تا پێشانیان بدەم. پاش ئەم گرفتە گرفتی هێزی سوارەیان دێت کە لە دەشتەکاندا خۆیان بە هاوتای سوارەکانی شا دەزانن. هەر لەم دواییانەدا شا داوای کردن کەچی رابەرەکەیان دەعیەی نەهات بچێت، جا ئەگەر بتوانن دزە بۆ چیاکان بکەن و دەربندەکە پێش دەوژمن بگرن و ئەگەر لەدەشتدا دوژمن ببەزێنن کەوا نەك هەر بەرەنگاری سوارەکانیان بن بەڵکو بەرەنگاری ۱۲۰,۰۰۰ پیادەش ببنەوە، ئەوسا دەگەنە رووبارەکان.

یەکەمیان تەرمۆدۆن ۳۰۰ پێیە و بەئاسانی لێی ناپەرینەوە، بەتایبەتیش ئەگەر هێزێك لەوبەر بن و هێزێکی گەورەتر بەدواتانەوە بن. لینجا ئیریس ئەویش ۳۰۰ پێ بەرینە. رووباری سێیەم، خالیس، چارکە فەرسەخێك بەرینە و بەبێ بەلەم لێی ناپەرنەوە، جا کێ بەلەمتان بۆ دابین دەکات؟ پەرینەوەی پارتینیۆسیش هەر سەختە، ئەو رووبارەش تەنیا پاش پەرینەوەی خالیس ئینجا مەگەر بیگەنێ. بەرای من گەشتەکە شتێکی نەبوودە نیە و ئەگەر بە دەریادا برۆن دەتوانین بەدرێژایی لێوارەکە لێ بخورن تا سینۆپ، و لە سینۆپ بۆ هیراکلیا، ئیتر گرفتێك نامێنێت چونکە لە هیراکلیا کەشتی زۆن.

لە کۆتایی ئەم گوتارە هەندێك خەڵك لێی بەگومان کەوتن کەوا لەبەر کۆریلاس وا دەڵێ چونکە پێوەندیەکی رەسمیان هەیە. هەندێکی دیکە باوەڕیان وابوو پارەی دراوەتێ تا ئەم قسانە بکات، هەندێکیش گومانیان ئەمەبوو کە دەیەوێ زیان بە سینۆپ نەگا. هەرچۆنێك بێت یۆنانی دەنگیان بۆ رێگای دەریایی دا.

پاش ئەمە زینۆفۆن ئەم قسانەی کرد: پیاوانی سینۆپ، لەشکر ئەو رێگای هەڵبژارد کە ئێوە راتانسپارد، ئێستاش بارەکە بەم جۆرەیە. ئەگەر کەشتی بای هەر هەمووان پەیدا بن، ئێمە بەدەریادا دەرۆین. بەڵام ئەگەر هەندێك بەجێ بمێنن، ئێمە سواری کەشتیەکان نابین. ئێمە دەزانین ئەگەر هێزمان یەك بێت ئەوسا ژیانمان دەپارێزین و خۆراکیش پەیدا دەکەین، دەنا بەبێ باڵادەستی ئەوسا لە یەخسیری بەولاوە هیچمان بۆ نابێت.

کە باڵوێزەکە ئەمەی بیست داوای کرد نوێنەرێك بۆ سینۆپ بنێرن. کالمیاخۆس، یەکی ئەرکادی بوو و ئەریستۆن، ئەتینی بوو و سامۆلاس، ئاخەیی بوو، چوون بۆ سینۆپ.

زینۆفۆن بەژمارەی هۆپلیت و پەلتاست و تیرەنداز و بەردهاوێژ و سوارەکاندا هاتەوە، ئێستا پاش ئەو هەموو شارەزاییە و کە لەوپەڕی توانا دان، ئەمەی رەچاو کرد کەوا ئەوان لە یۆکسینیا بوون و کەوا هێزێکی ئەوها زل بەبێ پارەیەکی یەکجار زۆر کۆ نابێتەوە. بیری کردەوە کە شارێك بدۆزێتەوە تا ملك و توانایەکی زۆرتر بۆ یۆنان پەیدا بکات. شارەکە دەبێتە شارێکی مەزن بە رەچاوکردنی ژمارەی یۆنانیەکان و ژمارەی خەلکی یۆکسین. بەم نیازەوە بەبێ ئەوەی بۆ کەسی بدرکێنێت قوربانیەکی کردە خێر، سیلانۆسی ئەمبراکیای بانگ کرد کە فالگری کۆرووش بوو، بەلام لەترسی ئەوەی کە لەوێ بمینن، سیلانۆس قسەیەکی بلاو کردەوە گوایە زینۆفۆن دەیەوێ لەشکر لەوێ بمێنن و دەیەوێ شارێك بدۆزێتەوە تا دەسەلات و ناوبانگ بۆخۆی پەیدا بکات.

سیلانۆس دەیویست زوو بگەڕێتەوە بۆ یۆنان چونکە لەو ٣٠٠ داریکەی مابوو کە کۆرووش پێ بەخشیبوو، بەهۆی پێشبینیە راستەکە دەربارەی ١٠ رۆژەکە. کە سەربازەکان ئەمەیان بیست، هەندێکیان بۆ ئەوە چوون کە لەوێ بمێنن بەلام زۆربەیان وا نەبوون. تیمۆسیۆنی داردانی و تیۆراکسی بۆیۆتی قسەیان لەگەل چەند بازرگانێکی هیراکلیا و سینۆپ کرد و گوتیان ئەگەر پارە بۆ لەشکرەکە پەیدا نەکەن رەنگە هەموویان لێرە بمینن و، گوتیان زینۆفۆن هانمان دەدات و دەلێ: دەبێ لێرە بمێنن. وەك دەبینن ئێستا خۆراك بۆ گەڕانەوە پەیدا ناکرێت و کە دەچنەوە مالێ، سودێکتان بۆ خزمەکانتان نابێت و کێ دەلێ دەگەنەوە!. بەلام ئەگەر حەز بکەن دەتوانن بەئارەزوی خۆتان شوێنێك لە ناوچەی یۆکسین داگیری بکەن و ئەوانەی دەرۆن با برۆن و ئەوانی حەز دەکەن با بمێنن. کەشتی زۆرن، دەتوانن بەسەر هەر بەندەرێك دادەن.

تیماسیۆنی داردانی هەستا یوریماخۆسی داردانی و توراکسی بۆیۆتیی لەگەل بازرگانەکان نارد کە هەمان قسە بۆ خەلکی شارەکە بگێڕنەوە. خەلکی سینۆپ بیستیان و نامەیان بۆ تیمیسیۆن نارد کە هەندێك پارە قەبوول بکات بۆ ئەوەی لەشکەرەکە دژی زینۆفۆن هان بدات[1] تا لە یۆکسین برۆن. قسەکەی پەسند کرد و لە کۆبۆنەوەیەکدا ئەم گوتارەی دا: سەربازان، ئێمە نابێ

[1] هێشتا نەگەیشتوونەوە یۆنان، یەکسەر خۆبەخۆیی و تۆمەتکاری دەستی پێکرد.

بیر لەمانەوە بکەینەوە، نابێ هیچ شتێك لە یۆنان بە گرینگتر بزانین. دەبیسم هەندێك کەس بەنیازی مانەوە قوربانی دەکەن. ئێستا بەڵێن دەدەم ئەگەر بڕیاری ڕۆیشتن بدەن، مانگانە یەك سیزیکۆس دەدەم، دەتانبەم بۆ ترواد Troad من لەوێ ئاوارە بووم، خەڵکی شارەکەم یارمەتیتان دەدەن چونکە بە گەڕانەوەی من شاد دەبن و لەوێڕا دەتوانم بۆ شوێنی ئەوهاتان بەرم کە پارەیەکی زۆرتان دەست بکەوێت. من شارەزایم لە ئایۆلیا و فریجیا و ترواد و لەهەموو ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەرتاباز هەیە، هەم بەهۆی کە بەئەسڵ خەڵکی ئەوێم، و هەم بەهۆی کە لەگەڵ کۆڕووش و دەرسیلیداس چوومەتە جەنگ.

تۆراکسی بۆیۆتی، لەوەی کە نیازەکەی زینۆفۆنی ئاشکرا کردبوو، هەستایەوە و گوتی: ئەگەر بە یۆکسینیدا بڕۆن ئەوسا دەگەنە خەرسۆنیز کە ناوچەیەکی تێر وبە پیتە و ئەوەی حەز بکا دەتوانێ لەوێ بمێنێت، و ئەوانی دیکە با بگەڕێنەوە ماڵی خۆیان. چۆن یەکێك لە وڵاتی بێگانەدا بۆ زەوی بگەڕێت لە کاتێکدا کە یۆنان زەوی و زاری زۆرە؟ هەروەها تا دەگەنەوە، من و تیماسیۆن مووچەتان دەدەینێ.

ئەمەی گوت کرد کە دەیزانی خەڵکی سینۆپ و هیراکلیا بەڵێنی پارەیان دابوو بەمەرجی کە لێرە بڕۆن. میلیسیۆس و لیکۆن، هەردووك ئاخەیی بوون، هەستانەوە و گوتیان ئەمە کارێکی نامرۆڤانە بووە کە زینۆفۆن ویستویەتی بەخەڵکەکە بسەلمێنێت کە لێرە بمێنن و بەدزی قوربانی کردووە.

جا زینۆفۆن ناچار کرا هەستێت قسە بکات، ئەم قسانەی کرد: سەربازەکان، وەك دەیزانن من قوربانی بۆخۆم و بۆ ئێوەش دەکەم. نیازم ئەوەیە کە قسە و ڕەفتار و کردەوەم باشترین و سەربەرزترین ئەنجامیان هەبێت. نازانم ئایا باسی بکەم یاخۆ بەیەکجاری واز لە هەمووی بێنم؟ دەربارەی قوربانییەکە، سیلانۆسی فالگر گوتی دیمەلی قوربانیەکە زۆر باشبوو، دەنا بە ناچاری ئەم وەڵامەی دایەوە چونکە خۆم شارەزاییم لە فاڵ هەیە، بەڵام گوتی قوربانیەکە نیشانەی هەندێك خیانەت و تەفرەدان دەدات دژی من، ئەمەش چونکە خۆی ئەم نیازەی هەبوو کە لەبەر چاوی

ئێوەدا هێرش بکاتە سەر من لەرێگای بلاو کردنەوەی ئەو چیرۆکە گوایە من بەبێ پرسینەوە پلانێك دەگێرم.

لە راستیدا ئەگەر ببینم ئێوە بێ چارە ماوەن، رەنگە خەریك بم وا بکەین شارێك داگیر بکەین، ئەوسا ئەوەی حەز دەکا بڕوات دەڕوات و ئەوانی دیکە دەمێنن تا ئەو کاتەی کە پارەیان دێتە دەست. هەرچۆنێك بێت، من دەبینم خەلکی هیراکلیا و سینۆپ کەشتی دەنێرن بۆ ئەوی کە بڕۆین، لەم پیاوانەش بەلێنی مووچەتان دەدەنێ کە لەم مانگە را دەست پێبکات، کەواتە باوەڕم وایە ئەمە باشترین شتە بۆ ئەوەی بە ساغی بگەڕێینەوە و مووچەش وەرگرین.

یەك لەبارە خۆمەوە واز لە پلانەکەم دێنم و بەتێکرای ئەو کەسانەش دەلێم، ئەوانەی پلانەکەیان بە باش دەزانی، با ئەوانیش واز بێنن. ئەوەی من بیری لێ دەکەمەوە ئەمەیە، تا پێکەوە بن ئەوسا رێز و خۆراکیش پەیدا دەبن. ئەمە ئەنجامێکی ئاساییە بۆ هەبوونی هێز کە دەتوانن شمەکی خەلکی بێ دەسەلات بەرن. بەلام ئەگەر بلاو ببنەوە و هێزەکەتان ببێتە چەند بەشێکی بچووك، ئەوسا خۆراکتان بۆ دابین ناکرێت، هەروەها دەربازبوون لێرە دەبێتە خەمێکی گەورە. ئیتر بۆچوونی من وەك بۆچوونی ئێوەیە کە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ یۆنان، بەلام ئەگەر کەسێك ئێمەی بەجێ هێشت دەبێ دادگایی بکرێت. ئەوانەی قسەکەم پەسند دەکەن با دەستیان بلند بکەن.

هەموو دەستیان بلند کرد. سیلانوس ویستی دەنگی بەرز بکاتەوە و قسە بکات کە شتێکی ئاساییە ئەگەر هەندێك کەس بەتەنیا بڕۆن. بەلام سەربازەکان هەڕەشەیان لێ کرد کە ئەگەر بزانن خەریکی هەلاتنە، ئەوسا پێی دەبزێرن.

دواتر کە خەلکی هیراکلیا بیستیانەوە کەوا لەشکرەکە دەیەوێ بڕوات و کەوا زینۆفۆن مەسەلەکەی خستۆتە دەنگدان، ئەوسا کەشتیەکانیان نارد، بەلام نەیانتوانی پارەکە بۆ تیماسیۆن و تۆراکس دابین بکەن. و ئەوانەی کە بەلێنی مووچەیان دابوو، ترسێکی گەورەیان گرت، بۆیە بەخۆ و بە هەموو جەنەرالەکانی دیکەی (کە دەستیان لە پلانەکە هەبوو) هاتنە لای زینۆفۆن (تەنیا نیۆنی ئاسین لەگەلیان نەبوو، جێگری کلیرخۆس، کە هێشتا نەگەرابۆوە) بە زینۆفۆنیان

گوت لەکاری پێشویان پەشێمانن و گوتیان وایانزانی کە باشترین شت ئەوەیە بە رووباری فاسیسدا برۆن کە کەشتی لێ دەست دەکەوێت، و دەبێ خاکی فاسیس داگیر بکەن.

لەم کاتەدا نەوەیەکی ئایەتیس هات کە پاشای ناوچەکە بوو. لە وەلامی ئەمەدا زینۆفۆن گوتی باش نیە هیچ شتێك لەم قسانە بگاتەوە لەشکر و گوتی: بەلام ئەگەر حەز دەکەن دەتوانن کۆبوونەوەیەك ببەستن و ئەم پێشنیازە بخەنە روو.

ئەوسا تیماسیۆنی داردانی رای خۆی دەربڕی، ئەمەش ئەوەبوو کە بەبێ کۆبوونەوەی گشتی، با هەرکەس لەگەڵ کاپتنەکانی خۆی قسە بکات. ئیتر بلاوەیان لێ کرد.

## چاپتەر -٧-
## زینۆفۆن بەرگری لەخۆی دەکات

سەربازەکان دیتیان مەسەلەکە تێکەڵ و پێکەڵ کراوەتەوە و نیۆن وای هەڵبەست گوایە زینۆفۆن قسەی خۆی پێش جەنەراڵەکان خستۆتەوە و دەیەوە سەربازەکان تەفرە بدات و بیانگەڕێنێتەوە بۆ فاسیس. سەربازەکان بە بیستنی ئەم قسە تووڕە بوون، کۆبوونەوە بەسترا و بە کۆمەڵ قەرەباڵغییان دروست دەکرد و ترسێك پەیدابوو کە وەکو جارەکەی پێشوو، لە مەسەلەی نامەبەرەکانی کۆلخی و بەرپرسانی بازاڕدا رەفتار بکەن. زینۆفۆن کە دیتی کار گەیشتۆتە ئەمە، داوای کۆبوونەوەی گشتیی کرد تا لەخۆڕا کۆبوونەوە و قەرەباڵغیی دروست نەکەن، ئیتر خەبەرچییەکانی دەنگ دا کۆبوونەوەی گشتی رابگەیێنن. جا یەکسەر بەلێشاو هاتن و دیار بوو کە سەرگەرمی کۆبوونەوەکە بوون. زینۆفۆن جەنەراڵەکانی بەمە تۆمەتبار نەکرد کە چ پێشنیازێکیان کردووە. لەباتی ئەوە، بەمجۆرە قسەی کرد:

سەربازەکان، بیستوومە یەکێك منی تۆمەتبار کردووە گوایە دەمەوێ تەفرەتان بدەم و بتانبەم بۆ فاسیس. بۆیە تکا دەکەم رێگا بدەن قسەی خۆم بکەم. ئەگەر سەلمێندرا کە من خراپەی ئێوە دەکەم، کەواتە نابێ بەبێ سزا دەرچم. بەڵام ئەگەر سەلمێندرا کەوا تۆمەتکارانی من درۆ دەکەن، ئەوسا دەبێ رەفتاری شایستەیان لەگەڵدا بکەن. ئێستا هەموو دەزانن کە لەم ناوچەدا هەتاو لەکوێ هەڵدێت و لەکوێ ئاوا دەبێت و ئەگەر یەکێك بخوازێ بەرەو یۆنان بڕوات، دەبێ بەرەو خۆرئاوا بڕوات. کەچی ئەگەر ولاتی خەڵکە ناوچەییەکان بخوازێت، دەبێ بەرەو خۆرهەلات بڕوات. ئێستا ئاشکرایە کە کەس ناتوانێ فێڵتان لێ بکات و بلێ خۆر لێرە هەڵدێت و لەوێ ئاوا دەبێت، هەروەها ئەوەش ئاشکرایە کە بای باکوور بەرەو یۆنانمان دەبات و بای باشوور بەرەو فاسیس دەچێت، کەواتە چۆن باوەڕ دەکەن کەسێك بتوانێ تەفرەتان بدات و بلێت کە بای باشوور هەڵی کرد سواری کەشتیتان بکات گوایە بۆ یۆنان دەڕۆین؟

ڕەنگە بڵێن من لە شێنەییدا سواری کەشتیتان دەکەم بەڵام کە سوار بووین بەلایەکی دیکەتان دەبەم. خۆ من سواری یەك کەشتی دەبم و ئێوە بە ١٠٠ کەشتی، کەواتە چۆن بەرەو وڵاتێکتان بەرم کە نەیخوازن، یان تەفرەتان بدەم کە بەدوای من بکەون؟ دەبا وا بزانین کە تەفرە دران و گەیشتینە فاسیس، ئەوسا دادەبەزن و دەزانن کە ئەمە یۆنان نیە و ئیتر من بەتەنیا دەبم و ئێوەش ١٠٠٠٠ کەسن بە چەکەوە. کەواتە پیاو چۆن خۆ دەداتە بەر دادگاییەکی ئەوها؟ نەخێر، هەموو ئەم چیرۆکانە لەلایەن کەسانێکی گێلەوە کراون کە حەسوودیان لەمن کردووە چونکە ئێوە بەجۆرێکی تایبەت ڕەفتار لەگەڵ مندا دەکەن، واش هەر بۆیان نیە حەسوودی بکەن.

ئایا ڕێگام لەکەس گرتووە قسەی خۆی بۆ ئێوە بکات؟ ئەگەر قسەیەکی هەیە یان ئەگەر لە مەیدانی شەڕدا شتێکی نواندووە و دەیەوێ شەڕ بۆ ئێوە بکات و ئەگەر بەشەو دەچێ پاسەوانی بۆ ئێوە دەگرێت، ئایا لە هەڵبژاردنی ئەفسەراندا ڕێگام لە کەس گرتووە قسە بکات؟ من ئامادەم واز بێنم و با جێگەی من بگرێتەوە بەمەرجی کە مسۆگەری بکەم کە چاکەتان لەگەڵدا دەکات. ئیتر بەسە، من زۆرم دیت. ئەوەی باوەڕ دەکا کە من دەمتوانی تەفرەتان بدەم یاخۆ کەسی دیکە دەیتوانیێ ئەمە بکات، با قسە بکات و تێی بگەین

بەڵام پاش ئەوەی مەسەلەکە ساغ دەبێتەوە یەکسەر بڵاوەی لێ نەکەن پێش ئەوە گوێ لەمن بگرن. دەبینم ڕەوتێکی تایبەتی لەنێو لەشکرەکەدا پەیدا بوە. ئەگەر ئەم ڕەوتە بەردەوام بێت، کەواتە کاتی ئەمە هاتووە بیرێك لە حاڵی خۆمان بکەینەوە. با لەبەر چاوی خەڵك و ئاسمان و چاوی دۆست و دوژمندا بە بێکەڵکترین کۆمەڵە خەڵکێك ناو نەبرێین.

کە ئەمەیان بیست و ویستیان مەبەستەکەی بزانن، داوایان کرد بەردەوام بێت، ئەوسا دەستی بەقسە کردەوە: وا بزانم لەبیرتانە کە هەندێك خەڵکی ناوچەیی برادەری خەڵکی سیراسۆس بوون دەهاتن مێگەڵ و گاڕانیان بە ئێمە دەفرۆشت، واش بزانم هەندێکتان چوونەتە وێ و شەکتان کڕیوە. کلێراتۆس، کاپتنێك بوو شوێنێکی بچووکی دۆزیبۆوە و بەهۆی کەوا خەڵکەکە ئێمەیان بە برادەر دەزانی، پاسەوانیان نەدەکرد. شەوێك بەبێ پرس لەگەڵ برادەرەکانی هێرشی بۆ کردووە بەنیازی ئەوەی کە دەسکەوتی ببێت و بە تاڵانەوە لە یۆکسین دەرباز بن.

رۆژ هەڵاتبوو، خەڵکەکە ساز ببوون و بەرەنگاریان ببوونەوە. کلێراتوس و هەندێکیان کوشتبوو و هەندێکیشیان گەڕابوونەوە.

ئەمە لەو رۆژە رووی دا کە خەریك بووین لێرە بڕوین، هەندێکمان بەدەریا رۆیشتن و هەندێکیش هێشتا بەرێ نەکەوتبوون. بەگوێرەی خەڵکی سیراسۆس، سێ ریش سپیی ئەو شوێنە داوای کۆبوونەوەیان لەگەڵ جەنەراڵەکان کرد، بەڵام کە زانیان ئێمە رۆیشتووین و کەوا هێرشەکە بەبێ پرس کراوە، پێیان خۆشبوو و نیازیان هەبوو بەکەشتی بێن بۆ ئێرە تا رووداوەکە بگێڕنەوە و رێگاش بدەن تەرمی مردووەکان وەربگرینەوە. بەڵام هەندێك لەم یۆنانیانەی کە لە هێرشەکەدا بەشداربوون ئەو ریش سپیانەیان دیت و بەردبارانیان کردن و هەرسێکیان کوشت.

ئینجا خەڵکی سیراسۆس مەسەلەکەیان بۆ ئێمە گێڕایەوە و ئێمەش زۆر پێی قەڵس بوین و گفتوگۆمان لەگەڵ سیراسۆس کرد کە چۆن تەرمی یۆنانیەکان بنێژین. ئێمە لە دەرەوەی سەرا لەلای جبەخانەکە دانیشتبوین کە لەناکاو گوێمان لە هەرایەك بوو، هاوار دەکرا "تێیان هەڵ دەن، بەردبارانیان بکەن" هەر هەندەمان زانی خەڵکێك بەبەردەوە بۆمان هاتن. خەڵکی سیراسۆس کە ئەم کوشتارەیان دیتبوو، ترسان هەڵاتن، هەندێك لە ئێمەش ترسان وهەڵاتن بەڵام من بۆیان چووم تا بزانم لەو هەرایە لەسەر چیە؟ هەندێکیان تێ نەدەگەیشتن هەراکە چیە و هەندێکیان بەردیان لەدەست بوو. لەکۆتاییدا تێگەیشتم، کەسێکم دۆزیەوە گوتی بەرپرسەکانی بازاڕ رەفتاری ناشیرنیان لەگەڵ لەشکرەکە دەکرد. لەم کاتەدا یەکێك زێلارخۆسی دیت بەرەو دەریا شۆڕ دەبۆوە، هاواری کرد، کە ئەوانی دیکە گوێیان لێ بوو پەلاماری ئەم پیاوەیان دا وەك بڵێن چاویان بە یەکانە بەرازێك کەوتووە یان نێرە بزنێکی کێوی. کە خەڵکی سیراسۆس سەربازەکانیان دیت وا بۆلای وان دەچن، لایان مسۆگەر بوو کە پەلاماریان دەدەن و بە خێرایی هەڵاتن و خۆیان هەڵدا بۆ نێو دەریا. لەراستیدا هەندێك لە ئێمەش خۆیان هەڵدا و ئەوانەی مەلەیا نەدەزانی خنکان. باشە، ئایا بۆچی ئەوهایان کرد؟ ئەوان خراپەی ئێمەیان نەکردبوو کەچی لەناکاو هەندە لێمان ترسان، ئێمەیان بە سەگی هار زانی. ئێستا ئەگەر ئەم جۆرە شتانە بەردەوام بن، بیر بکەنەوە لەشکرەکەمان بە چ حاڵێك دەگات؟ ئێوە کە بەشی گەورەی لەشکرەکەن

توانای شەڕتان نامێنێت و ناتوانن سنورێك بۆ دوژمنایەتی دابنێن. هەرکەس بەهەوەسی خۆی تاقمێك دەبات و بەسەر خەڵکێك دادەدات.

ئینجا کە نوێنەرێکیان دێ شکایەت بکات، ئەوسا دەیکوژن و کەس نامێنێ شکایەتەکە بکات. واتە وای لێ دێت ئەو کەسانەی کە ئێوە هەڵیان دەبژێرن دەسەڵاتیان نامێنێت، کەچی ئەو کەسانەی کە لەخۆڕا دەکرێنە ئەفسەر و لەخۆڕا هاوار دەکەن "بەردبارانیان بکەن" بای ئەوە دەسەڵاتی دەبێت کە بەبێ دادگایی و بەهەوەسی خۆی سەربازێك لەئێوە لەسێدارە بدات، کەوا خەڵکێك لە ئێوە گوێڕایەڵی دەبن. ئێستا ئەم راستیە رەچاو بکەن کە (خۆهەڵبژاردەکان) چییان بۆ ئێوە کردووە؟ ئایا زێلارخۆس زیانی بە ئێوە گەیاندوە، ئەو راستەوخۆ بۆ دەریا چوە بەبێ ئەوەی رازیتان بکات.

ئەگەر لەلایەکی دیکەوە ئەو بێ تاوان بێت، ئەو بەترسەوە لە لەشکر رایکردووە لەترسی ئەوەی کە بەبێ دادگایی لەسێدارە بدرێت. ئەوانەی کە باڵوێزەکانیان بەردباران کردووە وایان لە ئێوە کرد کە تاقە یۆنانیەك بێ نەوێرن بچنە ئەم شارە مەگەر بەتۆبزی بچنە ژور. سەبارەت بە مردوەکان، ئەگەرچی پێشتر دەرفەت هەبوو تەرمەکانیان وەربگرینەوە. بەڵام ئێستا ئەو خەڵکە ئەم رێگاشبان بڕی. کێ ئامادەیە باڵوێز بنێرێت، لە کاتێکدا کە خۆی باڵوێزی خەڵکی کوشتبێت؟ هەر باشە، وا داوایان لە خەڵکی سیراسۆس کردووە کە مردوەکان بنێژن. جا ئێستا ئەگەر ئەم رەفتارانە راست بن کەواتە پەسندیان بکەن تاکو بزانین لەمەودوا ئیشەکان چۆن بەڕێوە دەچن و هەرکەس خەمێك لەخۆی بخوات!. بەڵام ئەگەر باوەڕتان وایە کە ئەم رەفتارانە پڕ لە رەفتاری ردڕندە دەکەن لەچاو رەفتاری مرۆڤ، کەواتە با سنورێکیان بۆ دابنێین. ئەگەر وا نەکەین، کەواتە چۆن دەتوانن قوربانی بۆ خواوەندەکان بکەین لەکاتێکدا کە خۆمان دەچین کاری بەد ئەنجام دەدەین؟ ئەگەر ئێمە ئەم جۆرە خەڵکە بەرەڵڵایە ببینن، چ شارێك بەخێرهاتنی مە دەکەن؟

کێ لەخۆی رادەبینێت مامڵەت لەگەڵ ئێمە بکات لەکاتێکدا کە دەزانێ چ رەفتارێکمان کردووە؟ لەماڵێ، ئومێدمان ئەوەیە ستایش بکرێین. بەڵام کێ ستایشمان دەکات ئەگەر

کەسایەتیمان بەم جۆرە بێت. لام مسۆگەرە کە خۆمان ئامادە نین ستایشی کەسانێك بکەین ئەگەر بەم جۆرە رەفتار بکەن.

پاش ئەمە، هەموو هەستانەوە سەر پێ و بەو کەسانەیان گوت کە ئەوهایان لێ خوری بوو کە دەبێ سزا بدرێن و لە ئایندەدا نابێ بە بەرەڵلایی رەفتار بکرێت، و دەبێ لێ بکۆڵرێتەوە کە لەوەتی کۆڕووش مردوە چ رەفتارێکی نارێك ئەنجام دراوە و، کاپتنەکان بە سەرپشك دانران. هەروەها لەسەر راسپاردەی زینۆفۆن کە لەلایەن فالگرەکانەوە پشتیوانی لێ کرا، بڕیار درا پاکانە لە لەشکرەکە بکرێت. رێورەسمی دینی بۆ پاکانەکردن بەرێوە چوون.

## چاپتەر -٨-
## لە تەنگانەدا دەبێ هەموو پابەند بین

بڕیار درا کە لە ڕەفتاری ڕابردووی جەنەراڵەکان بکۆڵرێتەوە. لە ئەنجامدا فیلسیۆس و زانتتیکلیس بە ٢٠ مینا جەزا دران کەوا بەباشی چاودێری بارگەکانی نێو کەشتیەکانیان نەکردبوو، هەروەها سۆفەینەتۆس بە ١٠ مینا جەزا درا کەوا لە ئەرکێکدا کەمتەرخەمی کردبوو.
یەکێك شکایەتی لە زینۆفۆن کرد گوایە دارکاری کردووە و کە زۆر توندوتیژ بوە. زینۆفۆن پرسیاری لە پیاوەکە کرد ئایا ڕوداوەکە لە کوێ بوە؟ گوتی: لەو جێگایە کە لەسەرمان دەمردین کە ئەوهەموو بەفرە باریبوو. زینۆفۆن گوتی: کەواتە ئەگەر کەشەکە ئەوها بوو بێت وەك باسی دەکەیت و لەوکاتەدا کە خۆراك بڕابوو و بۆنێکی شەرابمان نەدەکرد و نوقمی ئەو دەردەسەریە ببوین و دوژمن ڕاومانی دەنا، ئەگەر لەو حاڵەتدا ئەوها ڕەفتارم کردبێت کەواتە من دانی پێ دەنێم کە پشووم لە پشووی کەرێك زۆرتر بووە. دەشڵێن کەر هەندە بە پشوون کە هەرگیز ماندوو نابن. باشە دەی، پێمان بڵێ لەسەر چی دارکاری کراویت؟ ئایا شتێکم ویستوە و تۆ نەتهێناوە بۆیە دەستم وەشاندوە؟ ئایا تۆڵەم دەکردەوە؟ ئایا لەسەر کوڕێکی جوانکەڵە بووە یان بە سەرخۆشی کردووەمە؟
گوتی: مەسەلەکە لەبەر هیچ کام لەم هۆیانە نەبوو. زینۆفۆن لێی پرسی ئایا لە هۆپلیتەکانە؟ گوتی نا. ئەدی لە پەلتاستەکانە. گوتی نا، ئەو پیاوێکی ئازادە فەرماندەکەی ئێسترێکی دابوێ کە لێی بخوڕێت.
زینۆفۆن ناسیەوە و گوتی: کەواتە تۆ بوویت ئەوەی کە یەکی بریندارت هەڵگرتبوو؟
گوتی: بەڵێ هەوم ، تۆ ئەو شتەت بەمن کرد و هەموو شمەکی برادەرەکانی منت فڕێ دا.
زینۆفۆن گوتی: سەبارەت بە فڕێدانی شمەکەکان، ڕاستە، وا بوو، دامە پیاوی دیکە تاکو دواتر بیاندەنەوە دەست خۆم. ئینجا هەمووم بەساغی دایەوە خۆت پاش ئەوەی کە بریندارەکەت گەیاندەوە جێ. بەڵام دەبێ هەموو بزانن چ ڕووی داوە چونکە مەسەلەکە شایانی بیستنە. پیاوێك

بەجیّ مابوو پەکی کوتبوو، من هەر ئەوەندەم دەزانی کە پیاوی خۆمانە و دوژمن نزیك دەبوونەوە، بۆیەش تۆبزیم لەتۆ کرد کە رزگاری بکەین.

پیاوەکە قسەکانی سەلماند، زینۆفۆن بەردەوام بوو: تۆم نارد، و کە لەگەڵ پاسەوانانی پاشەر هاتم دیتم قۆڵتت هەڵ دەکەند تا بینێژیت. لەتەنیشتت وەستام، وا نەبوو؟ گوتم کارەکەت تەواو بکە کەچی لەپڕ خەڵکەکە دیتیان وا دەجوڵێتەوە و هاواریان کرد هێشتا زیندووە. بەڵام تۆ گوتت "زیندووش بێت، من هەڵی ناگرم" لەو کاتە بوو کە لەتۆم هەڵدا، بەڵێ قسەکەت راستە چونکە وا پیّ دەچوو کە دەتزانی زیندووە.

پیاوەکە گوتی: جا چیە، خۆ هەر مرد. دوایە پێشانتم نەدا؟ زینۆفۆن گوتی: گومان نیە کە هەموو دەمرین، کەواتە دەبیّ بەزیندوویی بنێژرێین؟ ئەوسا هەموو لێیان قیڕاند و گوتیان کە نیو هەندی پێویست تێیهەڵنەدراوە.

پاش ئەمە زینۆفۆن گوتی: ئایا کەس هەیە بلّیّ بۆچی تێی هەڵدراوە؟

بەلاّم چونکە کەس هەڵنەستا، لە قسەکەی بەردەوام بوو و گوتی: سەربازینە، من دان دەنێم کەوا لەحاڵەتی پابەند نەبووندا پیاوم دارکاری کردوون. جۆرە خەڵکێك هەبوون ژیانیان بە ئێوە رزگار کرا، لە ریزەکاندا پێشڕەویان دەکرد و لەکاتی پێویستدا شەڕیان دەکرد. بەلاّم ئەوانەی کە شوێنەکانیان بەجیّ هێشت و رایان کرد تا بەشیان لە تالاّن و دەسکەوت زیاد بکەن، ئەگەر هەموو بەم جۆرە رەفتارمان کردبایە ئێستا هەموومان راماڵدرابوین.

هەروەها ئەگەر پیاوێك ورەی بەردابێت و نەیویستبێ بەرەنگاری دوژمن بێتەوە و خۆی بەدەستەوە دابێت، من هەم خەڵکم دارکاری کردووە و هەم تۆبزیم کردووە کە لە ڕێپێواندا بەردەوام بن. ئەوە چونکە جارێك لە بەفرەکەدا چاوەڕێی هەندێك پیاوم دەکرد تا شمەکیان تێك دەنێن، هەستم کرد لاقم بەحاڵ دەجوڵێتەوەن لێرە هەر کەسێکم دیتبیّ تەمبەڵی کردبێت من بە پاڵ دەمخستە سەر ڕێگا.

گەڕان و جوڵە لەشی پیاو بە گەرمی رادەگرن و لاقیشت نەرم دەکەن. بەلاّم دانیشتن خوێنی دەوەستاند و پەنجەکان سڕ دەبوون، وەك دەزانن زۆر کەس تووش بوون. ئەگەر کەسێك بەجیّ

مابایە و تەمبەڵیی کردبایە، ئێمەشی هێواش دەکردەوە. من مستم لە یەك- دوو پیاو داوە، بەڵام ئەمە بۆ ئەوە بووە کە ئێزەرمیی دوژمنی نەگاتێ

ئێستا وا لە شێنەییدان و دەرفەتیان هەیە داد بدرێن، بەڵام ئەگەر کەوتبانە بەر دەست دوژمن، ئایا داد دەدران؟ مەسەلەکەی من زۆر ئاسانە، ئەگەر یەکێم سزا دابێت ئەمە بۆ چاکەی خۆی بووەن کەواتە دەبێ هەمان سزا بدرێم کە باوانێك لە منداڵی خۆیان دەدەن، یاخۆ بەڕێوەبەری خوێندگایەك لەگەڵ خوێندکاراندا دەیکات، دکتۆریش بەهەمان شێوە چەقۆ و ئاسنی داغ لەگەڵ نەخۆشەکان بەکار دێنێت. دەنا ئەگەر ئێوە وا دەزانن کە کەسایەتیەکی ئێسکگرانم هەیە!

کەواتە تکا دەکەم ئەمەش رەچاو بکەن کەوا ئێستا لەچاو ئەوسا باوەڕم بەخۆم زۆرترە و لەچاو ئەوسا قەڵەوترم و شەرابێکی زۆرتریش دەخۆمەوە، واش هەر کەس دارکاری ناکەم. چونکە ئێستا وا لە هەوایەکی خۆشدان، بەڵام هەرهەندە رەشەبا هەڵی کرد و دەریا بەجوڵە هات، دیتوتانە چۆن کەشتیوان لەسەر یەك سەربادان لەپیاوەکانی تورە دەبێت.

هەمان شت سووکانچی لەگەڵ پیاوانی خۆی دەکات. ئەمەش چونکە لەکاتی ئەوهادا بچووکترین هەڵە دەبێتە مایەی تورەکردنی هەموو کەسێك. ئێوەش دانتان بەوە نا کەوا دارکاری کردنی ئەم پیاوە بەجێ بوە. ئێوە بە شمشێرەوە لەتەنیشتم بوون و دەتانتوانی فریای بکەون بەڵام لەراستیدا نە بەهانای چوون و نە دەستان لە سزادانی کەسانێك وەردا کە بە نارێکی رەفتاریان دەکرد. بەم چاوپۆشیە بەدترین نیشانەی بێباکیتان دیار خست.

باوەڕم وایە ئەگەر تەماشا بکەن دەبینن ئەو کەسانەی کە ئەوسا رەفتاریان باش نەبوو، ئێستا تەحەمول ناکرێن. بۆیسکۆس، بۆکسەرە تێسالییەکە، بەنموونە وەرگرن. لە کاتی خۆیدا (ستڕانێکی) هەڵبەست گوایە هەندە نەخۆشە قەڵغانەکەی پێ هەڵنەدەگیرا. کەچی ئێستا کۆمەڵێك خەڵکی کۆیتۆرای روت کردووە. ئێوە ئەگەر تێگەیشتو بن، دەبێ بەپێچەوانەی سەگە درەکان رەفتاری لەگەڵدا بکەن. سەگی دڕ بە رۆژ دەبەسترێنەوە و بەشەو بەرەڵلا دەکرێن. بەڵام ئەمانە دەبێ بەشەو بیبەسترێنەوە و بەرۆژ بەرەڵلای بکرێن.

زینۆفۆن بەردەوام بوو: سەیرم پێ دێت کەوا لەمەڕ مندا دەستدرێژی و سزاکانتان لەبیر ماوە کەچی کە لەو سەرمایەدا یارمەتیم داون، یان کە دوژمنم دوور خستۆتەوە، یان کە یارمەتیی

نەخۆشەکانم داوە، کەس ئەوانەی لەبیر نەیە. ئەو کاتانەشتان لەبیر نەماوە کە لەبەر کردەوەیەکی باش، ستایشی یەکێکم کردووە یان ئەوپەڕی ڕێزم لە سەربازێکی بچووك ناوە. شەرافەتمەندی و شادمانی لەوەدان کە کارە باشەکانی کەسێکمان لەیاد بێت نەك کارە بەدەکانی.

ئەوجار خەڵکەکە هەستانەوە و کارە باشەکانیان گێڕاوە، ئەنجامی کۆتاییش بەدڵی هەمووان بوو.

## چاپتەر -١-
## زینۆفۆن پایەی سەرلەشکر رەت دەکاتەوە

لە پافلاگۆنیا ئەو ماوەیان بە راو و بە راوەڕوت بەسەربرد. خەڵکی پافلاگۆنیاش زیرەك بوون، دەیانزانی چۆن سەربازە دابڕاوەکان راو بکەن. ئەوان بەشەو زەبریان لە رەشماڵەکانی پێشەوە دوەشاند، ئیتر رقایەتیەکی تیژ لە هەردووك لا پەیدا ببوو.

کۆریلاس، فەرمانرەوای پافلاگۆنیا، باڵوێزێکی بۆ یۆنانیەکان نارد، ئەوانە ئەسپ و پۆشاکی باشیان هەبوو، گوتیان کۆریلاس ئامادەیە رێك بکەوێت کە هیچ لایەنێك زیان بەوەی دیکە نەگەیێنێت. وەڵامی جەنەڕاڵەکان ئەمە بوو کە دەبێ مەسەلەکە لەگەڵ لەشکر باس بکەن، بەلام مێواندارى و مامڵەتێکی زۆر باشیان لەگەڵدا کرد، گوتیان لێی دەوەشێتەوە.

پاش ئەوەی چەند گایەکیان کردە خێر و قوربانی، خوانەیەکی باش ساز کرا، لەسەر قەنەفەی نزم دانیشتن و بە قۆچی گا شەرابیان خواردەوە. کە شەراب خورایەوە سروودی پایان خوێندرا. دوو پیاوی تراکی تاقمە زرێی تەواویان پۆشتبوو هەستان بە شەمشاڵەوە سەمایان کرد، وەکو سەمای جەنگ پازیان دەدا و شمشێریان رادەوەشاند. لەکۆتایدا یەکیان شمشێری لەوەی دیکە دا، ئەمەش خۆی مراند. مێوانە پافلاگۆنیەکان هاواریان کرد و، پیاوەکانی دیکە شمشێرەکەیان لێ ستاند و ئەویش بە خوێندنی هۆنراوەی سیتالیسەوە دەرچوو. ئینجا هەندێك تراکی پیاوە کەوتووەکەیان هەڵگرتەوە وەك بڵێی مردوە، لەراستیشدا هیچ زیانێکی پێ نەگەیشتبوو.

پاش ئەمە، هەندێك ئێنیایی و مەگنیسی بە تاقمە زرێوە هەستان، سەمایەکیان کرد پێیان دەگوت (سەمای چێنە)[1] پیاوێك دانیشت و دەستی پێکرد تۆو بوەشێنێت، گوایە گاسنی لە گاجووت بەستبوو، جووتی دەکرد و چاوی دەگێڕا. ئینجا دزێك هات، کە جوتیارەکە دیتی

---

[1] نوسراوە Sower's dance هەم بەواتای جووت کردن و هەم بەواتای کێردی گاسن دیت. ئیتر نازانم ئەسڵە یۆنانیەکە چۆن بووە.

یەکسەر چەکی هەلگرت کە بەرگری لە گاجووت و گاسنەکە بکات (نمایشەکە لەگەلْ ئاوازی شمشالْ ئەنجام دەدرا). لەکۆتاییدا دزەکە جوتیارەکەی لەگەلْ گاسنەکە بەستەوە. هەندێك جاریش بەوە کۆتایی دەهات کە جوتیارەکە دزەکەی دەگرت.

پاش ئەمە پیاوێکی میسیی دوو قەلْغانی بچووکی پێبوو، هاتە پێش و سەمای کرد. جارێك وای دەنواند گوایە دوو کەس پەلاماری دەدەن، جارێکیش وای لە قەلْغانەکان دەکرد گوایە دوو کەس شەڕ دەکەن، هەندێك جاریش تەقلّەی لێدەدا، شتێکی جوان بوو. لە کۆتاییدا سەمای فارسیی کرد، قەلْغانەکانی پێکدا دەدا و کڕنووشی دەبرد و بە پاز هەلْدەستایەوە، هەمووش بە شمشالەوە دەکرا.

پاش ئەمە، هەندێك مانتینی و ئەرکادی هەستانەوە، جوانترین بەرگ و زرێیان پۆشتبوو، بە ئاوازی شمشالْ و ریتمی جەنگی هاتنە پێش. سروودی پایانیان خوێند و سەمایەکیان نمایش کرد کە بە ڕێوڕەسمی دینی دەچوو.

میوانە پافلاگۆنیەکان شاگەشکەی ئەو هەموو سەمایانە بوون کە بە بەرگی جەنگیەوە بکرێن. پیاوە میسیەکە کە دیتی ئەم سەمایەیان بەدلە، روخسەتی لە برادەرێکی خۆی خواست کە سەماکارە کچەکە بێنێت، جا جلێکی جوانی لەبەر کرد و قەلْغانێکی بچووکی دایێ، کچەکە سەمای پیریك Pyrrhic ی نمایش کرد. لێرەدا چەپلە و ستایشێکی گەورە کرا، پافلاگۆنیەکان پرسیاریان کرد ئایا ئافرەتیش لەشەڕدا بەشدار بوونە؟ یۆنانی وەلاّمیان دایەوە کە ئەو ئافرەتە شای لە ئۆردوگاکە دەرپەڕاندوە. بەمە، رابواردنی ئەو شەوە کۆتایی هات.

رۆژی دواتر بالْوێزەکە بانگ کرا و پێیان راگەیاند کە پێشنیازەکە پەسند کراوە، کەوا هیچ لایەك خراپە نەکات. ئەوسا بالْوێزەکە رۆیشتەوە.

کەشتی زۆر ببوون، یۆنانی سوار بوون و شەو و رۆژێك بەدەریادا رۆیشتن، بایەکی هەموار دەهات و پافلاگۆنیایان خستبۆ لای دەستە چەپیان. رۆژی دواتر گەیشتنە هیراکلیا. خەلْکی سینۆپ لە ناوچەی پافلاگۆنیا دەژیان کە کۆلۆنیەکی میلەتۆسە. سالاّنە دیاریی برادەرانە بۆ یۆنانیەکان دەنێرن لە ٤٠٠٠ سەتلە گەنمی خواردن و ٥٠٠٠ گۆزە شەراب.

خیریسۆفۆس هاتەوە. سەربازەکان وایانزانی شتێکی پەیدا کردووە، بەڵام هیچ. تەنیا نامەیەکی هێنابوو لە ئەناسیبیۆسەوە، ئەدمیراڵە سپارتیەکە، ئەو هەندێك سپارتی لەگەڵ بوو کە پیرۆزبایيان لە لەشکرەکە کرد و لە نامەکەدا ئەناکسیبیۆس بەڵێنی دا کە ئەگەر لە یۆکسین دەرباز بن، پارەیان بداتێ.

یۆنانی پێنج رۆژ لەوێ مانەوە. کەهەستیان کرد وا لە یۆنان نزیك بوونەتەوە، مەراقیان گرت کە بە دەستی بەتاڵ نەچنەوە ماڵێ. بیریان کردەوە ئەگەر سەرلەشکرێکی کاتی هەڵبژێرن ئەوسا لەم حاڵەی ئێستا باشتر سوود دەبینن کەوا رابەرایەتیەکە بەشبەش کراوە چونکە ئەوسا نهێنیەکان بەشێوەکی ئاسانتر دەشاردرێنەوە و ئەگەر پێویستیان بە کارێکی خێرا هەبایە ئەوسا بەبێ کۆنفرانس و زۆرینەی دەنگ رەفتاریان دەکرد.

کە بیریان لەم مەسەلە کردەوە خەیاڵیان بۆ زینۆفۆن چوو، کاپتنەکان چوونە لای و هەر یەك هەستە باشەکانی خۆی دیار خست و خەریك بوو رازیی بکەن کە ببێتە سەرلەشکر. زینۆفۆن لەلایەکەوە حەزی دەکرد بیکات، ئەمەشی گوت کە ئەگەر بیکات ئەوسا ناوبانگی لەچاو برادەرەکانی گەورەتر دەبێت و لە ئەتینا ناوی دەناسرێت و رەنگە بتوانێ قازانج بە لەشکرەکە بگەیێنێت. ئەم شتانە وایان کرد حەزی بچێتە پایەی سەرلەشکر، ئەمەشی دەربڕی کە کەس پاشەرۆژ بەکەس ناخوێندرێتەوە، مەترسی هەیە کە رەنگە ئەم ناوبانگەی ئێستاشی لەسەر دابنێت و هەموو بە فیڕۆ بچێت. ئەو دوودڵیە وای لێ کرد مەسەلەکە بخاتە بەر دەستی خواوەندەکان، هەستا دوو قوربانی پێشکەش بە زیۆسی پاشا کرد چونکە لەکاتی خۆیدا نیشانە ئاسمانیەکان لە پەرستگای دەلفی وایان دیار خستبوو کە دەبێ پرس تەنیا بە زیۆس بکات. بیریشی کردەوە کە هەر ئەم خاوەندە بووە ئەوەی ئەو خەونەی پێشان دا کاتێ کە لە لەشکردا گەیشتە پایە بەرپرسێتی. ئینجا ئەوەشی بەبیر هاتەوە کە دەچوو بۆ ئەفسۆس تا بە کۆڕووشی بناسێنن. لەلای راست بازێك بانگی کرد، بازەکە هەڵنیشتبوو و ئەو فاڵگرەی کە لەگەڵی بوو گوتی ئەمە نیشانەی شتێکی مەزنە دوور لە شکۆداری و لە شتی ئاسایی، بەڵام پێشبینیی ئەوەشی کرد کە دەردەسەریەکی زۆری لەپێشە چونکە هەندێك باڵندە پەلاماری بازەکەیان دەدا، لەوەشی گرت

کە نیشانەکان سامانێکی گەورەیان دیار نەخستەوە چونکە بازەکە هەر بە باڵەفڕە هەندێك خۆراکی دەست دەکەوت.

کە زینۆفۆن قوربانیەکەی کرد، خواوەندەکان بەئاشکرایی رایان گەیاند کە نابێ پایەیەکی بەرزتر داوا بکات و ئەگەر هەڵبژێردرا، دەبێ رەتی بکاتەوە. ئەمەش کۆتایی بە مەسەلەکە هێنا. هەرچۆنێك بێت، لەشکر کۆبوونەوە و هەرکەس بەلای ئەم کەسەدا قسەی کرد کە باوەڕی پێبوو. کە بریار درا، ناوی زینۆفۆنیان دانا. دیاریش بوو ئەگەر دەنگدان کرابایە زینۆفۆن هەڵدەبژێردرا[١]، بەلام زینۆفۆن هەستایەوە ئەم قسانەی کرد: من وەکو هەرکەسێك بەم شەرەفە گەورە شادم، سپاستان دەکەم و هیوام وایە خواوەندەکان توانام بدەن کە چاکەتان بدەمەوە. بەلام نە بە چاکەی ئێوە و نە بە چاکەی خۆمی دەزانم کە بکرێم بە سەرلەشکر لەکاتێکدا کە یەکی سپارتی بۆ ئەم پایە هەبێت، چونکە ئەگەر پێویستیتان بە یارمەتی بوو ئەوسا بەئاسانی ناکرێت. هەروەها باوەڕم وایە کە من لەم پایەدا ئاسوودە نابم. من باش دەزانم کە سپارتا جەنگیان دژبە وڵاتی من رانەگرت تا وایان کرد کە هەموو شارەکە دان بنێن کە سپارتی دەسەلاتیان لەسەر وان و لەسەر هەموو یۆنانە. کە دانیان بەوە نا ئەوسا جەنگیان راگرت و گەمارۆی شارەکەیان لادا، جا ئەگەر ئەم راستیانە بزانم ئەوسا ناوم بەوە دەروات کە من ئەو کاتەی کە دەست بۆتەوە یەکسەر یەکسەر سەروکایەتیم بە بەهای سپارتا کردووە، سەیریش نابێت کە زوو بەهۆشم بێننەوە. سەبارەت بە بۆچونی ئێوە کە هەبوونی یەك سەرلەشکر باشترە لە هەبوونی کۆمەڵێك فەرماندە، دڵنیا بن کە ئەگەر یەکێکی دیکە هەڵبژێرن من نابمە مایەی کێشە و گرفت. باوەڕم وایە کە لەکاتی جەنگدا هەرکەس ئاڵۆزی بۆ سەرکردەکەی دروست بکات، ئەم کەسە ئاڵۆزی بۆ خۆی دەنێتەوە. لەلایەکی دیکەوە ئەگەر من دامەزرێنم ئەوسا سەیرم پێ نایەت کە خەڵکێك پێی قەڵس بن، هەم بە پایەکەی من و هەم بە هەڵوێستی ئێوە.

پاش ئەم گوتارە خەڵکێکی زۆرتر هەستانەوە و داوایان لێ کرد قەبوڵی بکات. ئاگاسیاسی ستیمفاڵی گوتی کە ئەمە رایەکی پوچە و پرسیاری کرد: باشە، ئایا سپارتیەکان بەوەش تورە دەبن

[١] دیسان پێوەنان !

کە لەگەر خەڵکێك بۆ نانی ئێوارە پیاوێکی سپارتیان نەکردە سەرپشك؟ ئەگەر ئەوهایە کەواتە لێمەی ئەرکادی بۆمان نیە رابەرایەتی تیپێکیش بکەین. لێرەدا هەموو بەهاوار پشتی ئاگاسیاسیان گرت.

زینۆفۆن هەستی کرد کە نابێ مەسەلەکە ئەوهای بەجێبێڵێت، بۆیە چووە پێشێ و گوتی: برادەرینە، بۆ لەوەی خاترجەم بن، سوێند بە هەموو خواوەندەکان دەخۆم هەر کە زانیم بیر لە چی دەکەنەوە قوربانیم پێشکەش کرد بۆ لەوەی بزانم ئایا رابەرایەتی قەبوڵ بکەم یان نا؟ خواوەندەکان زۆر بە رۆنی لە دیمەنی گۆشتەکە دیاریان خست (هەندە رۆن و ئاشکرا بوو کەوا کەسێکی نەزانیش تێی دەگەیشت) کە نابێ فەرماندەیی تاکانە قەبوڵ بکەم.

ئیتر خیریسۆفۆسیان هەڵبژارد، پاش لەوەی هەڵبژێردرا ئەم قسانەی کرد: سور بزانن کە ئەگەر یەکێکی دیکەتان هەڵبژاردبایە، من دژایەتیم نەدەکەرد. هەرچۆنێك بێت، ئێوە چاکەتان لەگەڵ زینۆفۆن کرد کەوا هەڵتان نەبژارد، چونکە دێسکیپوس نیازی هەبوو تا پێی بکرێت ناوی لەلای ئەناکسیبیۆس بزرێنێت و من هەر خەریك دەبووم دەمی کپ بکەم. دێکسیپۆس گوتی زینۆفۆن وای پێ باش نەبووە رابەرایەتی لەشکرەکەی کلێرخۆس بە هاوبەشی لەگەڵ خۆیدا بکات چونکە دێکسیپۆس سپارتیە، کەچی پێی خۆش بوو بە هاوبەشی لەگەڵ تیماسیۆن بیکات چونکە ئەو داردانییە. جا کە ئێستا منتان هەڵبژارد، منیش خەریك دەبم کە خزمەتتان بکەم. ئامادەبن، سبەینێ ئەگەر هەواکە باش بوو بە دەریادا دەڕۆین. رێگامان بەرەو هیراکلیایە و کە گەیشتین ئەوسا باسی هەموو مەسەلەکان دەکەین.

## چاپتەر -٣-
# لەشکر دەبێتە سێ بەش

ڕۆژی دواتر بەدەریا کەوتنە ڕێ و بۆ دوو ڕۆژ بایەکی هەمواری دەهات بەدرێژایی لێواری جاسۆن. دەڵێن گوایە ئارگۆ Argo لێرە کوژراوە. زارکی ڕووبارەکانی تەرمۆدۆن و ئیریس و هالیس و پارتینیۆس لەوێ بوون. پاش ئەوەی لە پارتینیۆس تێپەڕین گەیشتنە هیراکلیا، شارێکی یۆنانی و کۆلۆنیەکی مێگارا Megara یە لە وڵاتی ماریاندینیەکاندا Maryandyni. کەشتیەکانیان لە نیمچە دوورگەی ئاخەرووسیا Acherusia هێشتەوە، لەم نیمچە دورگەی کە هەرکول چووەتە جیهانی ژووروو بۆ ئەوەی سیربەرۆس Cerberus بێنێت. نیشانەکانی گەشتەکەی هەرکول لەوێ مابوونەوە کە قوڵایەکەی چارەکە میلێك دەبوو. خەڵکی هیراکلیا دیاریی برادەرایەتیان نارد برتی بوو لە ٤٠٠٠ سەڵە جۆ، ٢٠٠٠ گۆزە شەراب، ٢٠ گا و ١٠٠ بەرخ. لەو ناوەدا ڕووبارێك هەبوو بەناوی لیکۆس کە ٢٠٠ پێ بەرین بوو بەنێو دەشتاییەکەدا دەڕۆیشت. لێرەدا سەربازەکان کۆنگرەیەکیان بەست بۆ ئەوەی بزانن ئایا گەشتەکەیان لە یۆکسین ڕا بەزەمین یاخۆ بەدەریادا تەوا بکەن؟

یەکی ئاخەیی ناوی لیکۆن بوو هەستایەوە و ئەم قسانەی کرد: برادەران، من سەیرم پێ دێت کە جەنەراڵەکان پارە نادەن بۆ بکرین. ئەم بەشە خۆراکەی کە پێمان گەیشت بەشی سێ ڕۆژ ناکەن، دەبێ خۆراك بۆ خۆمان پەیدا بکەین،بۆیەش دەبێ داوا لە خەڵکی هیراکلیا بکەین ٣٠٠٠ ستاتەری سیزیکۆس[1] بنێرن.

یەکی دیکە گوتی: دەبێ بەلای کەم ١٠٠٠٠ بێت و پێویستە هەر ئێستا شاندێك بۆ ئەم مەبەستە بنێرین و بزانین چ وەڵامێك دەدەنەوە، تاکو بەگوێرەی وەڵامەکە بجولێینەوە. ئینجا ناوی شاندەکەیان دانا، پێش هەموان خیریسۆفۆس چونکە سەرلەشکر بوو، ئینجا هەندێك کەس

---

[1] Staters of Syzicus. دیارە جۆرە دراوێکی بەنرخ بوە.

ناوی زینۆفۆلیان دانا. خیریسۆفۆس و زینۆفۆن هەردووکیان دژی پێشنیازەکە بوون چونکە باوەڕیان دەکرد نابێ هێز دژبە شارێکی یۆنانی بەکار بێنن. جا لەبەر ئەوەی هەردووك لاریان هەبوو، سەربازەکان لیکۆنی ئاخەیی، کالیماخۆسی پەرهاسیا و ئاگاسیاسی ستیمفالێی دادەنێن. ئەوانە چوون بۆ هیراکلیا و بڕیاری لەشکرەکەیان پێ گەیاندن دەڵێن لیکۆس هەندێکیش هەڕەشەشی کردبوو. خەڵکی هیراکلیا وەڵامیان دایەوە کە مەسەلەکە باس دەکەن، ئینجا یەکسەر هەموو شمەکیان لە دەرەوە هێنا بۆ نێو شوورەکانی شار و دەروازەکان قەپات کران و چەکدار لەسەر قەڵاتەکە راسان.

دەرەنجام جەنەراڵەکانیان تۆمەتبار کرد کە پلانەکەیان تێك داوە، ئەرکادی و ئاخەیی کۆبوونەوەیەکی جودایان بەست. سەرکردەکانیان کالیماخۆسی پەرهاسیا و لیکۆنی ئاخەیی بوون. بۆچوونەکەشیان ئەمە بوو کە مایەی سەرشۆڕیە ئەگەر ئەتینیەك و سپارتیەك، کەوا هیچ تیپێکیان بۆ لەشکرەکە نەهێناوە، رابەرایەتی لەسەر پیلۆپۆنیزیەکان بکەن. ئەوان کارە سەختەکانیان ئەنجام داوە کەچی خێرەکە بۆ خەڵکی دیکە دەچێت، لە کاتێکیشدا کەوا ئەگەر ئەرکادی نەبان ئێستا ئەوان بە زیندویی نەمابوون. بەشی دیکەی لەشکرەکە بەحاڵ جێ دەستیان هەبوو (لەراستیشدا پتر لە نیوەی لەشکرەکە ئاخەیی و ئەرکادی بوون) جا گوتیان ئەگەر هۆشیان هەبێت، دەبێ جەنەراڵ بۆخۆیان هەڵبژێرن و بەجودا رەفتار بکەن تاکو سودێکیان بۆ خۆ هەبێت.

ئەمە بوو کە بڕیاریان لەسەر دا. ئەو ئەرکادی و ئاخەییانەی کە لەژێر فەرماندەیی خیریسۆفۆس و زینۆفۆندا بوون بەجێیان هێشتن و رەگەڵ وان کەوتن و ١٠ جەنەراڵیان هەڵبژارد کە دەبێ بە پێی بڕیاری گشتی بڕۆن. بەم جۆرە، رابەرایەتی خیریسۆفۆس پاش شەش- هەفت رۆژێك کۆتایی هات.

زینۆفۆن نیازی هەبوو رەگەڵیان بکەوێت چونکە بە ئاسوودەتری زانی بەتەنیا نەڕوات، بەڵام لیۆن پێی سەلماند کە لەگەڵ وی بڕوات. لە خیریسۆفۆسی بیستبوو کەوا کلێندەر، حوکمڕانی بیزەنتیۆم، پێی گوتووە کە بە هەندێك کەشتیی بچووکەوە دێت بۆ بەندەری کالپ Calp لێرە لەم ئامۆژگاریەی بە زینۆفۆن گوت بەمەرجێکی کە بەکەس نەڵێ، چونکە هەر خۆیان و سەربازەکانیان

ئەو گەشتە دەکەن بۆ ئەوەی لە یۆکسین دەرباز بن. خیریسۆفۆس بەم رووداوانەی دوایی زویر بوو، بە زینۆفۆنی گوت با بەنارەزوی خۆی بکات، زینۆفۆنیش هێشتا حەزی دەکرد لەشکرەکە پەرت نەبێ، بەلام کە قوربانیەکی کرد بەنیازی کە بزانێت ئایا لەگەڵ سەربازەکانی تیرە بمێنێتەوە یاخۆ هەموویان بەجێ بیلێت؟ خواوەندەکان دیاریان خست کە دەبێ لیرە بمێنێت. بەم پێیە، لەشکر بووبە سێ بەش، ئەرکادی و ئاخەیی ٤٠٠٠ کەس دەبوون، یەك پارچە هۆپلیت. لینجا ١٤٠٠ هۆپلیت لەگەڵ خیریسۆفۆس بوون سەرباری ٧٠٠ پەلتاستی تراکی کە لەکاتی خۆیدا کلێرخۆس هێنابوونی. ئەوجار لەگەڵ زینۆفۆن ١٧٠٠ هۆپلیت و ٣٠٠ پەلتاست هەبوون. زینۆفۆن تاکە کەسێك بوو هێزی سوارەی هەبێت کەوا ٤٠ سوارێك دەبوون.

ئەکاردیەکان کەشتی لە هیراکلیا پەیدا دەکەن و دەر دەچن بەنیازی ئەوەی کە بەسەر بیزەنتیۆم دادەن و تا بکرێ تالان لەگەڵ خۆیان بەرنەوە، گەیشتبوونە بەندەری کاپلێ لە شوێنێك لە ناوەندی تراکیادا. خیریسۆف لە شاری هیراکلیا بە رێگای زەمینی بەنێو ولاتی هیراکلییەکاندا رۆیشت. کە گەیشتە سنووری تراکیا، لەوێ را بەدرێژایی لێوارەکە رۆیش، لەوێ نەخۆش کەوت. زینۆفن هەندێك کەشتی دابین کرد و لەنێوان تراکیا و ولاتی هیراکلیا دابەزی، لەوێش را بە رێگای زەمینی رۆیشت.



## چاپتەر -٣-
## زینۆفۆن ئەرکادیەکان رزگار دەکات

چارەنووسی هەر بەشێك بەم جۆرە بوو.

ئەرکادیەکان بەشەو گەیشتنە بەندەری کاپل و بەسەر یەکەم لادێیان دادا کە سێ فەرسەخ لە لێوارەکە دوور بوو. کە رۆژناکی پەیدا بیوو، هەریەك لە فەرماندەکان هێزێکی بەرەو گوندێك برد، و ئەگەر گوندەکە گەورەبایە هێزەکانیان تێك دەکردەوە و پێکەوە هێرشیان دەکرد. هەروەها بنکەیان لەسەر گردێك دانا تا ببێتە مەڵبەندی کۆبوونەوەیان وە لە ئەنجامی هێرشی کتوپڕدا، هەندێك یەخسیر و گاڕانیان دەست کەوت. بەڵام ئەو تراکیانەی کە هەڵاتن خۆیان گرتەوە و هێزیان ساز کرد. هەروەها بەهۆی کەوا هێزی سووك بوون، توانیان لە دەستی هۆپلیتەکان دەرباز بن. تراکی کە خۆیان دەگرنەوە، پێشیَ پەلاماری هێزەکەی سیمیکرین دەدەن کە یەکێك بوو لە جەنەراڵە ئەرکادیەکان. لەوانە خەریکی گەڕانەوە بوون بۆ سەر گردەکە و تالانێکی زۆریان پێبوو. تا ماوەیەك توانیان قونەشەڕ بکەن بەڵام کە گەیشتنە سەر جۆبارێك، تراکیەکان رایانماڵین و زۆریان لیَ کوشتن، یەك لەوانە خودی سیمیکریس. سەبارەت بە تیپەکانی دیکەی ئەو ١٠ جەنەراڵانە، تیپەکەی هێگەساندەر تەنیا هەشت کەسی ما، یەك لەوانە هێگەساندەر بوو کە هەڵات، تیپەکانی دیکە هەندێك بەبیَ کێشە و هەندێکیان پاش شەڕی سەخت یەکتریان گرتەوە.

پاش ئەم سەرکەوتنەی تراکیەکان، هێزەکانیان لەیەك شوێن کۆکردەوە و بەری بەیانی بە باوەڕێکی توندەوە دەوری گردەکەیان گرت. سوارە و پەلتاست لە گشت لایەکەوە دەهاتن کەوا بۆ پەلاماردانی یۆنانیەکان نەدەترسان خۆیان چونکە یۆنانیەکان تیرەنداز و رمهاوێژ و سوارەیان نەبوو، دەبایە بەغار برۆن تاکو بتوانن چەکەکانیان بەکار بێنن، و تا ئەوان دەجولانەوە تراکیەکان زوو دەکشانەوە و پەلاماری لایەکی دیکەیان دەدا. لایەك برینداری زۆر بوو،

لەلایەکەی دیکە یەك بریندارى نەبوو، لەئجامیش ئەوە بوو کە یۆنانیەکان توانای جولّەیان نەما، تەنانەت لە سەرچاوەکانی ئاویش دابران. لەو بارە سەختەدا داوای گفتوگۆیان کردبوو، لەسەر چەند خالّێك پێك هاتبوون بەلاّم کە ئەرکادیەکان داوای یارمەتیان کردبوو، گفتوگۆ هەلّوەشایەوە، ئیتر ئەرکادیەکان ئەوهایان بەسەر هات.

لەو میانەدا خیریسۆفۆس بە ئاسوودەیی بە لێوارەکەدا چوو تا بەندەری کاپێ. زینۆفۆن بە ڕێگای زەمیندا چوو، سوارەکانی تووشی هەندێك پیرەمێردی ناوچەکە بوون، بۆ زینۆفۆنیان هێنان. کە پسیاریان لێ کرا ئایا هەوالّی لەشکرێکیان بیستوە؟ گوتیان وا لەسەر گردێك چوار دەوریان گیراوە. زینۆفۆن ئەم پیاوانەی دەستبەسەر کرد تا لەکاتی پێویستدا بەکەلّك بێن. پاسەوانی دانا و کۆبوونەوەیەکی بە سەربازەکان کرد بەم جۆرە: سەربازینە، هەندێك لە ئەرکادیەکان کوژراون و ئەوانی دیکە لەسەر گردێك گەمارۆ دراون. بەڕای من ئەگەر ئەوان قەلاّچۆ بکرێن، بەرانبەر دوژمنێکی ئەوهادا ئەوسا ئاسوودەیی بۆ ئێمەش نامێنێت. باشترین شت ئەوەیە کە بەهانایانەوە بچین تا ئەگەر لەویّ مابن لەپالّ ئەواندا شەڕ بکەین و بەتەنیا نەمێنین. دەربازبوونمان بە هیچ لایەکدا نیە، ڕێگای گەڕانەوەش بۆ هیراکلیا و ڕێگای بەرەو خریسۆپۆلیس دوور و درێژن و دوژمنیش نزیکن. کورتترین ڕیّ بۆ بەندەری کاپێ دەڕوات کە ڕەنگە خیریسۆفۆس گەیشتبێتە ویّ. ڕەنگە بلّێن ئاخر کەشتیمان نیە کە سوار بین و وورامان نەماوە، بەلاّم گریمان گەمارۆدراوەکان کوژران، ئەوسا ئەرکەکەمان لە بەندەرەکەدا قورستر دەبێت لەچاو ئەوەی کە هەر ئێمە و خیریسۆفۆس بیکەین. نەخێر، یان بە سەربەرزی دەمرین و یان ئەوەتا کاری مەردانە بە ڕزگارکردنی چەند یۆنانییەك ئەنجام دەدەین. ڕەنگە خواستی ئاسمان ئێمەی گەیاندبێتە ئێرە بۆ ئەوەی چەند لوتبەرزێك، ئەوانەی کە خۆیان بە شارەزا دەزانی، ئەوانە سەرشۆڕ بکرێن و بۆ ئەوەی ئێمە، کە بەبیّ پرسی خواوەندەکان دەستمان لەم گەشتە نەداوە، ئێمە سەربەرز بین. ئێستا دەبیّ بەدوام بکەون و هەمیشە وریا بن تا فەرمانەکان بەجیّ بگەیێنن. تا لای ئێوارە دەڕۆین، ئەوسا ئۆردوگا دادەکوتین، و لەکاتی ڕێپێواندا با تیماسیۆن و سوارەکانی لەپێشمان بڕۆن، چاویان لە ڕێگا بێت.

پاش ئەم گوتارە بەرەو پێشی بردن. باڵەکانی هێزەکەی ئاواڵە کرد و پەلتاستە لەشسووکەکانی دەناردە سەر بەرزاییەکان. فەرمانی دا ئاگر لە هەموو شتێك بەردەن، سوارەکان لەسەر بەرزایی و لەسەر باڵەکاندا هەموو شتێکیان سووتاند، تەنی هێزە سەرەکیەکەش هەمان شتیان کرد وەك ئەوە بوو لەشکرێکی زل بەرێوە بێت.

کە کاتی خۆی هات، بەسەر گردێك هەڵکەڕان و رەشماڵیان هەڵدا. ئاگری ئۆردوگای دوژمن چوار فەرسەخ دوور بوو، ئەوانیش ئاگرێکی زۆریان هەڵگیرساند، و کە نان خورا، فەرمان درا ئاگرەکان بکوژێننەوە. شەو پاسەوانیان بڵاو کردەوە و بەیانی زوو بەشێوازی جەنگی ریزیان بەست و پێشرەوییان کرد. سوارەکان زووتر گەیشتنە سەر گردەکە. نە دۆستی لێ مابوو نە دوژمن، ئەوەی دیتیان تەنیا هەندێك ژن و منداڵ و پیرەمێرد بوون لەگەڵ هەندێك مەڕ و گا بەجێ مابوون. سەرەتا تێنەگەیشتن چ رووی داوە بەڵام کە پرسیان گوتیان تراکیەکان بەشەو کشاونەوە و دواتر یۆنانیەکانیش بەلایەکی نەزانراودا رۆیشتون.

کە پیاوەکانی زینۆفۆن ئەمەیان بیست، جەمە نانێکیان خوارد و زوو بەرێ کەوتن تاکو لە بەندەری کاپڵ پێیان رابگەنەوە. لە رێگادا شوێنپێی ئەرکادیەکانیان دەدیت و کە گەیشتنەوە یەك، پێك گەشانەوە و بەچەشنی برادەر بۆ یەکتر چوون. ئەرکادیەکان لە پیاوەکانی زینۆفۆنیان پرسی بۆچی ئاگرەکانتان کوژاندەوە؟ کە ئەوەمان دیت وا تێگەیشتین دوژمنن و دەیانەوێ بەشەو هێرش بکەن. وا دیار بوو کە دوژمنیش بەهەمان شێوە تێی گەیشتبوون بۆیە چۆڵیان کرد. بەڵام کە ئێوە پەیدا نەبوون، وامان زانی بۆ دەریا کشاونەوە، ئیتر ئێمەش بڕیارمان دا کە بەجێ نەمێنین.

## چاپتەر -٤-
## لەشکر دەبێتەوە یەك
## ئاڵۆزی لە پەیداکردنی خۆراکدا

بۆ لەو رۆژە لۆردوگایان لەلای بەندەرەکە دانا. ناوچەکە پێی دەگوترا تراکیای ئاسیەوی، لەو ناوچە دەگرێتەوە لە زارکی یۆکسین تا هیراکلیا. کەشتیەکی کە بە دارەدەف بڕوات، لە بیزەنتیۆمەوە تا هیراکلیا رۆژێکی سەرلەبەر دەبات. لەو میانەشدا هیچ شارێکی یۆنانی و شاری هاوپەیمانی لێ نیە تەنیا تراکی و بیسینی Bithynians. ئەمانەش رەفتاری باش لەگەڵ هیچ یۆنانیەك ناکەن ئەگەر بکەوێتە بەردەستیان. بەندەری کاپڵ لەنیوەرێی نێوان بیزەنتۆم و هیراکلیایە، پارچە زەقاییەکە هاتۆتە نێو دەریا و رۆخەکەی هەورازێکی زۆر تیژە، نزمترین رۆخی روبەرەکەی ٢٠ فاتۆم دەبێت، گەردنی زەقایەکەش کە بە دەشتەکەی دەگەێنێ ٤٠٠ پێ درێژە، پانتاییەکەش جێی ١٠٠٠٠ کەسی لەسەر دەبێتەوە. بەندەرەکە راستەوخۆ لەژێر زەقاییەکەیە، رووی بەرەو خۆرئاوایە، کانیاوێکی باش لێیە، داری سوتەمەنی و بڕکەداری گەورەش لەوێدا زۆرن کە بەکەڵکی دروست کردنی کەشتی بێن. چیا هەیە لە دووری دوو فەرسەخ، زەویەکەش خاکێکی نەرمە بەبێ بەرد و شاخ و روتەن، و تەنیشتەکان دراستانێکی چڕن بەدرێژایی دوو فەرسەخ. هەروەها ناوچەکەی دەوروبەر زەنوێرە و کۆمەڵێك گوندی ئاوەدانی لێیە. گەنم و جۆ و کونجی و هەنجیر و کۆمەڵێك دار میوە کە شەرابی باشیان دەدا و هەموو شتێکی لێ بوو تەنیا زەیتون نەبێت[1].

ولاتەکە ئەوها بوو، ئەوانە نەیانویست لە نزیك قەلاتەکە دابەزن نەبادا وا تێبگەن کە دەیانوێ شارەکە داگیر بکەن. سەربازەکان لە هیچەوە رەگەڵ ئەو لەشکەرە نەکەوتبوون بەڵکو ناوبانگی کۆرووشیان بیستبوو کە پیاوێکی بدەر و بەجەرگە. هەندێکیان دەست و پاوەلدیان لەگەڵ خۆ هێنابوو، هەندێکیشیان پارەیان لە شتەکی گەشتەکە خەرج کردبوو، هەندێکیشیان خزم و

---

[1] وەك چۆن کورد بایەخ بە (برنج خواردن) دەدات، دیارە یۆنانیش لە کاتی خۆیدا بەبێ زەیتوون نەدەژیان.

کەسیان بەجێ هێشتبوو بەئومێدی پارە پەیداکردن چونکە دیتبویان ئەوانەی لەگەڵ کۆرش کار دەکەن دەسکەوتی پاشیان دەبێت.

لە بەرەبەیانی رۆژی دووەمدا پاش یەکگرتنەوەی دوو هێزەکە، زینۆفۆن قوربانیەکی کرد بە ئومێدی گەشتێك کەوا لەشکرەکە بیکات بۆ دەرەوەی ئۆردوگا. مەسەلەکە ناچاری بوو دەبایە خۆراك پەیدا بکەن و مردووەکانیش بنێژن. کە نیشانەکان دیاردەی پاشیان دا، ئەرکادیەکانیش لەگەڵی چوون. تەرمەکان پێنج رۆژ بوو کەوتبوون ئیتر ئەوەیان پێ کرا کە کۆیان بکەنەوە و بە باشترین شێواز بیانێژن و ئەوانەی نەدۆزرانەوە نیشانەی تایبەتیان بۆ دروست کردن. ئینجا گەڕانەوە بۆ ئۆردوگا، جەمێکیان خوارد و کردیانە شەو.

رۆژی دواتر لەسەر داوای کاپتەکان کۆبوونەوەیەك بەسترا. ئاگاسیاسی ستیمفالی و هیەرۆنیمۆسی ئالیان بڕیارێکیان سەپاند کە لەمەو پاش هەرکەس خەریکی لەتکردنی لەشکر بێت دەبێ بکوژرێت و دەبێ لەشکر بگەڕێتەوە شێوازی پێشوو و کۆنە جەنەراڵەکان بگەڕێنەوە سەر کار. هەر لەو ماوەیەشدا خیریسۆفۆس تای گرتبوو و بەهۆی خواردنی دەرمانێکەوە مردبوو، ئیتر نینۆنی ئاسین جێی گرتەوە.

پاش سەپاندنی ئەم بڕیارە زینۆفۆن ئەم قسانەی کرد: سەربازەکان، وادیارە ناچارین گەشتەکە بە پێ تەواو بکەین چونکە کەشتی دەست ناکەون. دەبێ ئێستا دەست پێ بکەین، خۆراکمان نیە و ناتوانین لێرە گیر بین. لەم پێناوەشدا قوربانیەك دەکەینە خێر و ئێوەش دەبێ لەجاران ئامادەترن بن بۆ شەڕ چونکە دوژمن باوەڕی بەخۆی پەیدا کردووە.

لەسەر دەستی ئەلیکسیۆنی ئەرکادی، کە فالگر بوو، جەنەراڵەکان قوربانیەکیان گێڕا، سیلانۆسی ئەمبراکیا کەشتیەکی بەکرێ گرتبوو و گەڕابۆوە ماڵێ خۆی. قوربانیەکە بەنیازی گەڕانەوە بوو بەڵام نیشانەی باشی نەدا، ئیتر ئەو رۆژە پاڵیان دایەوە. هەندێك لەوانەی کە لەڕوویان هاتبوو بڵێن زینۆفۆن دەیەوێ شارێك بدۆزێتەوە، بە فالگرەکەیان گوت کە بڵێت نیشانە ئاسمانیەکان بەکەڵکی گەشتەکە نایەن. جا بەهۆی ئەوەی کە هەموو کەسێك بۆی هەبوو تەماشای قوربانیەکان بکات، زینۆفۆن هەندێك فالگرەوەی هێنا تەماشای کوشتەکان بکەن.

لەگەرچی سێ جار قوربانی کرا، بەڵام نیشانەی باشیان نەدا. سەربازەکان بێزار بوون چونکە لەو تفاقەی هەیانبوو بەشی هیچی نەدەکرد و خۆراك لەو نزیکانە دەست نەدەکەوت.

پاش ئەمە دیسان کۆبوونەوە بەسترا و زینۆفۆن گوتاری ئاراستە کردن: براددەرەکانم، وەڵا دەبینن نیشانە ئاسمانیەکان رێگا نادەن بڕۆین و خۆراکیش وا لەبەرالدایە. بۆیە وابزانم دەبێ هەر ئێستا قوربانیەکی دیکە بکەین.

یەکێك هەستایەوە سەر پێ و گوتی: نیشانە لەبەر هۆیەکی باش ئەوها دەردەچن، هەر دوێنی بیستمان کەوا کلیندەر، حوکمرانی بیزەنتیۆم، بە کەشتیەوە دێت بۆ ئێرە.

هەموو رایان وابوو کە بمێنن بەڵام هەر دەبوو خۆراك پەیدا بکەن. ئەمجارە سێ قوربانیان بەنیازی دەرچوون کرد کەچی نیشانەکان باش نەبوون، ئەوجار سەربازەکان هاتنە لای رەشماڵەکی زینۆفۆن و بێزاریان دەربڕی کەوا خۆراکیان دەست ناکەوێت، بەڵام زینۆفۆن رەتی کردەوە کە بەبێ نیشانەی ئاسمانی رابەرایەتیان بکات بۆ گەشتێکی ئەوها.

رۆژی دواتر قوربانیەك کرا و لەبەر ئەوەی هەموو مەراقیان بوو، لەشکر کۆبوونەوە ئاژەڵەکە نیشانەی باشی نەدا و جەنەراڵەکان رابەرایەتی هەڵمەتیان نەکرد. واش هەر کۆبوونەوەیەکیان بەست کە زینۆفۆن لەوێدا گوتی: رەنگە دوژمن بە هێزێکی گەورە بۆمان دانیشتبن، جا ئەگەر بارگەمان لە شوێنێك قایم بکەین و بەشێوازی جەنگی بۆیان دەربچین، رەنگە ئەوسا ئاسمان رێگا بدات. کە سەربازەکان ئەمەیان بیست، یەکسەر هاواریان کرد کە پێویست ناکا بارگەیان بگوازنەوە، با هەر ئێستا رێورەسمی قوربانیەکە بگێڕن. بەرخیان نەمابوو لێرە چەند گایەکی لاوازیان کڕی، زینۆفۆن کلینۆری ئەرکادیی دەنگ دا کە ئەگەر نیشانەکان باش بن یەکسەر دەردەچن، واش هەر نیشانەکان باش نەبوون.

نیۆن جێگی خیریسۆفۆسی سەرلەشکری گرتبۆوە، کە پیاوەکانی بەم حاڵە دیت، ویستی شتێك بکات. پیاوێکی لە هیراکلیا هێنا گوایە شارەزای چەند گوندێکە و گوتی ئەوەی ئارەزوو دەکات با ساز بێت لەگەڵ رێناسەکە بچێتە ئەو گوندانە. ئەوسا ٢٠٠٠ پیاو ساز بوون، رمی کورت و جۆرەها تەلیس و کیسەیان لەگەڵ خۆ برد، بەڵام کە گەیشتنە گوندەکان و بۆ کۆکردنەوەی خۆراك بڵاو بوونەوە، تووشی سوارەکانی فەرناباز Phernabazus بوون. لەوانە بۆ

پارمەتیی بیسینیەکان هاتبوون بۆ بەرپەچدانەوەی یۆنانیەکان و بۆ ئەوەی ئەگەر بکرێت رێگای قریجیایان لێ بگرن. لەم سوارانە بەلانی کەم ٥٠٠ یۆنانیان کوشت و ئەوانی دیکە هەلاتن بۆ چیاکان.

یەك لە هەلاتوەکان گەیشتەوە ئۆردوگا و خەبەرەکەی راگەیاند. زینۆفۆن یەکسەر گایەکی لە عەرەبانەیەك کردەوە (چونکە هیچی دیکە نەمابوو بۆ قوربانی). پاش قوربانیەکە (کە بۆ رزگارکرنی پیاوەکان کرا و کەوا ئەمەنیان لە ٣٠ سالّ زیادتر نەبوو) کەوتنە رێ. زیندوەکانیان کۆکردەوە و گەرانەوە بۆ ئۆردەگا.

رۆژ ئاوا بوو، یۆنایەکان لەوپەڕی خەمدا بوون، نانی ئێوارەیان سازکرد و لەناکاو بە تاریکی هەندێك بیسینی پەلاماریان دان، هەندێکیان لە ریزەکانی دەرەوە کوشت و ئەوانی دیکە بۆ نێو ئۆردوگا هەلاتن. هات و هاوارێکی گەورە کرا و هەموو تاویان دایە چەك بەلام دارستانەکە زۆر تاریك بوو، نەدەکرا هێرشی بۆ بەرن، نەش دەکرا بەو شەوە ئۆردوگا بگوازنەوە. ئیتر پاسەوانیان بلاو کردەوە و خۆیان دانوساند، شەوەکەیان لەوها بەسەر برد.

## چاپتەر -٥-
# سەرکەوتنێك بۆ یۆنانیەکان

بەیانی شمەکیان کۆکردەوە بۆ شوێنێکی قایم. پێش نالی نیورۆ کەندێکیان لەدەوری شوێنەکە هەڵکەند و سەنگەریان بەدرێژایی کەندەکە دروست کرد. کەشتیەکیش لە هیراکلیاوە گەیشت، جۆ و گا و شەرابی هێنابوو.

زینۆفۆن بەیانی زوو هەستا و بەنیازی دەرچوون قوربانیەکی کرد. لە یەکەم کوشتەدا نیشانەکان باش نەبوون. هەر کە قوربانیەکە تەواو بوو، فالگر ئەریکۆنی پەرهاسیا بازێکی لە ئاسمان دیت کە نیشانەی خۆشبەختیی دەدا، بە زینۆفۆنی گوت لەشکر بەرێت. ئیتر لە کەندەکە پەڕینەوە و ریزیان بەست، گوتیشیان با یەخسیرەکان و قەرەباڵغاییەکە لەنێو ئۆردوگا بمێنن. وا بەباش زانرا کە نیۆن لە ئۆردوگاکە بمێنێت بەلام کە دەرچوون ئەوانی دیکە شەرمیان بەخۆ هات و رەگەڵ کەوتن. تەنیا ئەوانەیان بەجێ هێشت کە تەمەنیان لە ٤٥ بەرەو سەر بوو. دوو فەرسەخیان نەبڕیبوو کە گەیشتنە تەرمی مردووەکان. ریزەکانی پاشەریان هێنا بۆ ئەوەی مردووەکان بنێژن، هەندێکیان ناشت و دەستیان هەڵگرت تاکو تاقمێکی دیکە تەواوی بکەن. کە گەیشتنە گوندەکان، تەرمێکی زۆر کەوتبوون، کۆیانکردنەوە و ناشتیانن.

پاشنیورۆ بوو کە راستەوخۆ بۆ نێو گوندەکان چوون. سەربازەکان هەرچی دەستیان گەیشتێ لەسەر رێگا هەموویان برد. لەناکاو دوژمنیان دیت، کۆمەڵێك سوارە و پیادە لەسەر گردێك ریز ببوون، ئەوانە سپیریداتیس و راتینیس بوون کە لە فەرناباز‌ەوە لەگەڵ هێزێکی گەورە هاتبوون.

دوژمن فەرسەخ و نیوێك دوور لە یۆنانیەکان وەستان. ئەریکسۆنی فالگر یەکسەر قوربانیەکی کرد و نیشانەکان باش بوون. ئینجا زینۆفۆن قسەی بۆ سەربازەکان کرد: وا باشە هێزێك لە پاشەر دابنێین تا لەکاتی تەنگانەدا بەهانای ریزەکانی پێشەر بێن. هەروەها ئەگەر لیەکان لێك ترازان، ئەوانە ئامادەی شەڕ بن و بەرەنگاری ئەوانە بن کە هێشتا نەکەوتونەتە شەڕ.

هەموو قسەکەی زینۆفۆنیان پەسند کرد و زینۆفۆن گوتی: ئێوە پێشڕەوی دەکەن، نامەوێ هیچی تر بوەستین کەوا لەوان دەمانبینن و دەیانبینین. ئێستا دەگەمە وێ پاش ئەوەی ریزەکانی پاشەر ریك دەخەم، هەر وەکو کە ئێوەش پێی رازی بوون.

لینجا پێشڕەویان کرد و زینۆفۆن لەدواوە سەرپەرشتی سێ تاقمی دەکرد هەر تاقمێك لە ۲۰۰ کەس پێك هاتبوون. فەرمانی بە تاقمی یەکەم دا کە ۱۰۰ پێ لەنێوان خۆیان و باڵی راستی لەشکر بەجێ بهێڵن، سامۆلاسی ئاخەیی لەسەر ئەم هێزە بوو. تاقمێکی دیکەی لە ناوەڕاست دانا لەژێر فەرمانی پیریۆسی ئەرکادی، تاقمی سێیەمیش لەلای چەپدا لەبەر دەستی فاسیاسی ئەتینی، ئەوجار پێشڕەویان کرد. تاقمی پێشەر بەسەر کەندێکی پڕ لە دار و دەرختدا کەوتن، جوڵە لەوێدا ئاسان نەبوو، راوەستان بزانن ئایا دەتوانن لە کەندەکە بپەڕنەوە؟ پاشەوپاش خەبەریان بۆ جەنەراڵەکان ناردەوە کە بگەنە پێشەر. زینۆفۆن گوتی ئایا چ شتێك پێشڕەویەکەی راگرتووە؟، هەر کە بیستی یەکسەر ئەسپەکەی تاو دا. کە کۆبوونەوە، سۆفەینەتۆس لەهەموو جەنراڵەکان بەتەمەنتر بوو گوتی مەسەلەی پەڕینەوەی کەندێکی ئەوها مایەی باسکردن نیە. زینۆفۆن زوو گەیشتە وێ و گوتی: برادەرینە، ئێوە باش دەزانن کە من نەهاتووم تووشی مەترسیتان بکەم. باش دەیزانم کەوا ئێوە ژیانتان پێ باشترە لە ناوبانگی ئازایەتیان. بەڵام مەسەلەکە ئێستا بەم جۆرەیە، ئێمە ناتوانین بەبێ شەڕ لێرە دەرباز بین. ئەگەر بکشێینەوە، دوژمن راومان دەنێت، کەواتە دەبێ بیر بکەینەوە ئایا کام رێگا باشترە؟ ئایا بەچەکەوە بەرەو روویان بچین، یان پشتیان تێبکەین و بەدوامان بکەون؟ دەزانن کە پشت لەدوژمن کردن شتێکی پیاوانە نیە کەچی راونان ناپیاویش ئازا دەکات. یەك لەبارە خۆمەوە حەز دەکەم لەحاڵەتی هێشردا نیو هەندە چەکدارم هەبێت، لەچاو ئەوەی کە دوو هەندە چەکداری هەڵاتوم هەبن. سەبارەت بەم دوژمنانەش، دەزانم کە لەوان باوەڕ ناکەن پێمان بوێرن بەڵام ئەگەر بکشێینەوە ئەوسا ئازا دەبن و راومان دەنێن. ئەگەر دەمەقاڵێ بکەن و بڵێن ئێمە لە پێشڕەوی داین و پەڕینەوەی کەندەکە وا دەکا پشتمان بێتە هەڵدێر. جا ئایا باشتر ئەوە نیە کە ئەوها بکەین؟ حەز دەکەم دوژمن وابزانن کە رێگای هەڵاتنیان بە هەموو لایەکدا هەموارە. بەپێچەوانەش، با ئێمە وا هەست بکەین کە رێگای سەلامەتیمان تەنیا لە سەرکەوتندایە. هەروەها سەیرم پێ دێت وابزانن ئەم کەندەی ئێرە

لەو هەموو دەوروبەرە سەختترە. ئێمە چۆن دەتوانین ئەوهەموو دەشتاییانە ببڕین بەبێ ئەوی سوارەکانیان بەزێنین؟ چۆن دەتوانین ئەوهەموو چیایانە ببڕین لەکاتێکدا کە پەلتاستەکانی دوژمن بەدوامانەوە بن؟ خۆ ئەگەر بە سەلامەتیش گەیشتینەوە دەریا، ئەوسا هەموو یۆکسین لێمان دەبێتە کەندێکی گەورە. نە کەشتیی لێیە پێی بچینەوە و نە خۆراك هەیە پێی بژین، ئیتر هەر ناچار دەبین بۆ دابینکردنی خۆراك هێرشێکی ئەوها بکەینەوە. کەواتە باشتر ئەوەیە ئێستا شەڕەکە بکەین، خۆ هەرنەبێ ئێستا جەمە نانێکمان خواردووە، نەك سبەینێ بە زگی برسی بیکەین. هاوسەنگەرەکان، قوربانیەکان نیشانەی ئاسمانیی باشیان هەبوو، با بۆیان بچین، گومان نیە کە ئێمەیان دیتوە و خۆش نیە بهێڵین ئەوانە نانی ئێوارە بە هێمنی بخۆن.

پاش ئەمە، کاپتنەکان بە زینۆفۆنیان گوت رابەرایەتیان بکات و کەس لاری لەمەدا نەکرد. بۆیەش رابەرایەتی وەرگرت و فەرمانی دا کە هەرکەس کەندەکە لەجێی خۆیەوە بپەڕێتەوە. باوەڕی وابوو کە بەم جۆرە لەشکرەکە یەکپارچە و توندتر دەمێنێت لەچاو ئەوەی کە بەسەر پردەکەدا بپەڕنەوە. پاش پەڕینەوە، زینۆفۆن بەدرێژایی ریزەکاندا هات و ئەم قسانەی کرد: سەربازینە، ئەوهەموو شەڕەتان لەبیر بێت کەوا بەهێزی خواوەندان و پشت بە یەك ئەستور تێدا سەرکەوتن. ئەوەشتان لەبیر بێت کە ئەوکەسانەی هەڵدێن چییان بەسەر دێت. بیر لەمەش بکەنەوە کەوا ئێمە گەیشتوینە سنووری یۆنان. پێشکەون دەبا هەرکولیسی رێناس رێنماتان بێت. کە دەشڕۆن، سەرکردەکان بەناوی ئاسایی خۆیان بانگ بکەن. شتێکی خۆشە ئەگەر بزانین کەوا ئێستا هەرکەس قسە و کردەوەیەکی مەردانە بنوێنێت، ناوی ئەو کەسە هەمیشە لەیادی ئەو خەڵکەدا دەمێنێت.

ئەمە بوون قسەکانی زینۆفۆن کە بەپێش لەشکرەکەدا دەرۆیشت و لەهەمان کاتیشدا دەستی پێکرد بەرەو شەڕەکەیان بەرێت. فەرمان درا رمبەکان بە بەرزی رابگرن تا ئەو کاتەی کە شەیپوور دەژنرێت ئەوسا دەبایە رمبەکان شۆڕ بکەنەوە بۆ ئاستی دوژمن، ئینجا ناوی نهێنی بڵاو کرایەوە (زیۆسی رزگارکەر، هەرکولی رێبەر).

دوژمن لە شوێنی خۆیان نەبزوتن، وابانزانی شوێنەکەیان قایمە. کە نزیك بوونەوە، پەلتاستەکان بەبێ فەرمانی کەس هاواریان بەرز کردەوە و رایان کرد بۆ دوژمن. دوژمنیش بە

هەردوك بەشەوە، سوارەکان و پیادە بیسینیەکان، هێرشیان کرد. پەلتاست کشانەوە، بەڵام کە هۆپلیتەکان بە هەنگاوی سووك گەیشتنە سەری، شەیپوور ژەنرا و سروودی پایان خوێنرا و نەعرەتەی جەنگ بەرز کرایەوە و رمبەکان بۆ هێرش ئاراستە کران، ئەوسا دوژمن هیچی تر خۆیان نەگرت و هەڵاتن. تیماسیۆن و سوارەکانی بەدوایان کەوتن و تا دەستیان هەبوو لێیان کوشتن. باڵی چەپی دوژمن کە بەرانبەر سوارەکان بوو یەکسەر شکا، بەڵام باڵی راست کەوا هێشتا تینی نەگەیشتبویێ، خۆیان لەسەر گردێك رێکخستەوە، کە یۆنانیەکان ئەمەیان دیت، باشترین شت ئەوە بوو کە یەکسەر پەلاماریان بدەن، ئیتر سروود خوێندرا و یەکسەر هێرشیان کرد. دوژمن خۆیان نەگرت، ئینجا پەلتاستەکان راویان نان تا باڵی راستێش بەیەکجاری هەڵوەشا. کوژراویان زۆر نەبوو چونکە سوارەکانی دوژمن هێزێکی گەورە بوون و هەمیشە مەترسیان دەخستە سەر یۆنانیەکان.

یۆنانی دیتیان کەوا سوارەی فەرناباز ریزەکانی خۆیان تێك نەدابوو، هەروەها سوارە بیسینیەکان لەگەڵیان کۆ دەبوونەوە و لەسەر گردەکە تەماشای خوارێیان دەکرد، ئەگەرچی ماندوو ببوون بەڵام بڕیاریان دا هێرش بکەنە سەر سوارەکانیش و تا هەناسەیان ماوە نەهێڵن باوەڕیان بە خۆ بێتەوە. ریزیان بەست و هێرشیان کرد، لەوسا وەك بڵێی سوارە راویان دەنێن، ئەوها هەڵاتن. کەندێك لەوێ بوو یۆنایەکان شارەزای نەبوون، ئەمە بوو دوژمنی پاراست. سەبارەت بە یۆنانیەکانیش، وازیان لە راونان هێنا چونکە درەنگ داهاتبوو، ئینجا گەڕانەوە جێی خۆیان. شوکرانەیان کرد و کاتی رۆژئاوا گەیشتنەوە دەریا. رێگاکە شەش فەرسەخ بوو.

## چاپتەر -٦-
# هەندێك ئاڵۆزی لەگەڵ سپارتیەکان

پاش ئەمە دوژمن خۆیان پێکەوە هێشتەوە، ژن و منداڵ و شمەکیان بۆ دوور برد، لەلایەکی دیکەدا یۆنانیەکان چاوەڕێی کلیندەر بوون کە بە کەشتیەوە بگاتە جێ. هەموو رۆژێك بە بارگینەوە بەبێ ترس دەردەچوون، گەنم و جۆ و شەراب و هەنجیر و کونجی و شتیان دەهێنا. ولاتەکە هەموو بەرهەمێکی هەبوو زەیتون نەبێت. کە لەشکر لەنێو ئوردوگا بوو مۆڵەت بە هەندێك کەس دەدرا بۆ تالان دەربچن، ئەوانە تالانەکانیان بۆ خۆیان بوو، بەلام ئەگەر لەشکر دەر چووبایە، ئەوسا دەسکەوتەکان دەبوونە ماڵی گشتی. ئێستا هەموو شتێك زۆر ببوو، هەروەها خۆراك بەدەریادا لە شارە یۆنانیەکانەوە دەهێنرا. کەشتیوانە یۆنانیەکان پێیان خۆش بوو لێرە بوەستن کە زانیبویان وا شارێکی یۆنانی نوێ دامەزراوە و بەندەری هەیە. هۆزەکانی دوژمنیش دەستیان پێکرد نامە بنێرن بۆ زینۆفۆن، بیستبویان ئەو سەرپەرشتی دامەزراندنی شارەکە دەکات. پرسیان دەکرد کە چ بکەن بۆ ئەوەی پێوەندیەکی باش لەگەڵ ئەم شارە پەیدا بکەن؟ زینۆفۆنیش لێ دەگەڕا کە سەربازەکان ئەو شاندانە ببینن.

لەو کاتەدا کلیندەر بە دوو کەشتی بچووکەوە هات. کە گەیشتە جێ، لەشکر لە دەرەوەی ئۆردوگا بوون، هەندێك لادەریش بەتەنیا چوبوونە چیاکان مەڕیان بەتالان هێنابوو و لەترسی ئەوەی کە لێیان بستێندرێت، هەستان لەلای دێکسیپۆسیان دانا (ئەو پیاوەی کە لە ترابازۆس بە کەشتیەکە هەلات). دێکسیپۆس هەندێکی بۆخۆی دانا و ئەوانی دیکەی دایەوە خۆیان سەربازەکان خڕ بوونەوە گوتیان مەڕەکان ماڵی گشتیی لەشکرەکەن بەلام دێکسیپۆس بە پاڵ رێگای خۆی دەرکرد و چووە لای کلیندەر گوتی ئەوانە دەیانەوێ مەڕەکان بۆخۆیان گل بدەنەوە. کلیندەر فەرمانی دا هەر کەس ئەمەی کردووە بیهێنن بۆ لای خۆی. دێکسیپۆس یەکیان دەستگیر کرد و بە پاڵ بردی، بەلام ئاگاسیاس بەسەردا هات و رزگاری کرد، پیاوەکە لە تاقمی خۆی بوو. پیاوەکانی دیکە دێکسیپۆسیان بەردباران کرد و هاواریان لێ کرد (خاین) پیاوانی نێو کەشتیەکان ترسان و لەگەڵ کلیندەر کشانەوە بۆ نێو دەریا. زینۆفۆن و

جەنەراڵەکانی دیکە ویستیان دڵنیای بکەنەوە کە هیچ شتێك لە ئارادا نیە بەڵام تازە کلیندەر تووش کرابوو و تەریق ببۆوە کە ئەوها بەترساوی دیتبویان، گوتی نیازی هەیە فەرمان بدات کە ئەم لەشکرە بەدوژمنی گشتی بژمێردرێن و نابێ یەك شاری یۆنانی وەریانبگرن. لەو سەردەمەدا سپارتی باڵادەستییان لەسەر هەموو یۆنان هەبوو. ئێستا وا پێ دەچوو ئیشی یۆنانیەکان شڕ ببێت، لێی پارانەوە کە هەڕەشەکانی بەجێ نەگەیێنێت بەڵام نەیسەلماند و گوتی تەنیا مەگەر ئەو پیاوە تەسلیم بکەن ئەوەی گرتووەکەی ئازاد کردووە. ئەو پیاوەش ئاگاسیاس بوو برادەری زینۆفۆن، گومانیش نەبوو کەوا دێکسیپۆس لەبەر ئەم برادەرایەتیە تۆمەتباری کردووە.

لەم قۆناغەدا کەس نەیدەزانی چ بکات، ئەفسەرەکان کۆبوونەوەیان بە لەشکر کرد. هەندێك سەرباز بە چاوی سووکایەتی سەیری کلینەدریان دەکرد بلام زینۆفۆن مەسەلەکەی بە ئاسان نەدەزانی، هەستایەوە و ئەم قسانەی کرد: مەسەلەی زویربوونی کلیندەر شتێکی ئاسان نیە. شارە یۆنانیەکان لێرە نزیکن و ئێستا سپارتی ئاغای یۆنانن. بەڵێ، هەر سپارتیەك دەتوانی بەئارەزووی خۆی بکات، جا ئەگەر کلیندەر ڕێگای بیزەنتیۆم لە ئێمە ببڕێت و فەرمان بداتە شارەکان کە کەس وەرمان نەگرێت و بڵێن دژ بە دەسەڵاتی سپارتا وەستاوین و لە یاسا دەرچوین، ئینجا راپۆرت بگاتە ئەدمیراڵ ئەناکسیبیۆس، ئەوسا نە دەتوانین لێرە بمێنین و نە دەتوانین بە دەریادا بگەڕێینەوە. ئێستا سپارتی لە دەریا و زەمیندا باڵا دەستن و نابێ لەبەر یەك- دوو کەس لە هەموو یۆنان دەربکرێین. نەخێر، دەبێ بەقسەیان بکەین، یەك لەبارە خۆمەوە دەزانم کە دێکسیپۆس بە کلینەدەری گوتووە کە ئاگاسیاس بە فەرمانی من ئەمەی کردووە، بەڵام ئامادەم گلەیی لەکۆڵ ئاگاسیاس و ئێوەش بکەمەوە ئەگەر بڵێت کە من دەستم تێدا بووە. ئامادەشم توندترین سزا بەسەر خۆمدا بسەپێنم ئەگەر بەدبارانەکە بە هاندانی منەوە بوبێت. پێشنیاز دەکەم ئەگەر دێکسیپۆس هەر کەسی تر تۆمەتبار بکات، با خۆی بداتە دەست کلیندەر تا دادگایی بکات. بەم جۆرە کەس بەرپرسی ئەم رەفتارە نابێت. ئەگەرنا، ئەوسا بە کەمترین مرۆڤ دەناسرێین.

ئاگاسیاس هەستا قسەی کرد: سەربازان، سوێند بە هەموو خواوەندەکان دەخۆم کە نە زینۆفۆن و نە هیچ کەس بەمنی گوتووە پیاوەکە رزگار بکەم. کە سەربازێکی باش لە تاقمی خۆم

بەدەستی دێکسیپۆس دەبردرا، وەکو خۆتان دەزانن خیانەتی لە ئێمە کردووە، دانی پیٚ دەنێم کە خۆم پیٚ رانەگیرا و رزگارم کرد. هەروەها پێی ناویٚ تەسلیمم بکەن. وەکو زینۆفۆن گوتی، خۆ دەدەمە دەست کلیندەر با بە هەوەسی خۆی لەگەڵم بکات. جا تکا دەکەم سپارتیەکان مەکەنە دوژمن، دەمەویٚ هەمووتان بەساغی بگەنەوە ماڵ بەلاّم حەز دەکەم لەگەڵم بێن بۆ لای کلیندەر لەباتی خۆم قسە بکەن.

لەشکر دەرفەتیان دا کە بەخۆی ئەم کەسانە دەستیشان بکات، جا ئەو جەنەراڵەکان دەستنیشان کرد. پاش ئەوەی کە ئاگاسیاس و سەربازە رزگارکراوەکە لەگەڵ جەنەراڵەکان چوونە لای کلیندەر، جەنەراڵەکان بەم جۆرە قسەیان کرد: ئەگەر تۆ یەك– دوو کەس تۆمەتبار دەکەیت، وا خۆیان دەخەنە بەردەست. وە ئەگەر ئێمە تۆمەتبار دەکەیت، وا لێمەش لێرەین، و ئەگەر کەسێکی دیکە هەیە؟ ناوەکەی بلیٚ چونکە کەس نیە لە قسەمان دەرچێت.

ئینجا ئاگاسیاس قسەی کرد: کلیندەر، من بووم سەربازەکەم لەدەست دێکسیپۆس رزگار کرد و من بووم فەرمانم دا بەردبارانی بکەن چونکە دەمزانی سەربازەکە پیاوێکی چاکە و لە هەمان کاتدا دێکسیپۆسیش دەناسم و دەزانم لە هیراکلیا بوو بە ناڤخودانی کەشتیەکە و دەشزانم کە پێی هەڵات و لەنێو تاقمەکەی خۆیدا رۆڵی خیانەتی گێرا، ئیتر ئێمە بەجیٚ ماین. کەشتیەکەش لە خەڵکی تراپازۆس وەرگیرابوو، ئیتر ئێمە لەوێدا شەرمەزار و بیٚ سەروشوێن ماینەوە. خۆی لەویٚ بوو، ئەمەشی بیستبوو کە رێگای زەمینی ئەوهەموو رووبارەی لەسەرە، جا من پیاوەکەم لەو تەرزە کەسە رزگار کردووە. ئەگەر خۆت یان یەکێك لە پیاوەکانت ئەو سەربازەی دەستبەسەری کردبایە، باوەڕ بکە ئەوهام نەدەکرد. وە ئەگەر دەمکوژی، دەبزانە کە تۆ پیاوێکی چاك لەبەر نامەردێکی رووڕەش دەکوژی.

کلیندەر گوتی ئەگەر دێکسیپۆس ئەم شتانەی کردبێت وەکو باس کرا، رەفتاری لەوها بەهیچ جۆر قەبوڵ ناکرێت. لەوەشی دانا کە دێکسیپۆس نەك هەر خوێڕوە، بەڵکو دەبیٚ سزایەکی توندوتیژ بدرێت و لە دادگاییدا دەبیٚ لەوەی پیٚ بگات کە لێی دەوەشێتەوە[1] و گوتی: ئێوە

---

[1] ئەم هەلوێستە زۆر گرینگە. پیاو وا دەزانیٚ داخۆ کلیندەرە و دەستەلاّتدارانی سپارتا چ لە خاینێکی وەك دیکسیپۆس دەکەن، کەچی لە راستیدا هیچی لیٚ ناکەن تەنیا لەبەرە ئەوەی کە ئەو سپارتیە و (هاوشاری خۆیانە). کەلی ئەوها

داوای دادگایی دەکەن. ئێستا بڕۆن و ئاگاسیاس لەلای من بەجێ بهێڵن تا بەدواتاندا دەنێرم بۆ ئەوی ئامادەی دادگاییەکە بن. ئەم پیاوەش کە هاتۆتە پێش، من هیچ تۆمەتێکی ناخەمە پاڵ کەوا بەندییەکی رزگاردووە.

ئینجا سەربازە رزگارکراوەکە بە قسە هات: کلیندەر، سەبارەت بە منەوە ئەگەر وا دەزانی بەهۆی شتێکەوە دەستبەسەر کرابووم، من دەستم لە کەس نەوەشاندبوو و کەسیشم بەردباران نەکردبوو، تەنیا ئەوەم گوت کە مەڕەکان ماڵی گشتین چونکە سەربازەکان بڕیاریان دابوو هەرکەس بە جودا بچێتە راوەرووت (لەکاتێکی کە لەشکر بۆ هەمان مەبەست دەرچوبێت) ئەوسا دەسکەوتەکان دەکرێنە ماڵی هەمووان. هەر ئەوەندەم گوت، دسێکسیپۆس یەکسەر گرتمی و منی راکێشا تا ئەو مەڕانە ئاشکرا نەبن، ئەوە چونکە خۆی بەشی پێوەبوو و ئەوانی دیکە بۆ خۆیان دەمایەوە، هەمووش بەپێچەوانەی بڕیاری لەشکر دەکرا.

وەڵامی کلیندەر ئەمە بوو: تۆش کە پێوەندیت بە رووداوەکە هەیە، دەبێ لێرە بمێنی تا بڕیارێك بۆ تۆش دەدرێت.

پاش ئەمە تاقمەکەی کلیندەر نانێکیان خوارد. زینۆفۆن کۆبوونەوەیەکی کرد و گوتی با شاندێك بنێرن داوا لە کلیندەر بکەن نەرمیی بنوێنێت. بڕیاریان دا جەنەراڵ و کاپتنەکان بنێرن وێڕای دراکۆنتیۆسی سپارتی و هەر کەسێکی کە لێیان را دەدیت کاریگەر بێت. بۆیەش زینۆفۆن چووە لای کلیندەر و ئەم قسانەی کرد: کلیندەر، ئەو دوو پیاوە لەشکر ناردنی بۆ بەر دەستی تۆ، زۆر بەتوندی تکا دەکەین بەکوشتیان نەدەیت. لە ماوەی رابردوودا چاکەیەکی زۆریان بۆ لەشکر کردووە. ئەگەر ئەو چاکەیان لەگەڵ بکەیت، لەشکر بڕیاریداوە بتکەنە سەرلەشکر و ئامادەن پارادێکی سەربازی بکەن تاکو رادەی رەندایەتیی و رێکییان لەپێش چاوی تۆ پێشان بدەن و دیار بکەن کەوا ترسی دوژمن لەنێو ئەم لەشکرەدا نیە. هەروەها داخوازیەکی تریان هەیە،

---

پێویست بە ئێران و توووران ناکات کە دەوڵەتیان لێ تێك بدەن، بەڵکو هەر لە خۆڕا دەوڵەتیان دەپووکێتەوە. بە پێچەوانەی گەلی یۆنانی، گەلی رۆم خۆیان لە دەردی لەهجە و ناوچە و شارپەرستی و ئەو شتانە رزگار کرد و ئەگەر کەسێکی وەك دێکسیپۆس رۆمی بایە ئەوسا پێش هەموو کەسێك برلکەی خۆی سزای دەدا.

حەز دەکەن ئەگەر رابەرایەتیت وەرگت، پێشانیان بدەیت کە دێکسیپۆس و پیاوانی دیکە شایستەی چین، هەر کس بەگوێرەی خۆی.

کلیندەر گوێی گرت، ئینجا گوتی: سوێند بە جمکەبراکان[1] دەخۆم دەبێ خێرا وەلاّمتان بدەمەوە. دوو پیاوەکەش لەگەلّ خۆتان بەرن و دوایە خۆم دێم. ئەگەر خواوەندەکان تواناو پێ ببەخشن، دەبێ لێرەرا تا یۆنانتان بەرمەوە. زینۆفۆن، قسەکانی تۆ بەو راپۆرتانە ناچن کە دەڵێن گوایە خەریکی لەشکرەکە لە سپارتاریەکان هەڵگەڕێتەوە.

شاندەکە پیاوەکانیان بردەوە. کلیندەر، بەنیازی ئەوەی کە بزانێت ئایا لەگەڵ لەشکر بڕوات یان نا و ئایا رابەرایەتی لەگەلّ زینۆفۆن بگێرێت یان نا، قوربانیەکی کرد و ئەنجامەکە ئەوە بوو کە لەگەلّ زینۆفۆن بوونە برادەر. میوانداریان بۆ یەکتر نواند و کە دیتی چۆن لەشکرەکە پابەندی فەرمان و یاسا دەبن، حەزی چووە ئەوی کە ببێتە سەرلەشکریان. بەلاّم ئەگەرچی سێ رۆژ لەسەر یەك قوربانیی پێشکەش کرد، نیشانەکان بەهیچ جۆرێك باش نەبوون. ئیدی جەنەراڵەکانی بانگ کرد و ئەم قسانەی بۆ کردن: نیشانە ئاسمانیەکان بەلای ئەوەدا دەرنەچوون کەمن بەرەو یۆنان رابەرایەتیتان بکەم. بەلاّم بێ ئومێد مەبن، دیارە رابەرایەتی ئەم لەشکرە بۆ خۆتان نوسراوە. ئەگەر بگەنە بیزەنتیۆم ئەوسا پێشوازیەکی باشتان بۆ دەکەین.

سەربازەکان ئەو مەڕانەیان پێشکەش بە کلیندەر کرد، ئەویش وەریگرتن بەلاّم هەر بەدیاری دایەوە سەربازەکان. لەشکر دانەوێڵە و دەسکەوت تالاّنێکیان دابین کرد و بە وڵاتی بیسینیادا بەرێ کەوتن. بە رێگا سەرەکیەکەدا رۆیشتن بەلاّم کە زانیان ناتوانن بە بار و بارگەوە دەرباز بن بە هەمان رێدا گەڕانەوە. دوو رۆژ مانەوە، ئەمجارە بە ئەسیر و بە گاڕانەوە شەش رۆژ رۆیشتن تا شاری خریسۆپۆلیس لە خەلکیدۆنیا، لەوێشدا هەفت رۆژ مانەوە تاکو تالاّنەکانیان فرۆشت.

[1] واتای (جمکە براکان) دیار نیە ؟ هەروەها رێکس وارنەریش هیچ ئاماژەیەکی نەداوە. بەلاّم سپارتا سیستەمێکی سیاسیان هەبوو کە ساڵانە دوو پاشایان دەستنیشان دەکرد پێکەوە بەڕێوەبەرایەتی شارەکە بگێڕن. رەنگە مەبەستی لەو دوو پاشایە بێت.

## چاپتەر -١-
# ئالۆزی لە بیزەنتیۆم

فەرناباز لەوە دەترسا لەشکرەکە بێن بۆ ناوچەکەی ئەو بۆیە نامەی بۆ ئەدمیراڵ ئەناکسیبیۆس نارد لە بیزەنتیۆم، تکای دەکرد لەشکرەکە لە بەری ئاسیا دوور بخرێتەوە، بەڵێنیشی دا کە هەموو خەرجیەکانی کارە بدات. ئەناکسیبیۆس جەنەراڵەکانی کۆکردەوە و بەڵێنی دا لەگەر سەربازەکان لە دەربەندەکە بپەڕنەوە ئەوا کار و بژێویکیان بۆ پەیدا دەکات. جەنەراڵەکانیش گوتیان مەسەلەکە باس دەکەن و خەبەری دەدەنەوە. بەڵام زینۆفۆن پێی ڕاگەیاند کە واز لە لەشکر دێنێت و دەیەوێ بەدەریادا بگەڕێتەوە ماڵێ. ئەناکسیبیۆس هانی دا لەگەڵیان بپەڕێتەوە و دواتر بەجێیان بهێڵێت.

لەو میانەدا سیووتیس، تراکییەکە، میدۆسادیسی بۆ زینۆفۆن نارد داوای دەکرد بێتە لای تا پێکەوە هەوڵ بدەن لەشکر لە دەربەندەکە بپەڕێننەوە. گوتی ئەگەر یارمەتی بدات پەشێمان نابێتەوە. وەڵامی زینۆفۆن ئەمە بوو: لەشکر هەر دەپەڕێتەوە و پێویست ناکا پارە بداتە من چونکە بەجێیان دەهێڵم. با پێوەندی بەوانەوە بکات کە لەگەڵ لەشکرەکە دەمێنن.

ئینجا لەشکر پەڕینەوە بۆ بیزەنتیۆم، کەچی ئەناکسیبیۆس هیچ پارەی نەدا و بەیانێکی دەرکرد کە دەبێ لەشکر بە چەك و پارە و شمەکەوە لە شار دەرچن. سەربازەکان بەم بەیانە قەڵس بوون چونکە پارەیان نەبوو ئیتر بە تورەیی شمەکیان بار دەکرد. زینۆفۆن برادەرایەتی لەگەڵ کلیندەر پەیدا کردبوو و لەبەر ئەوەی کە دەیویست یەکسەر بڕوات چوو ماڵئاوایی لێ بکات، بەڵام کلیندەر گوتی: مەڕۆ چونکە تا ئێستا زۆر کەس دەڵێن لەشکر بەهۆی تۆ لێرە ناڕۆن.

زینۆفۆن وەڵامی دایەوە: خەتای من نیە، خەتای سەربازەکانە کە لەوها دەستکورت ماون. کلیندەر گوتی: هەرچی بێت، ئامۆژگاریت دەکەم لەوها مەڕۆ. لەشار دەرچە وەك بڵێی بۆ لای لەشکرەکە دەچیت ئینجا لە دەرەوەی شار بەجێیان بهێڵە. زینۆفۆن گوتی: زۆر باشە، دەچینە لای ئەناکسیبیۆس، ئیشەکە ڕێك دەخەین.

چوون بۆ لای ئەناکسیبیۆس و قسەکەیان بۆ گێڕایەوە، گوتی دەبێ زینۆفۆن بەم جۆرە بکات و دەبێ لەشکر لەشار دەرچێت، ئاماژەشی کرد کە ئەوکەسەی لە پارەدەکە ئامادە نەبێ خۆی بەرپرس دەبێت. ئینجا جەنەراڵەکان لە دەروازەکە دەرچوون و سەربازەکان بەدوایان کەوتن تەنیا هەندێکیان نەبێت هێشتا لەنێو شار مابوون. ئیتیۆنیکۆس وەستابوو تا دەروازەکە لەدوایاندا قەپات بکات و دارەکان قایم بکات، لەم کاتەدا ئەناکسیبیۆس جەنەراڵەکانی بانگ کردەوە و گوتی: دەتوانن پێداویستیەکانتان لە گوندی تراکی پەیدا بکەن، گەنم و جۆ و خۆراکی دیکە لەوێ زۆرە. دواتر بەرەو خەرسۆنیز بڕۆن، سنیسکۆس لەوێ پارەکەتان دەداتێ.

رەنگە هەندێك سەرباز قسەکەیان بیستبێت، یان دەبینی یەك لە کاپتنەکان باسی کردبێت. هەرچۆنێك بێت جەنەراڵەکان لەنێو خۆیاندا باسیان دەکرد ئایا سیوزتیس دۆستە یان دوژمنە؟ و ئایا دەبێ بەسەر چیای پیرۆزدا ئاوابن یاخۆ دەبێ پێچێك بەنێو تراکیادا بکەن؟ لەمیانی ئەم قسانەدا سەربازەکان تاویان دابووە چەك و بەرەو دەروازەکە غاریان دەدا. کە پیاوەکانی ئەتیۆنیکۆس ئەوەیان دیت، دەروازەکەیان قەپات کرد و تەختە دارەکانیان پێوە قایم کرد. سەربازەکان دەروازەکەیان دەکوتا و دەیانگوت کە بێئەندازە غەدریان لێ کراوە و بۆ وڵاتی دوژمن دەرکراون. هەڕەشەیان دەکرد ئەگەر دەروازەکە نەکەنەوە دەیشکێنن. هەندێکیان بۆ لای دەریا چوون و هەندێکیان لەگەڵ رۆخی ئاوەکە بەسەر شوورەکاندا پەڕینەوە و لەوانەی کە هێشتا لەنێو دەروازەکە مابوون، کە ئەمەیان دیت دەروازەکەیان کردەوە، ئیتر سەرباز بەغار هاتنەوە ژوور.

کە زینۆفۆن ئەمەی دیت، ترسا سەربازەکان دەست بە تاڵانکاری بکەن و ئیشی خۆی و ئەوانیش تێك بچێت، هەستا خۆی رەگەڵ سەربازەکان دا بۆ نێو دەروازەکە. کە خەڵکەکە دیتیان وا سەرباز خۆ لە شار دەپەستن، بازاریان چۆڵ کرد، هەندێك بۆ نێو ماڵان و هەندێك بەلای دەریادا. ئینجا ئەوانی نێو ماڵەکان لەوێ دەرپەڕین بۆ کۆڵانەکان و هەندێکیان سواری بەلەم بوون بۆ نێو دەریا. ئومێدیان لە خۆ نەمابوو وەك بڵێی دوژمنێك شاری داگیرکردووە. ئەتیۆنیکۆس هەڵاتە بۆ نێو قەڵاتەکە و ئەناکسیبیۆس بە بەلەمێکی راوەماسی بۆ لای قەڵاتەکە

..ورایەوە، ئینجا یەکسەر ناردی بەدوا هێزی خەلکیدۆنی، وەك بلێی باوەڕی نەدەکرد لەو ولاتەدا خۆی بەرانبەر یۆنانیەکان رابگرێت.

کە سەرباز زینۆفۆنیان دیت یەکسەر بۆی هاتن و گوتیان: ئێستا رۆژی خۆتە کە ببیتە پیاوێکی مەزن، ئێستا شارێکت هەیە، کەشتیت هەیە، ئێمەت هەیە وەکو لەشکرێك، ئێستا دەتوانی ئەو چاکەمان لەگەڵدا بکەیت و بتکەین بە پیاوێکی مەزن.

زینۆفۆن گوتی: قسەکەتان راستە، لەگەر ئەمەیە مەبەستتان وەرن ریز بن. ئەم قسەی کرد بەمەستی ئەوەی کە ساردیان بکاتەوە. دەستیان پێکرد بە تاقم ریز بن و هەر زوو هۆپلیت خۆیان کردە هەشت ریز، پەلتاستیش بەدەوریاندا دوو باڵیان پێك هێنا. شوێنەکە پێی دەگوترا (مەیدانی تراکیەکان) بای ئەوەبوو پارادێکی سەربازیی تێدا بکرێت چونکە خانووی لێ نەبوو، زەویەکەش تەخت کرابوو.

کە پیاوەکان چەکیان شۆڕ کردەوە و هەندێك سارد بوونەوە، زینۆفۆن ئەم قسانەی کرد: سەربازینە، سەیرم پێ نایەت کە ئەوها تووڕەن و هەست دەکەن فێڵ و نەفرەتتان لێ کراوە. بەلام لەگەر رێگا بە هەستەکانمان بدەین و وا بکەین ئەم سپارتیانە نرخی فێڵەکانیان بژێرین و شارەکەش داگیر بکەین، کەواتە دەبێ بیرێك لە ئایندەش بکەینەوە. ئێمە دەکەوینە جەنگ، جەنگێکی جاڕدراو دژی سپارتا و هاوپەیمانەکانی، جا بەگوێرەی کە دیتوومانە و هێشتا لەبیرمان ماوە، دەزانین چ جۆرە جەنگێك دەبێت. ئێمەی ئەتینی کە لەکاتی خۆیدا دژی سپارتا و هاوپەیمانەکانیان جەنگاین، لە دەریا و بەندەرەکندا ٣٠٠ کەشتمان هەبوو. لە ئەکرۆپۆلیس وشکە پارەیەکی بێئەندازەمان هەبوو سەرباری داهاتێکی سالانە لە باجی ناوەخۆ و باجی دەرەکی کە بەلانی کەم دەگەیشتە ١٠٠٠ تالەنت. ئاغای هەموو دەروازە و دەربەندەکان بووین و چەندەها شار لە ئاسیا و ئەورووپا لەبەر دەستمان بوون، واش هەر تووشی ئەم چارەنوسە بووین کە دەیزانن. ئێستا سپارتا نەك هەر هاوپەیمانەکانی خۆی هەیە بەلکو ئەتینا و هاوپەیمانەکانیشی رەگەلیان کەوتوون، کەواتە چ ئومێدێك دەکەن؟ ئیستا تیزافەرنە و هەموو خەلکە ناوچەییەکانی سەر دەریا بوونەتە دوژمن، لەهەموو کەسێکیش دوژمنتر شای فارسە کە ویستمان بیکوژین. ئیتر کە ئەو هەموو شتە لەئارادا بێت ئایا کەس هەیە ئومێدی سەرکەوتنی هەبێت؟ تو ئاسمان با

هەڵنەچین و با لە جەنگدا نەمرین کە لە دژی شار و خزم و کەسی خۆمان وەستابین چونکە ئەوسا مافێکی تەواویان دەبێت دژایەتیمان بکەن، چونکە ئێمە بەوهەموو شارانەدا هاتووین کە بێگانەن، واش هەوڵمان نەداوە یەکیان کۆنترۆڵ بکەین، کەچی وا لە یەکەم شاری یۆنانیدا خەریکە تالآنکاری بکەین. دەبا بمرم و ١٠٠٠٠ فاتۆم بەژێر زەویدا بچمە خوارێ پێش ئەوەی شتێکی ئەوها لەدەست ئێوە دەرچێت.

لەبەر ئەوەی کە لێوەی یۆنانین، دەبێ بتوانن مافی خۆتان لە ڕێگای پابەندبوونە بستێنن. دەبێ نامەیەك بۆ ئەناکسیبیۆس بنێرین بڵێین ئێمە نیازی دەستوەشاندمان نەبوو کە چووینە نێو شارەکە و دەمانەوێ یارمەتیمان بدەیت، خۆ ئەگەر هیچ قازانجیش نەکەین ئەوسا هەر نەبێ بەفەرمانی ئۆ لە شارەکە دەردەچین نەك ئەوها وەکو تەفرەدراوێکی گێژ.

پێشنیازەکە پەسند کرا و نامەیەك بەدەست هیرۆنیمۆسی ئەلیس لەگەڵ یوریلۆخۆسی ئەرکادی و فیلەسیۆسی ئاخەیی ناردرا، بەلآم کە سەربازەکان هێشتا دانیشتبوون پیاوێکی تیبی بەناوی کواراتیداس هاتە لایان. ئەم پیاوە ئاوەرە نەبوو بەلآم بۆ ئیش دەگەڕا کە شارێك یان خەڵکێك پێویستیان بە جەنەراڵێك هەبێت. هاتە پێش و گوتی ئامادەیە لەشکرەکە بباتە ناوچەیەك بەناوی (دەلتا) لەوێ تالآن و خواردن و خواردنەوە بەدەڵێ خۆیان دەبێت. لەمیانی ئەو قسانەشدا وەلآمی ئەناکسیبیۆس هاتەوە گوتبوی لەگەر بەقسەی بکەن پەشێمان نابنەوە. وا ڕاپۆرتێکیش دەنێرێت بۆ حوکمەتەکەی خۆی دەربارەی ئەم حاڵە و دەیەوێ بەگوێرەی توانا خزمەتیان بکات.

پاش ئەمە، سەربازەکان کواراتیداس دەکەن جەنەراڵ و لە شار دەردەچن. کواراتیداس ئەوهای ڕێك خست کە سبەینێ بە شەراب و بە ئاژەڵی قوربانی و بە فاڵگرەوە بێتەوە لای لەشکر. هەر کە لەشکر دەرچوون، ئەناکسیبیۆس بەیانێکی دەرکرد کە هەر سەربازێك لەنێو شار بگیرێت دەکرێتە یەخسیر و دەیفرۆشن. ڕۆژی دووەم کۆیرِاتیداس لەگەڵ فاڵگرێك وهەندێك ئاژەڵی قوربانی هاتەوە. تاقمەکەی بریتی بوون لە ٢٠ پیاو، چێشتی جۆیان پێبوو، ٢٠ پیاویش شەرابیان هەڵگرتبوو، سێ پیاویش زەیتونیان هێنابوو، یەکیان بارێکی یەکجار گەورەی

هەڵگرتبوو لە سیر، یەکی تر هەمان بار پیوازی هێنابوو. کواراتیداس چێشتێکی بەم شتانە لێنا و بەشیەوە، ئینجا ڕێورەسمی قوربانیی گێڕا.

زینۆفۆن داوای لە کلیندەر کرد ڕێگای بدات کە بچێتە نێو شار لەوێ ببینێت بۆ ئەوەی کەشتیی بۆ پەیدا بکات و لە [illegible] بڕوات. [illegible] بدەر هات گوتی: ئەوەتام، پاش ڕەنج و سەرلێشەید [illegible] بیبۆس بەباشی نازانێت کە تۆ لێرە بی و سەربازەکان دەرەوەی شار بن. ئێستا بیزەنتیەکانیش بوونەتە چەند تاقمێکی دژبە یەکتر. بەڵام هەرچۆنێك بێت، ئەگەر ئامادەی دەتوانی لەگەڵیان بڕۆیت.

لەو کاتەدا کواراتیداس نیشانەی باشی لە قوربانیەکان وەرنەدەگرت و خۆراکیشی نەدەبەشیەوە. ڕۆژی دواتر گای قوربانیەکەی بە گاسنەوە خستە سەر شوێنی سەربڕین بەڵام کلینۆری تۆرخۆمینۆس و تیماسیۆنی داردانی هاتن و پێیان گوت کە قوربانیەکە رابگرێت چونکە بڕیاریان داوە ئەگەر خۆراك بۆ لەشکر دابین نەکات ناهێڵن رابەرایەتی بکات. ئەوجا فەرمانی دا خواردن ببەشنەوە بەڵام ئەوەی کە هەیبوو لە بەشی ڕۆژانەی ساربازێکی ئاسایی زۆر کەمتر بوو. ئیتر وازی هێنا و بەخۆ بە ئاژەڵ و پیاوەکانیەوە ڕۆیشت[1].

[1] شەڕ و تاڵان، سەربازی بە پارە، جەنەراڵی بە پارە، ئەوەبوو حاڵی یۆنان پاش ٢٧ جەنگی ناوەخۆ. داخۆ ئەوانیش کە خیانەتیان لە یەکتر دەکرد دەیانگوت (سەنگەری خەباتی گۆڕیستۆتەوە؟!!) ئەم قسە بووچە لە شەڕی ناوەخۆی کوردستان زۆر باو بوو؟

## چاپتەر -٢-
# گفتوگۆ لەگەڵ سیووتیس

نیۆنی ئاسین و فیرنیسکۆسی ئاخەیی و تیماسیۆنی داردانی و فیلاسیۆس لەسەر لەشکرەکە مانەوە. پێشڕەوییان کرد بۆ لادێیەکی تراکی لە دەورووبەری بیزەنتیۆم، لەوێ ئۆردوگایان دا. کلینۆر و فرینیسکۆس دەیانویست بۆ لای سیووتیس Seuthes[١] بچن. سیووتیس هەردووکیانی ڕاکێشابوو بەهۆی پێشکەشکردنی دیاری، یەکیان ژنێك و یەکیان لەسەرباز پێشکەش کردبوون. نیۆن دەیویست بچەن بۆ ناوچەی خەرسۆنیز. بیری دەکردەوە لەگەر لەژێر دەسەلاتی سپارتا بن ڕەنگە ئەوسا بکرێتە سەرلەشکر، کەچی نیۆن باوەڕی وابوو دەبێ دیسان ئەو دەربەندەکان بپەڕنەوە بۆ ئاسیا، ئومێدی دەکرد شارەکەی خۆی بەهانای بێت. سەربازەکان پشتی ئەم پلانەیان دەگرت بەڵام لە هەمان کاتدا دەستیان پێکرد لەخۆڕا چەکەکانیان بفرۆشن و

---

[1] کەسایەتیی ئەم سیووتیسە مایەی سەرنج دەبێت لەم چیرۆکەدا. سیووتیس کوڕە ئاغایەکی عەشایەری ئەو ناوچە بووە و ئەگەر بەراوردی لەنێوان سویتیس و زینۆفۆندا بکەین، دەتوانین خەریتەیەکی کۆمەڵایەتی ئاسان دابنێین بۆ ئاستی ئینتیما. عەشایەرێکی وەك س-یووتیس تەنیا خزم و عەشیرەتی خۆی دەناسێت و لە ڕقی عەشایەرەکانی دیکە (کە ئەوانیش تراکین و لە هەمان نەتەوەن) ئامادەیە پەنا بۆ بێگانە ببات (بۆ یۆنانیەکان). ئینجا هەنگاوێك لەمە بەرزتر یۆنانیەکان بوون کەوا دڵنیان بە خزمایەتی و عەشیرەتگەری نەدەدا، بەڵام تا سەر نوقمی شارپەرستی بوون و ئامادەبوون پشتی بێگانەیەك بگرن (تراکی، فارس، هەرکەسێك) دژی خەڵکی شارەکانی دیکەی یۆنان. لە هەموویان بەرزتر فارس بوون (تەنیا فارس نەك میدی چونکە میدی وازیان لە دەماری عەشایەری نەهێنا و پێش نەکەوتن) کەچی فارس ئینتیمایان لە ئاستێکی نەتەوەیدا بوو، واتە ئاوڕیان لە خزم و لە عەشیرەت و لە شار و ناوچەش نەدەدایەوە، تەنیا نەتەوە و بەس. شایانی گوتنیشە لە بەرانبەر فارسدا تەنیا ڕۆم ئەو جۆرە ئینتیمایەیان بووژاندەوە و بوون بە زلهێز. بۆیە، پاش چەند سەدەیەك تێکڕای ئەو وڵاتانە لەنێوان ئەو دوو زلهێزەدا بەش کران، فارس و ڕۆم.

هەندێکیان بەنێو شارەکاندا بڵاو بوونەوە. ئەناکسیبیۆس هەواڵی هەڵوەشانەوەی لەشکری بەدڵ بوو، وای دەزانی بەمە فەرناباز رازی دەکات[1].

ئەریستاخۆس هاتبوو جێی کلیندەر لە بیزەنتە بگرێتەوە، لیتر ئەناکسیبیۆس لە بیزەنتە بەرێ کەوت و لە کیزیکۆس یەکتریان گرتەوە. قسەش هەبوو کەوا پۆلۆس هاتبوو جێی ئەدمیراڵ ئەناکسیبیۆس بگرێتەوە وگەیشتبوە هیلەسپۆنت. ئەناکسیبیۆس بە ئەریستاخۆسی گوت سەربازەکانی کۆرووش، کە لە بیزەنتە بەجێمابوون، بۆخۆی بە یەخسیر بفرۆشێت. کلیندەر کەسی نەفرۆشتبوو بەڵکو بەزەیی پێیاندا هاتبۆوە و بە خەڵکەکەی گوتبوو لە خانووی تایبەت دایانمەزرێنن، کەچی کە ئەریستاخۆس دەگاتە بزەنتە یەکسەر ٤٠٠ لەو سەربازانە بە یەخسیر دەفرۆشێت.

ئەناکسیبیۆس تا پاریۆن بەدرێژایی لێوارەکە رۆیشت، لەوێرا نامەیەکی بۆ فەرناباز نارد. کەچی فەرناباز کەزانی ئەناکسیبیۆس بە ئەدمیراڵ نەماوە، گوێی نەدایێ و دەستی پێکرد هەمان گفتوگۆی پێشو لەگەڵ ئەدمیراڵە تازەکە بکات دەربارەی لەشکرەکەی کۆرووش.

پاش ئەمە، ئەناکسیبیۆس یەکسەر بەدوا زینۆفۆنی دا نارد کە خێرا خۆ بگەیێنێتە لەشکر و کۆیان بکاتەوە. پێی گوت بەزووترین کات بچن بۆ پەرینتۆس و بپەڕنەوە بەری ئاسیا. بە پیاوێکدا کەشتیەکی ٣٠ ریزی بۆ نارد لەگەڵ نامەیەکی پێشکەشکاری کە بەخەڵکی پەرینتۆس بڵێت خزمەتی لەشکرەکە بکەن. زینۆفۆن گەڕایەوە لای لەشکر و پێشوازیەکی گەرمی لێ کرا و بەم هەواڵە گەشانەوە، لەهەمان کات کە سیووتیس بەمەی زانی، میدۆسادیسی بۆ نارد بەبەڵێنی گەورەوە لێی بپاڕێتەوە کە بێتە لای. بەڵام زینۆفن وەڵامی دایەوە کە ئیشەکەی وی رێی ناچێتێ، لیتر سیووتیس وازی هێنا. کە یۆنانیەکان گەیشتنە پەرینتۆس، نیۆن و ٨٠٠ کەس خۆیان لە ئۆردوگایەکی دیکەدا جودا کردەوە، بەشی گەورە لەنێو دیوارەکانی پەرینتۆس مانەوە.

زینۆفۆن خۆی بە پەیداکردنی کەشتیەوە خەریك کرد، لەهەمان کاتیشدا ئەریستاخۆس، حوکمڕانە نوێکەی بیزەنتیۆم، بە دوو کەشتی گەیشتە وێ. لێستا لایەنی فەرنابازی گرتبوو،

---

[1] مێژوو ئەوەی تۆمار کردووە کە ئەو فەرماندە سپارتیانە هەموو ئەو ملك و شارانەیان بە فارس فرۆشتەوە (بیزەنتیۆم – واتە ئەستەنبوڵ- و دەربەندەکانی بسفۆڕ و دەردەنیل و هتد).

ڕێگای بە ناڤخودانەکان نەدا لەشکرەکە بپەڕیننەوە و چوو بۆ لەشکر گوتی کە نەپەڕینەوە.
زینۆفۆن پێی گوت ئەمە بەفەرمانی ئەناکسیبیۆس دەکرێت، بەلام ئەریستاخۆس گوتی:
ئەناکسیبیۆس ئێستا بە ئەدمیراڵ نەماوە. ئێستا من حوکمرانم و هەرکەس سواری کەشتی بێت
کەشتیەکە نوقم دەکەم. ئینجا گەڕایەوە بۆ شار.

ڕۆژی دواتر بەدوا جەنەراڵ و کاپتنەکانیدا نارد، بەلام پێش ئەوی بگەنە دەروازەکە، یەکێك
بە زینۆفۆنی ڕاگەیاند کە ئەگەر بچەنە ژوورێ یان یەکسەر دەکوژرێن و یان ئەوەتا دەستبەسەر
دەکرێن و دەدرێنە دەست فەرناباز. کە زینۆفۆن ئەم قسەی بیست خۆی دوا خست و ئەوانی
دیکەی نارده ژوورێ بەبیانگەی کەوا قوربانی دەکا تا بزانێ ئایا بچێتە لای سیووتیس یا نا؟ ئەمەی
کرد چونکە دیتی ڕێگای پەڕینەوە نیە، هەروەها نایەوێ بچێتە خەرسۆنیز و لەوێ گیر بخوات.

کاپتنەکان هاتنەوە و گوتیان ئەریستاخۆس داوای کردووە ئێستا بچنەوە و سبەینێ بێنەوە
لای. ئەم قسە گومانی خیانەتەکەی سەلماند، نیشانە ئاسمانیەکانیش باش دەرچوون، ئیتر زینۆفۆن و
کاپتن پۆلیمراتیسی ئەتینی و ئەو پیاوانەی کە جێباوەڕ بوون ئەوانەی برد تەنیا نیۆن نەبێت کە
ئۆردوگاکەی لەدووری ٦ فەرسەخ دانابوو. کە لەوێ نزیك بوونەوە دیتیان کۆمەڵێك ئاگر
هەلکراون بەبێ ئەوی کەسی لێ بێت. کە نزیکو کەوتنەوە پاسەوانەکانی سیووتیس دەنگیان
دان، تێ گەیشتن کە ئەمە فێڵێکی سیووتیس بوە، ئاگری هەلکردووە دوور لە ئۆردوگای خۆی
تا ئەگەر دوژمنێك بێت ئەوسا بچێتە لای ئاگرەکان و ئاشکرا بێت.

تەرجومانەکەی بۆ لای سیووتیس نارد پێی بلێت کەوا زینۆفۆن هاتووە. تراکییەکان پرسیان
ئایا ئەمە زینۆفۆنی ئەتینیە؟ تەرجومانەکە وەلامی دایەوە کە خۆیەتی. پاسەوانەکان خۆیان هەلدا
سەر پشتی ولاغەکانیان و بە غار ڕۆیشتن، پاش ماوەیەك ٢٠٠ پەلتاست پەیدا بوون و بردیانن
بۆ لای سیووتیس.

سیووتیس بە کۆمەڵێك پاسەوانەوە لە قەلاتێکدا بوو، ولاغی زینکراوی لەنێو قەلاتەکە
ڕاگرتبوو چونکە لەترسان فێر ببوو بە ڕۆژ ولاغەکانی دەحەساندەوە و بەشەو زینی دەکردن
چونکە دەلێن تیریس Teres، باپیرە گەورەی سیووتیس، لە جەنگی دژبە تینیەکان Thynis
شکستێکی گەورەی خواردبوو. تینی لە شەڕی شەوەکیدا ترسناکترین هێزی ناوچەکەن.

که لە قەلاتەکە نزیك بوونەوە، سیووتیس گوتی با زینۆفۆن دوو کەس بە ئارەزووی خۆی هەلبژێرێت و تەنیا ئەوانە بێنە ژوور. ئەوانە چوونە ژوور و بەگوێرەی نەریتی تراکی سلاویان کرد و شەرابیان بە قۆچی گا خواردەوە. میدۆسادیس دەستەڕاستی سیووتیس بوو لە هەموو شوێنێك بەنوێنەری دەزانرا. ئینجا زینۆفۆن قسەی کرد: سیووتیس، تۆ یەکەم جار میدۆسادیست ناردە لای من لە خەلکیدۆنیا، داوات کرد لەشکرەکە بێنم و گوتبووت کە ئامادەی چاکەی ئەم شتەم بدەیتەوە. ئایا قسەکەی میدۆسادیس ڕاستە؟

میدۆسادیس قسەکەی تاکید کرد. زینۆفۆن بەردەوام بوو: دواتر لە پاریۆن، میدۆسادیس دیسان هاتەوە لام و گوتی ئەگەر لەشکرەکە بێنم ئەوسا بەچەشنی برا و برادەرێك وەردەگیرێین. هەروەها شارۆچکەکانی سەر لێوارەکە کە هی خۆتن، بەدیاری پێشکەشیان دەکەیت.

دیسان ڕووی لە میدۆسادیس کرد کە بزانێ قسەکە ڕاستە. میدۆسادیس گوتی ڕاستە. زینۆفۆن گوتی: کەواتە ئێستا بە سیووتیس بلێ لە خەلکیدۆنیا چ وەلامێکم دایەوە.

میدۆسادیس گوتی: تۆ گوتت لەشکر دەچێتە بیزەنتیۆم، ئیتر پێویست ناکا پارە بداتە کەس. هەروەها گوتت کە تۆ لەشکرەکە بەجێ دەهێلیت و ئەمانەی باست کردن هەموو ڕاست بوون.

زینۆفۆن پرسی: ئەدی کە هاتی بۆ سەلیمبریا Selymbria، لەوێ چم گوت؟ گوتی: گوتت ئەمە ناکرێ چونکە لەشکر دەچێت بۆ پەرینتۆس، ئینجا بۆ ئاسیا.

زینۆفۆن گوتی: دە ئێستا ئەوەتام و ئەوەتا فرینیکۆس کە یەکێکە لە جەنەراڵەکان و ئەوەتا پۆلیکراتیس کە کاپتنە. لە دەرێشدا پیاوەکانمان هێناوە تەنیا نێونی سپارتی نەبێت. جا ئەگەر دەتەوێ گفتوگۆمانمان ڕێکتر بێت با ئەوانیش بانگ بکەین. پۆلیکراتیس، برۆ پێیان بلێ با بەبێ چەك بێنە ژوور، تۆش شمشێرەکەت مەهێنە.

کە ئەمەی بیست، سیووتیس گوتی کە ئەو گومانی لە هیچ ئەتینیەك نەکردووە و باوەڕی وابوو کە خزمایەتی لەگەلیان هەیە و بە برادەری ڕاستەقینەیان دەزانێت. پاش ئەوی پیاوەکان هاتن، زینۆفۆن لێی پرسی، لەشکرەکەی بۆ چیە؟

سیووتیس ئەم گوتارەی دا: مێسادیس باوکم بوو حوکمی لەسەر ئینای و مێلاندیتای و ترانیپسای دەکرد. باوکم، ئۆدریسای، لە حوکمدا بەتوانا نەبوو، لە ولاتی خۆی دەرکرا و

نەخۆش کەوت و مرد، من بە هەتیمی لە سەرای میدۆکۆس، پاشای ئێستا، پەروەردە کرام بەلام هەر کە گەورە بووم هیچی تر پێم نەکرا نالخۆری خوانەی پیاوێکی دیکە بم. لێی پاڕامەوە چەك و پیاوم بداتێ بۆ ئەوەی زەبر لەوانە بوەشێنم کە دەریان کردووین و تاکو لە ئایندا سەربەخۆ بژیم، نەك ئەوها بارگرانیی لەسەردا بکەم. بەم پێیە، تا پێی کرا ولاغ و پیاو دامێ، سبەینێ ئەم پیاوانە دەبینن، ئیتر ئێستا وا لەگەڵ ئەوانە دەژیم و ملکی خۆم بە فیرۆ دەدەم. جا ئەگەر ئێوەش ڕەگەل من کەوتبان ئەوسا بەهیوای ئاسمان دەمتوانی بە ئاسانی دەسەلاتی خۆم وەر بگرمەوە. ئێوەم بۆ ئەم مەبەستەیە.

زینۆفۆن گوتی: ئەگەر ڕەگەڵت کەوتین چ شتێك دەدەیتە لەشکر و چ دەدەیتە جەنراڵ و کاپتنەکان؟ پێمان بڵێ تا ئەم پیاوانە بە لەشکرەکەی ڕابگەیێنن.

سیووتیس بەڵێنی دا کە مانگانە یەك ستاتەری سیزیکۆس بداتە هەر یەك لە سەربازەکان، دوو هەندەش بۆ کاپتنەکان و چوار هەندە بۆ جەنەراڵەکان. هەروەها زەوی، چەندی دەیانەوی وەریدەگرن، ئەمە سەرباری بەراز و گا، وێڕای قەلاتێکی کە لەسەر دەریایە.

زینۆفۆن پرسی: ئەگەر تێدا سەرکەوتوو نەبوین و کەوتینە ژێر مەترسیی سپارتیەکان، ئایا ئەوسا ئامادەیت ئاوارەکان بە پەناهەندە وەربگریت؟

گوتی: بەڵێ دەیکەم و دەتانکەمە برای و هاوخوانەی خۆم و بەشێکیش لە دەسکەوتەکانم پێشکەش دەکەم. بۆتۆش زینۆفۆن، کچەکەی خۆم دەدەمی و ئەگەر تۆ کچت هەیە، بەگوێرەی نەریتی تراکی، لەتۆی دەکڕم. هەروەها بیسانتی Bisanthe پێشکەش بەتۆ دەکەم وەکو جێیەك کە تێدا بژیت. ئەمە باشترین شارۆچەکەیە لە ملکی مندا لەسەر دەریا.

## چاپتەر -٣-
## هەڵمەتێک لەگەڵ سیووتیس

که یۆنانیه‌کان ئه‌مانه‌یان بیست، تۆقه‌یان له‌گه‌ڵ تراکیه‌کان کرد وه‌ك نیشانه‌یه‌ك بۆ براده‌رایه‌تی، ئینجا گه‌ڕانه‌وه و پێش ڕۆژهه‌ڵات گه‌یشتنه‌وه و قسه‌که‌یان بڵاو کرده‌وه. به‌یانی دیسان ئه‌ریستاخۆس به‌دوا جه‌نه‌راڵه‌کانی دا نارد به‌ڵام گوێیان نه‌دایێ و بڕیاریان دا کۆبوونه‌وه‌یه‌ك به له‌شکر بکه‌ن. هه‌موو تاقمه‌کان ئاماده بوون ته‌نیا تاقمی نیۆن نه‌بێت که له نۆردوگایه‌کی جودا بوون. زینۆفۆن هه‌ستایه‌وه و ئه‌م قسانه‌ی کرد: ئه‌ریساخۆس و که‌شتیه‌کانی ڕێگای په‌ڕینه‌وه‌یان له ئێمه گرتووه بۆیه له خۆمان ڕانابینین بپه‌ڕینه‌وه. ئه‌ریساخۆس هه‌مان که‌سه که‌وا ئێستا پێمان ده‌ڵێت با ڕێگای خۆمان به تۆبزی به‌سه‌ر چیای پیرۆزدا بکه‌ینه‌وه به‌ره‌و خه‌ۆرسۆنیز. ده‌ڵێ ئه‌گه‌ر وا بکه‌ین ئه‌وسا هیچی تر به یه‌خسیر نامانفرۆشێت و هیچی تر ئه‌و فێڵه‌مان لێ ناکات که له بیزه‌نتیۆم کردی، به‌ڵکو ئه‌وسا مووچه وه‌ر ده‌گرین و ناهێڵێت ئه‌وها بێ خۆراك بمێنین. ئه‌مه قسه‌ی ئه‌ریستاخۆسه، له‌لایه‌کی دیکه‌وه سیووتیس ده‌ڵێ ئه‌گه‌ر ره‌گه‌ڵ وی بکه‌وین قازانج ده‌که‌ین. جا ئێستاش ده‌بێ بزانن ئایا لێره ده‌مێنن یان بۆ کۆکردنه‌وه‌ی خۆراك ده‌ر ده‌چن؟ بۆچوونی خۆم ئه‌وه‌یه که‌وا چونکه به‌بێ پاره شتمان ناده‌نێ، و پاره‌شمان نیه، که‌واته ده‌بێ بچینه لایه‌ك که خه‌ڵکێکی بێ توانای تێدا بێت که بتوانین شتیان لێ بستێنین، ته‌نیا ئه‌وسا ده‌توانین گوێ له ئه‌فسه‌ره‌کان بگرین و ئه‌وسا ڕێگایه‌ك هه‌ڵبژێرین که به‌باشتری ده‌زانین. ئه‌و که‌سه‌ی به‌مه ڕازیه با ده‌ست بڵند بکات.

هه‌موو ده‌ستیان بڵند کرد و زینۆفۆن به‌رده‌وام بوو: شمه‌کتان تێك بنێن، که فه‌رمانی ڕۆیشتن ده‌را به‌دوا ئه‌فسه‌ره‌کانی خۆتان بکه‌ون.

زینۆفۆن پێش که‌وت و ئه‌وانی دیکه به‌دوای دا، نیۆن و هه‌ندێك که‌س که ئه‌ریستاخۆس ناردبوونی ویستیان په‌شیمانیان بکه‌نه‌وه به‌ڵام که‌س گوێی نه‌دایێ. پاش سێ فه‌رسه‌خ ڕێپێوان سیووتیس هاته لایان، که زینۆفۆن دیتی، بانگی کرد که بێته نێویان تا قسه‌یه‌ك به‌لای چاکه‌ی

گشتیدا بکات و خەڵکەکە گوێیان لێ بێت. کە هات، زینۆفۆن ئەم قسانەی کرد: ئێستا بەرەو جێگایەك دەڕۆین کە خۆراکی لێ دەست بکەوێت. ئەوسا دەتوانی قسەی خۆت بەکەی تا بزانین پێشنیازی تۆ باشترە یان پێشنیازی سپارتیەکان. ئێمە لەمەش ڕەچاو دەکەین کەوا تۆ یارمەتیمان دەدەیت کە خۆراك پەیدا بکەین.




سیوزتیس گوتی: زۆر باشە، هەندێك گوند شارەزام کە جۆرەها خۆراکیان لێ دەست دەکەوێت. هەندەش نزیکە دەتوانن بە ماوەی یەك فەرسەخ بیگەنێ.

زینۆفۆن گوتی: کەواتە پێشمان بکەوە.

پاش نیوڕۆ گەیشتنە گوندەکان، سەربازەکان کۆبوونەوە و سیوتس قسەی کرد: سەربازینە، من دەمەوێ لیش بۆ من بکەن. ئامادەم مانگانە یەك سیزیکین Cyzicene بدەمە هەموو سەربازێك ویرای مووچەی جەنەراڵ و کاپتنەکان. ئەوانەی کەشایستەن پاداشت دەکرێن، خورادن و خواردنەوەتان وەکو ئێستا لەم لادێیە دەست دەکەوێت بەڵام دەسکەوت و تاڵانەکان بۆ من دەبن تا خەزنیان بکەم و بتوانم مووچەتان دابین بکەم. ئەگەر دوژمنتان شکاند ئەوسا دەتوانن راویان بنێن، و ئەگەر خۆیان ڕاگرت ئەوسا بەیارمەتی ئێوە بەسەریاندا زاڵ بین.

زینۆفۆن گوتی: تا چ مەودایەك لە دەریا دورمان دەکەیتەوە؟
وەلامی دایەوە: هەرگیز لە هەفت رۆژەرێ پڕ نابێت، ئەگەر کەمتر نەبێت.
پاش ئەوە رێگا درا قسە بکرێت، هەندێك کەس قسەیان کرد کە هەموو بەلای ئیشەکەدا بورن و بە دەرفەتێکی زێدە باشیان زانی. ئاماژەشیان کرد کە ئێستا زستانە و تەنانەت ئەگەر بشخوازن هەر ناتاوانن بگەڕێنەوە و ناتوانن لە ولاتێکی دۆستانەدا بمێنن چونکە پارەیان نیە، جا ئەگەر هەر ناچار بن لە ولاتی دژواردا بژین، کەواتە باشتر ئەوەیە سیووتیسیان لەگەلّدا بێت نەك بەتەنیا بن، سەرباری ئەمانەش مووچە وەربگرن! ئەمە بەختەوەرییەکی گەورەیە.
بەهۆی کەوا کەس لاری لێ نەکرد پێشنیازەکەی خستە دەنگدان و پەسند کرا. پاش ئەمە، کە لەشکر ئۆردوگای دانا، سیوستیس جەنرالّ و کاپتنەکانی داوەت کرد، کە خەریك بوون بچنە نێو بارەگای سیووتیس بۆ نانی ئێوارە پیاوێك لە خەلّکی مارۆنیا Maronea ناوی هێراکلیدیس بور لەوێ قسەی لەگەلّ خەلّکەکان دەکرد و سیووتیسی هەلّدەکێشا. کابرا چوو بۆ لای هەندێك خەلّکی پاریۆن کە لەوێ وەستابوون، ئەوانە دەیانگوت با هاوپەیمانێتی لەگەلّ میدۆکۆس، پاشای ئدریسای، بکەن و دیارییان بۆ پاشا و ژنەکەی هێنابوو. هێراکلیدیس بەوانەی گوت کە پاشا ١٢ رۆژەرێ لە دەریا دوورە، کەچی سیووتیس ئێستا لەشکرەکەی لەدەستدا گرتووە و وای لێ دێت ببێتە ئاغای هەموو ناوچەی سەردەریا. گوتی: ئەمە دەبێتە هاوسێتان و توانای چاکە و خراپەی لە هەموو کەسێك زۆرتر دەبێت. ئەگەر عەقلّتان هەبێت دیاریەکانتان بدەن بەو نەك بیدەنە میدۆکۆس، ئەوها قازانجتان زۆرتر دەبێت.
ئەوجار رووی کردە تیماسیۆنی داردانی، بیستبووی کەوا شووشەوات و رابەخی فارسی هەیە. پێی گوت: داب و نەریتی لێرە وایە کە مێوان دیاری دەداتە خانەخوێ، جا ئەگەر سیووتیس ببێتە پیاوێکی مەزن ئەوسا دەتوانێ بتنێرێتەوە مالّی خۆت، یان ئەوەتا کە تۆ بکاتە پیاوێکی دەولّەمەند لێرە. هەمان شێوازی لەگەلّ هەموو مێوانەکان کرد، دەیویست شتێکی دەسکەوێت، بە زینۆفۆنیشی گوت: تۆ خەلّکی مەزنترین شاری یۆنانی، ناویشت هەندی سیووتیس بەرزە، رەنگە بە شتێکی باشی بزانی کە قەلات و ملکێکت لێرە هەبێت وەکو کە هاوشاریەکانی خۆت دەیکەن، کەواتە ئیشەکە هەندە دەهێنێت کە نرخی سیووتیس بزانی و

ستایشی بکەیت. من ئامۆژگاریت دەکەم چونکە برادەری تۆم، چەندە بۆ سیووتیس بکەیت دوو هەندە بۆ تۆ دەکاتەوە.

زینۆفۆن هەندێك شەرمی بەخۆ هات چونکە ئەوەی کە هەیبوو بریتی بوو لە یەك یەخسیر و هەندێك پارە بای خۆی. ئینجا چوونە سەر خوانەکە، تاقمەکە بریتی بوو لە هەندێك ئاغای تراکی، جەنراڵ و کاپتنەکان، ئینجا هەندێك باڵوێزی وڵاتەکان. بۆ نانخواردن بەشێوەی بازنەیەکی گەورە دانیشتن و تەبلەی سێ پێچکە بۆ هەر یەك لە میوانەکان دانرا. تەبلەکان پڕکرابوون لە کوتە گۆشت لەگەڵ نانی گەورە و تەنك کە لەپاڵ گۆشتەکە دانرابوون. تەبلەکان لە نزیك میوانەکان دادەنران، ئەمە بەشێك بوو لە نەریتیان. سیووتیس دەستی بە خواردن کرد، نانی بەردەستی خۆی لەت دەکرد و هەر جارە پارچەیەکی بۆ ئێرە و ئەوێ هەڵدەدا و هەمان شتی بە گۆشتەکە کرد تا وای لێ هات شتێکی کەم لەبەر دەمیدا مایەوە، هەر بای تام کردن[1]. ئەوانی دیکە کە تەبلەیان لەپێشدا بوو، لاسایان دەکردەوە. کەچی یەکی ئەرکادی، ناوی ئاریستاس بوو، زۆرخۆرێکی سەیر بوو، گوێی نەدەدایە ئەم نەریتە، گۆشتەکەی خستبوە سەر ئەژنۆی خۆی و پارچە نانەکانی وەردەگرت و هەر خەریکی خواردن بوو. لەم کاتەدا قۆچەگای پڕ لە شەرابیان گێڕا، کە شەرابگێڕەکە گەیشتە لای ئەریستاس، ئەریستا ئاماژەی بۆ زینۆفۆنی کرد و پێی گوت: بیدە بەو، ئەوە کاتی زۆرە دەنا من جارێ کاتی شەرابم نیە. سیووتیس گوێی لە قسەکە بوو، لە شەرابگێڕەکەی پرسی، دەڵێ چی؟ کە قسەکەی گێڕایەوە، بوو بە پێکەنینێکی گەورە.

کە شەراب دەگێڕدرا، یەکی تراکی هاتە ژوورێ ئەسپێکی سپی هێنابوو، قۆچەگایەکی پڕ کرد لە شەراب و گوتی: سیووتیس، بەخۆشیی تۆ دەخۆمەوە. وا ئەم دیاریەشم هێناوە. لەسەر پشتیدا دەتوانی دوژمنەکانت راو بنێیت و لەکشانەوەشدا ترسی ئەوەت نابێ کە دوژمن بەدوات بکەون. یەکی تر کوڕێکی هێنابوو، پاش ئەوەی بە خۆشیی ئەو خواردییەوە، پێشکەشی کرد. یەکی تر دیاریەکی بۆ ژنەکەی سیووتیس هێنابوو، تیماسیۆنیش کوپێکی زیوی پێشکەش کرد

[1] ئەم نەریتە عەشایەریانە زۆر بە نەریتی کوردەواری دەچن تەنیا ئەوەیە کە ئێمە هێشتا مێز و تەبلەمان نیە و (کوردی هەرە رەسەن) هێشتا لەسەر زەوی نان دەخوات.

لەگەڵ یەك رایەخی فارسی کە نرخەکەی ١٠ مینا دەبوو. ئەتینییەك ناوی گنۆستیپۆس بوو هەستایەوە گوتی کەوا ئەم نەریتە کۆنە نەریتێکی جوانە کە دەبێ ئەوانەی شتێکایان هەیە وەك جۆرێك رێز لێ نان پێشکەشی پاشای بکەن و کە دەبێ ئەوانی هیچیان نیە پاشا شتێکیان بداتێ بۆ ئەوی رێزی خۆی دیار بکات و گوتی: منیش حەزم دەکرد شتێکم هەبایە تا رێزی خۆمی پێ دیار بکەم.

زینۆفۆن نەیدەزانی چ بکات، لەسەرووی دیوەخان لە تەنیشت سیووتیس لەسەر کورسی دانیشتبوو. هێراکلیدیسیش شەرابگێڕێکی بانگ کرد، بەڵام کە دەستی پێکرد کەم کەمە بخواتەوە، بە باوەڕەوە هەستا سەر پێ و ئەم قسانەی کرد: سیووتیس، دیاریی من بریتیە لە خۆم و هاورێکانم کە ئێمە بکەیتە برادەری جێ باوەڕ، کەسیشیان لەوەدا دوودڵ نین کە برادەرایەتیی تۆ بکەن، ئەوەتان لێرە بەبێ هیچ داخوازیەك تەنیا داخوازیی ئەمە نەبێت کە دەردەسەری لەتۆ دوور بخەین. پشت بە خواوەندەکان ئەستور ملك و میراتت دەست دەکەوێتەوە و هەندێکی تریشت دێتە دەست، ئەسپ و پیاو و ژنی جوانت دەست دەکەوێت بە ئاسانی.

سیووتیس هەستایەوە و پێکەوە شەرابەکەیان خواردەوە و تلّپی نێو قۆچەکانیان بەسەر جلی خۆیاندا رشت. پاش ئەمە هەندێك کەس هاتن سەمایان بە قۆچەکان کرد وەك ئەوە بوو کە لەکاتی شەڕدا ئیشارەت بۆ یەکتر دەکەن. هەندێکی دیکە زوڕنایان هێنا لە کەوڵە گای خاو دروست کرابوون، ئاوازێکیان دووبارە دەکردەوە بە ئاوازی ماگادیس Magades دەچوو. ئەوسا سیووتیس هەستایەوە و نەعرەتەی جەنگی بەرز کردەوە، هەندێك قەرەقۆزیش هاتن گاڵتە و سەمایان کرد.

لە گەڕانەوەدا سیووتیس هاتە دەرێ و جەنراڵەکانی هەر یەك بە جودا بانگ کرد گوتی: برادەران، هێشتا دوژمن بەم هاوپەیمانەتیەی نەزانیوە. ئەگەر زوو خۆ ساز بکەن لەوسا ئەسیر و تالآنێکی باشمان دەبێت.

جەنەراڵەکان قسەکەیان پەسند کرد و گوتیان با پێشیان بکەوێت. گوتی: ئێوە ساز بن و چاوەڕێم بکەن، لەکاتی خۆیدا دێم. ئەوسا لەگەڵ ئێوە پەلتاستەکان پێشەوایيتان دەکەم.

زینۆفۆن گوتی: ئەگەر نیازت هەیە بەشەو بەڕێ بکەوین، حەز دەکەم بەشێوازی یۆنانی بێت. بەرۆژ، ئەو بەشە لەشکرە پێش دەخەین لە سوارە و پەلتاست کە شارەزای ولاتەکەن، بەلام بەشەو ئێمە هۆپلیتەکان پێش دەخەین چونکە هێواشتر دەڕۆن. بەمجۆرە لەشکر لێك دانابڕین. زۆر جار خەڵك لەبەر بێباکی زیانیان پێ گەیشتوە.

سیووتیس گوتی: باشە، شێوازەکەتان پێڕەو دەکەم. هەروەها ڕێناس لە پیاوە پیرەکان لەگەل ئێوە بلاو دەکەمەوە کە شارەزاییەکی زۆرباشیان هەیە. منیش لەگەلَ سوارەکان لە دواوە دەبم، لەکاتی پێویستیشدا دەتوانم بەزووترین کات بگەمەوە پێشێ.

وشەی ئەتین Athene بە ناوی نهێنی دانرا بەهۆی کۆنە پێوەندیەکی کۆنی بنەماڵکەی سیووتیس کە لەگەلَ ئەتینا هەبوە، ئینجا بلاوەیان لێ کرد تا هەندێك بحەسێنەوە.

نیوەی شەو سیووتیس و سوارەکانی پەیدا بوون، سینگیان بە زرێ داپۆشرابوو، پەلتاستەکانیش ساز ببوون. ئەمانەی کردە ڕێناس ئینجا هۆپلیتەکان پێشکەوتن، پەلتاستەکان لەدوایاندا، ئەوجار سوارەکان وەکو پاسەوانی پاشەر. بەری بەیانی، سیووتیس ولاغەکەی بۆ پێشێ تاودا و ئەمەی دەربڕی کەوا ڕێپێوانی یۆنانیەکان زۆر باشترە چونکە جاران بەشەو بە ژمارە کەمتریشەوە لێك دادەبڕان. بەلام ئێستا وا ڕۆژ داهاتۆتەوە کەچی لەشکر هەر بە یەکپارچەیی ماوەتەوە. گوتیشی: ئێستا لێرە بوەستن، من پیاسەیەك دەکەم و دەگەڕێمەوە.

قسەکەی کرد و بەرەو چیاکان لێی خوڕی. کە گەیشتە هێلّی بەفر، بەدوا ئایا هیچ شوێنپێی گەڕا ئینجا هاتەوە و گوتی: برادەران، هەموو شتێك بەباشی ڕۆیشتوە. ئەگەر خواوەندەکان لەگەلّمان بن دەتوانین پێش ئەوی هەستمان پێ بکەن بەسەریاندا بدەین. ئێستا من و سوارەکان پێش دەکەوین تا ئەگەر تووشی کەسێك بوین، دەرفەتی نەدەین خەبەر بدات. ئێوە بەدوا شوێنی ولاغەکانمان بکەون، کە لە چیاکە پەڕینەوە، کۆمەڵە گوندێکی تێر وتەسەل هەن.

نیوڕۆ گەیشتە سەر چیا. پاش تەماشاکردنێکی گوندەکان هاتەوە لای هۆپلیتەکان و گوتی: هێرش بە سوارەکان دەکەم، پەلتاستەکانیش دەنێرم بۆ دەشتاییەکە. ئێوەش تا پێتان دەکرێ زوو فریامان بکەون نەبادا بەرهەلّستیەکی وا هەبێت.

کە ئەم ڕینماییانە بە زینۆفۆن گەیشتن، لەسەر ئەسپەکەی دابەزی. سیووتیس لێی پرسی: بۆچی دابەزی؟ دەمانەوێ خێرا بگەینێ.

زینۆفۆن گوتی: چونکە لام مسۆگەرە کە منت بەتەنیا پێویست نیە. ئەگەر لەپێشیان بڕۆم، ئێستا دەبینی چۆن هۆپلیت خێراتر دەڕۆن.

سیووتیس ڕۆیشت و تیماسیۆن بە سوارەکانیەوە بەدوای کەوت. زینۆفۆنیش پیاوە هەرە گورجەکانی تەمەن ٣٠ ساڵی کۆکردەوە و لەگەڵیان بەخێرایی کەوتە ڕێ. کلینۆر بەشەکەی دیکی لەشکرەکەی دەکێشا. کە گەیشتنە گوندەکان، سیووتیس بە ٣٠ سوارێکەوە بۆ لای زینۆفۆن ئەسپەکەی لێی خوڕی و گوتی: زینۆفۆن، چۆنت گوت ئەوها بوو. ئەم خەڵکانە گیراون بەڵام سوارەکانم بڵاو بوونەتەوە و کۆنتڕۆڵ ناکرێن. دەترسم دوژم پەلاماریان بدەن. دەبێ هەندێکمان لە گوندەکە بمێنین کەوا پڕن لەخەڵك.

زینۆفۆن گوتی: کەواتە خۆم و پیاوەکانم ئەو بەرزاییانە دەگرین. تۆ بە کلینۆر بڵێ با هێڵەکانی بەسەر دەشتەکەدا درێژ بکاتەوە تاکو ئەو گوندانە داپۆشێت.

مانۆڕەکەیان جێ بەجێ کرد و لەئەنجامدا ١٠٠٠ یەخسیر، ٢٠٠٠ گا و ١٠٠٠٠ ئاژەڵی جۆراوجۆر گیران.

## چاپتەر -٤-
## شەڕێک لەپاڵ سیووتیس

ڕۆژی دواتر سیووتیس گوندەکەی تەخت کرد و یەک خانووی بە قیتی نەهێشت تاکو گوندەکانی دیکە بزانن کە ئەگەر خۆ بەدەستەوە نەدەن چیان بەسەر دێت. ئینجا هێراکایدیسی لەگەڵ دەسکەوت و تالانەکان ناردەوە بۆ پەرینتۆس بۆ ئەوەی بیانفرۆشێت و پارە بۆ لەشکر بێنێتەوە. خۆیشی لەگەڵ لەشکرەکە لەم دەشتە مایەوە، دەشتەکە لی تیرینیەکان بوو بەلام چۆڵیان کردبوو بەرەو گردەکان[1].

بەفرێکی زۆر کەوتبوو، هەندەش سەرمابوو کەوا لەم شەراب و ئاوەی کە هێنابویان هەموو مەیین. هەندێک یۆنانیش لووت و گوێیان پەڕی، ئەوجار تێگەیشتن تراکییەکان بۆچی کەوڵە ڕیوی لە سەر و گوێیان دەکەن و بۆچی پەستەکی درێژیان هەبوو بای هەموو بەژنیان و بۆچی لە سواربووندا باڵاپۆشی درێژیان لەبەر دەکرد هەموو قاچیانی دادەپۆشت، ئەوە باشتر بوو لەچاو ئەو پاڵتۆ کورتانەی ئێمە.

سیووتیس هەندێک ئەسیری بەرەڵلا کرد کە بە هەڵاتووەکان بڵێن ئەگەر نەگەڕێنەوە ئەوا گوندەکانی وانیش دەسوتێنێت و لەبرسان دەمرن. لەئەنجامدا ژن و منداڵ و پیرەکان گەڕانەوە، بەڵام گەنجەکان لە گوندەکەی بنار چیاکە دامەزران. سیووتیس داوای لە زینۆفۆن کرد سەربازە گەنجەکانی خۆی بێنێت و بەدوای بکەون، شەو بەرێ کەوتن و بەیانی گەیشتنە گوندەکان، زۆربەیان هەڵاتن بەڵام لەوانەی مانەوە سیووتیس هەمووی بە ڕمب کوشتن. زینۆفۆن پیاوێکی ئۆلینتی لەگەڵ بوو پێیان دەگوت ئەپیستینیس کە زۆر حەزی لە کوڕان دەکرد، لەم ڕووداوەدا کوڕێکی جوانکەلەی دیت لە جوانترین تەمەندا بوو دەیانبرد بیکوژن. ئەپیستینیس لە زینۆفۆن پاڕایەوە کە شتێک بۆ ئەم کوڕە جوانە بکات، زینۆفۆن چووە لای سیووتیس و داوای لێ کرد

---

[1] شایانی گوتنە کە بەخسیرێکی ناوداری وەک سپارتاکۆز خەڵکی تراکیا بووە. ئیتر بە ڕووداوی ئەوها دیار دەبێت کە چۆن خۆبەخۆیی عەشایەری وای لە خەڵکی ئەو وڵاتە کردووە یەکتر بەخسیر بکەن و بە دەوڵەتانی دیکە بفرۆشرێن.

کوڕەکە نەکوژن. باسی ئەپیستینیسی بۆ کرد چ جۆرە کەسێکە کەوا لە کاتی خۆیدا تاقمێك چەکداری بۆ خۆی پێك هێنابوو و بە مەردانە شەڕی پێ دەکردن، مەرجی سەرەکی ئەوەبوو کە لەشجوان و وەرزشکار بن، جا سیوۆتیس لێی پرسی: ئامادەی بۆ ئەم کوڕە خۆ بەکوشت بدەیت؟

ئەپیستیس ملی درێژ کرد و گوتی: لێمکوژن، لەگەر کوڕەکە رازییە، بمکوژن. رەنگە دوایە بە چاکەی من بزانێتەوە.

سیوۆتیس لە کوڕەکەی پرسی کە ئایا ئەپیستینیس لەباتی خۆی بکوژێت؟ بەڵام کوڕەکە گوتی (نا) و پاڕایەوە کە کەس نەکوژن، لەوسا ئەپیستینیس باوەشی لە کوڕەکە دا و گوتی: سیوۆتیس، مەگەر بەشەڕ لێم بستێنی، من دەستی لێ هەڵ ناگرم.

سیوۆتیس پێکەنی و وازی هێنا. بڕیاری دا کامپێك لەوێ بکا بۆ ئەوەی هەڵاتوەکان نانیان دەست نەکەوێت. خۆی چووە خواری بۆ دەشتەکە، زینۆفۆنیش لەگەڵ پیاوە هەڵبژاردەکانی لەوێ مانەوە کە بەرزترین گوندی ناوچەکە بوو. یۆنانیەکانی دیکە لە گوندێك مانەوە کە پێیان دەگوت گوندی تراکیە کێویەکان.

پاش چەند رۆژێك تراکیەکان هاتنە خوارێ، دەپاڕانەوە بۆ داهێنانی ئاشتی و بۆ ئازادکردنی بارمتەکان. لەهەمان کات، زینۆفۆن چوە خوارێ بە سیوۆتیسی گوت کە حاڵیان لە گوندەکە ناخۆشە و دوژمن لەدەوریانن. گوتی شوێنی ئاواڵە بەباشتر دەزانێت لەچاو شوێنێکی قایم، بەڵام دابراو. چونکە دوور نیە چواردەوریان لێ بگرن. سیوۆتیس گوتی با پشوی خۆش بکات. هەندێك بارمتە و تراکیەکانی پێشان دا، ئەوانە دەستیان پێکرد لە زینۆفۆن بپاڕێنەوە. زینۆفۆن رازی بوو و داوای کرد خۆ بەدەستەوە بدەن بەمەرجی کە هیچیان لێ نەکرێت. بەڵام لەراستیدا ئەوان بۆ هەواڵگری هاتبوون.

شەو، تراکیەکان هاتنە خوارێ و هێرشێکیان کرد. هەر یەك لە خاوەن ماڵە داگیرکراوەکان بیوونە رێنما بۆ هەندێك چەکدار، بێگومان بەو تاریکییە رێگا بە ناشارەزایەك نادۆزرێتەوە چونکە خانوەکان پەرژینی بەرزیان لەدەوردا بوو بۆ راگرتنی مەڕ و مانگا. کە گەیشتنە بەر دەرگا، رمبیان هاویشت و کوتەکیان هەبوو بەکاریان دەهێنان، خەڵکی دیکە ئاگریان لە خانوەکان بەردا

و زینۆفۆنیان بەناوی خۆی بانگ کرد کە یان بێتە دەرێ تا بیکوژن و یان ئەوتا بە زیندویی بسووتێت. بانەکان ئاگریان گرتبوو، زینۆفۆن و وانیش بە شمشێر و خودە و قەڵغانەوە لە ژوورە بوون. سیلانۆس، کوڕێکی ١٨ ساڵان بوو خەڵکی ماکیستیا، لێرەدا شەیپووری ژەنی و یۆنانیەکان لە هەموو خانوەکان شمشێریان ڕاکێشا و بەغار دەرچوون. تراکیەکان هەڵاتن و قەڵغانەکایان لەسەر شان دانابوو بەدوا خۆیان ڕادەکێشان، هەندێکیان لە پەرژینەکە لەوێدا گیریان خوارد و قەڵغانەکانیان لەسەر ئەو کەڵەکە بەردانە چەقین. هەندێکی دیکەش ڕێگایان بزر کرد و هەر لەوێدا کوژران. یۆنانیەکان بۆ دەرێ رایان ماڵین. بەڵام هەندێکیان گەڕانەوە لە تاریکی وەستابوون شتیان لەو یۆنانیانە دەگرت کە لەبەر ڕۆناکایی ئاگرەکاندا وەستابوون. کاپتن هیەرۆنیمۆسی، ئایۆدی بوو، لەوێ برینداربوو. هەروەها تیزگرینیس، یەکی لاکرۆنی بوو، بریندار بوو بەڵام کەسیان نەکوژرا.

سیووتیس بە هەفت سوار و شەیپوورژەنێکی تراکیەوە فەریایان کەوت. کە ئەمەی دیتبوو فەرمانی دابوو بەدرێژایی ڕێگا شەیپوور بژەنن، ئەمەش دوژمنی ترساندبوو. کە گەیشتە جێ پیرۆزبایی لێ کردن و گوتی وای ڕادەدیت کە هەندێکیان لێ کوژرابێت.

ئینجا داوای لە زینۆفۆن کرد ئەسیرەکانی بداتێ و ئەگەر حەز دەکات با لەگەڵی بێت چونکە نیازی هەڵمەتێکی هەیە. سبەینێ سیووتیس ئەسیرەکانی دایێ، زۆربەیان پیرە مێرد بوون لە پیاوە هەرە گرینگەکانی ناوچەکە و لەگەڵ سیووتیس بۆ هەڵمەتەکە چوون. هێزەکەی سیووتیس سێ هەندی جاران گەورە ببوو چونکە هەندێك ئۆدریسایی ڕەگەڵی کەوتبوون، کاتێکیش کە ثینییەکان لەوهەموو سوارە و پەلتاست هۆپلیتانەیان لە دەشتەکە دیت، هاتنە خوارێ بۆ ئاشتی پاڕانەوە. بەڵێنیان دەدا کە هەموو فەرمانەکانی سیووتیس بەجێ بگەیێنن و داوایان دەکەرد گەرەنتی و بەڵێنەکان قەبووڵ بکات. سیووتیس زینۆفۆنی بانگ کرد، پێشنیازەکانی تێگەیاند و گوتی ئەگەر زینۆفۆن بخوازێ تۆڵەی خۆی بکاتەوە، ئەوا ئاشتی ڕەت دەکاتەوە. زینۆفۆن گوتی: ئەگەر ئازادی خۆیان بە یەخسیری بگۆڕنەوە، ئیتر ئەمە باشترین تۆڵەکردنەوەیە. ئامۆژگاریی کرد کە لە ئایندەدا بارمەتە لە خەڵکە بەتواناکان بەرێت تەنیا پیرەکان بهێڵێتەوە.

ئەوها، ئەم بەشەی تراکیا کەوتە دەست سیووتیس.

## چاپتەر -٥-
# کێشە لەسەر مووچە

ئینجا بۆ ئەو بەشەی تراکیا ڕۆیشتن لە باکووری بیزەنتیۆم کە پێی دەگوترێ دەلتا. ناوچەکە لەدەست میسادیسدا نەمابوو بەڵکو لە دەست تیریس بوو کوڕی تۆدریسیس. هێراکلیدیس هاتەوە پارەی هێنابوو کە لە فرۆشتنی تالآنەکان پەیدای کردبوو، سیووتیس سێ جووت ئێستر و هەندێك بەراز و گای دانا و بێ لەهەموو جەنەراڵەکانی دیکە بەدوا زینۆفۆنی دا نارد کە ئەم دیاریە قەبووڵ بکات. زینۆفۆن وەڵامی دایەوە: لە ئایندەدا ڕەنگە دیاری وەربگرم بەڵام ئێستا وا باشترە کە بەسەر جەنەراڵەکانی دیکەدا بەش بکرێت.

ئیتر هەر یەك لە تیمایۆسیۆنی داردانی و کلینۆری ئۆرخۆمینۆس و فرینیکۆسی ئاخەیی جوتە ئێسترێکیان وەرگرت، بەراز و گاکانیش لەنێوان کاپتنەکاندا بەش کرا. مانگێك بەسەر چو بوو کەچی سیووتیس مووچەی ٢٠ رۆژی دابوو چونکە هیراکلیدیس گوتبووی هەموو تالآنەکان تەنیا ئەوەندە پارەیان کرد. زینۆفۆن بەمە تورە ببوو و بە جیددی قسەی لەگەڵ هێراکلیدیس کرد، گوتی: بەڕای من ئێوە وەکو پێویست ئاگاتان لە سیووتیس نەماوە. دەبوو ئێستا مووچەیەکی تەواوت هێنابایەوە تەنانەت ئەگەر پارەت قەرز کردبایە. ئەگەر ئەمەشت پێ نەکرابایە، دەبوو کراسی خۆتی بۆ بفرۆشی.

هێراکلیدیس بەم قسانە تورە بوو، دەشترسا کە سیووتیس گومانی لێ بکات، ئیتر لەو رۆژەوە دەستی پێکرد دڵی سیووتیس لە زینۆفۆن رەش بکات. سەربازەکان گلەییان لە زینۆفۆن دەکرد کەوا مووچەکە بەساغی وەرنەگیراوە، لەلایەکی دیکەوە هێراکلیدیس رەفتاری دۆستانەی لەگەڵ زینۆفۆن نەدەکرد چونکە هەمیشە مووچەکەی بەبیر دەهێنایەوە. تا ئێستاش سیووتیس هەر دەیگوت ئەگەر بگەنەوە لای دەریا قەڵاتەکانی بیسانس و گانۆس دەداتە ئەو، کەچی ئێستا باسی نەدەکردەوە، ئەمەش بە فیتی هێراکلیدیس بوو کە ناوی زینۆفۆنی زڕاندبوو و گوتبوی باش نیە قەڵاتێك بداتە کەسێکی ئەوها کە لەشکرێکی هەیە.

زینۆفۆن دەستی پێکرد بیر لە چارەیەك بکاتەوە دەربارەی ئەو هەڵمەتە بۆ قوڵایی تراکیا هێراکلیدیس جەنەراڵەکانی دەبردە لای سیووتیس و پێی دەگوت کە ئەوانە دەتوانن بەبێ زینۆفۆن لەشکرەکە بگێڕن. بەڵێنیشی دانێ کە لەماوەی چەند رۆژێکدا مووچەی دوو مانگ دابین بکات. تیماسیۆن گوتی: کاری سەربازی بەبێ زینۆفۆن ناکەم تەنانەت ئەگەر مووچەی پێنج مانگیشم بدەنێ.

کلینۆر و فرینیکۆسیش لەگەڵ ئەم هەڵوێستە بوون.

سیووتیس داوای لە هێراکلیدیس کردبوو بە جودا بانگیان بکات و دواتر زینۆفۆنی بانگ کرد. زینۆفۆن لە نیازی هێراکلیدیس گەیشتبوو و دەیزانی کە دەیەوێ ئاشنایی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا کەم بێتەوە، هەستا هەموو جەنەراڵ و کاپتنەکانی دیکەی لەگەڵ خۆی برد، زۆربەیان بە قسەی سیووتیس رازی بوون و رەگەڵی کەوتن بۆ سالمیدەسوس. بەنێو وڵاتێکدا رۆیشتن کە پێی دەگوترا مەلینۆفاگی. لێوارێکی زۆر درێژ بوو لە زیخ، لەو ناوەدا مەرێکی یەکجار زۆر رادەگیران تا بە کەشتی بار بکرێن، تراکیەکان ئەستوونیان لەسەر لێوارەکە دەچەقاند بۆ جوداکردنەوەی ناوچەی هەر تاقمێك. ئیتر کە یەکێك لە کەشتیەکان دەشکا یان لای دەدا سەر زەوی ئەوان تالانیان دەکرد. دەڵێن کە پێشتر ئەو ئەستونانە نەچەقێندرابوون هەمیشە لەسەر تالانی کەشتیە شکاوەکان بەشەڕ دەهاتن و زۆریان لە یەکتر دەکوشت. لەم ناوەشدا جۆرەها قەنەفە و سندووق و دەفتەری نووسین، ئەوانەی کە ناڤخودان بەکاریان دێنن، لێرە فڕێ درابوون.

هێزەکە خەڵکی ئەم ناوەی ژێردەستە کرد و گەڕانەوە. تا ئەو کاتەش سیووتیس لەشکرێکی سەربەخۆی پەیدا کردبوو چونکە ئۆدیسایی رەگەڵی دەکەوتن و هۆزەکانی دیکەش دەهاتن خۆیان دەخستە ژێر دەسەلاتی. ئۆردوگایان سێ رۆژ دوور لە دەریا دانا لە دەشتێك لە سەرووی سەلیمبریا. هێشتا هیچ نیشانەیەك دەر نەکەوت کە خەریکن مووچە بدەن و سەربازەکان زۆر لە زینۆفۆن تورە ببوون، سیووتیسیش وەکو جاران برادەر نامابوو، وای لێ هاتبوو هەموو جارێك کە داوای دیداری دەکرد، بیانگەیەکی دەدۆزیەوە گوایە کاتی نیە.

## چاپتەر -٦-
## زینۆفۆن پەلامار دەدرێت و لەسەر خۆی دەکاتەوە

دوو مانگ بەسەر چوو.کارمینۆس و پۆلۆنیکۆس، سپارتی بوون، لە لای تیبۆرنەوە هاتن، خەبەریان پێبوو کەوا سپارتیەکان بڕیاری جەنگیان داوە دژی تیزافەرنە، و بەم نیازەوە تیبۆرن بەدەریادا بەرێ کەوتووە. ئێستا داوای خزمەتەکانی لەشکرەکە دەکات و بەڵێنی داوە هەر پیاوێك مانگانە یەك داریك مووچەی هەبێت، کاپتن دوو هەندە، جەنراڵیش چوار هەندە.

سپارتیەکان گەیشتنە جێ و کە هێراکلسیدیس بە مەسەلەکەی زانی، بە سیووتیسی گوت ئەمە دەرفەتێکی زێڕینە بۆ خۆی و گوتی: سپارتیەکان پێویستیان بە لەشکرەکە هەیە کەچی تۆ ئیشت پێ نەماوە. ئەگەر بیدەیتە سپارتیەکان ئەوە بەچاکە بۆتۆ دەژمێردرێت و لەهەمان کاتیشدا سەربازەکان هیچی تر داوای مووچە لەتۆ ناکەن چونکە دەبێ بڕۆن و لاتەکە بەجێ بهێڵن.

کە ئەمەی بیست، سیووتیس داوای لێ کرد سپارتیەکان بانگ بکات. کە هاتن و باسیان کرد، وەڵامی دایەوە کە لەکشرەکە دەخاتە بەر دەستیان و دەیەوێ ببێتە برادەر و هاوپەیمانی سپارتا. بانگی کردن بۆ سەر خوانەیەك و مێوانداریيەکی باشی نواند بەڵام زینۆفۆن و جەنەراڵە یۆنانیەکانی دیکەی بانگ کرد. کە سپارتیەکانی پرسیان زینۆفۆن پیاوێکی چۆنە سیووتیس گوتی پیاوێکی خراپ نیە تەنیا لەوەیە کە لەگەڵ سەربازە ئاسایيەکاندا برادەرایەتی دەکات بۆیەش وەکو پێویست هەڵناسوڕێت. پسریان: ئایا حەزی لێیە لەنێو پیاوەکاندا ناوبانگ دەرکات؟

هێراکلیدیس وەڵامی دایەوە: بەڵێ، ڕاستە.

گوتیان: کەواتە ئایا لە بردنی لەشکردا دژایەتیمان ناکات؟

هێراکلیدیس گوتی: گومان نیە، بولاَم ئەگەر لەشکر کۆبکەنەوە و پێیان بڵێن کە مووچەیان دەنێ، ئەوسا بایەخ بە زینۆفۆن نادەن و خەنیش دەبن لەگەڵتان بڕۆن

پرسیان: کەواتە چۆن بتوانین کۆبوونەوەیان پیّ بکەین؟

هێراکلیدیس گوتی: بەیانی زو ئێوە بۆ نێو لەشکرەکە دەبەین. مسۆگەرەم کە لەگەڵ بتانبینن لەوسا لەخۆڕا بۆتان دین و کۆدەبەنەوە.

رۆژەکە ئەوها بەسەرچوو. رۆژ داویە، هێراکلیدیس و سیووتیس سپارتیەکانیان بردە نێو لەشکر و ئەوانیش لێیان خڕبوونەوە و دوو سپارتیەکە ئەم قسانەیان کرد: حوکمەتەکمان بڕیاری داوە جەنگ دژی تیزافەرنە جاڕ بدات. ئەگەر رەگەڵ ئێمە بکەون دەتوانن تۆڵەی خۆتان لەو پیاوە بکەنەوە کە هەندە خراپەی ئێوەی کردووە. هەر یەك مانگانە یەك داریك وەردەگرێت، دوو هەندەش بۆ کاپتنەکان و چوار هەندەش بۆ جەنەراڵەکان.

سەربازەکان بەم قسانە گەشانەوە و یەکی ئەرکادی هەستایەو و ویستی پەلاماری[1] زینۆفۆن بدات. سیووتیسیش لەویّ بوو، ویستی بزانیّ مەسەلەکە بەچی دەگات، لە شوێنێك وەستا کە گوێی لە قسەکان بێت، ئەگەرچی یۆنانیی دەزانی بەڵام تەرجومانی لەگەڵدا بوو.

ئەرکادیەکە دەستی بە قسە کرد: ئەی پارتیەکان، ئەگەر زینۆفۆن ئێمەی تەفرە نەدابایە بۆ ئێرە لەمێژ بوو دەبایە ئێمە لەگەڵ ئێوە بین کەوا بەدرێژایی ئەم زستانە سەختە لێرە جەنگاوین و شەو رۆژ جوڵاوینەوە. کەچی زینۆفۆن قازانجی خۆی لە رەنجی ئێمە وەرگرتووە. سیووتیس تەنیا ئەوی دەوڵەمەند کردبوو، ئەویش مووچەکەی گل دەدایەوە. یەك لەبارە خۆم دەڵێم با بەردباران بکرێت تا مردن لەسزای ئەوەدا کە تا ئێستا ئێمەی بەم وڵاتەدا بردووە، ئەوسا هەست دەکەم مافی خۆم وەرگتۆتەوە و سەرباری ئەو هەموو ماندویەتیەش هیچ گلەیی دەربارەی مووچە ناکەم.

پاش ئەو کۆمەڵێك سەرباز هەمان رایان دووپات کردەوە. ئینجا زینۆفۆن بەم جۆرە قسەی کرد: پیاو نابیّ سەیری بە هیچ شتێك بێت. ئێستا وا من بەرەورووی تۆمەتەکانی ئێوە دەبمەوە، کەچی لەناخی دەروونمدا دەزانم کە من بەهەموو توانایەکەوە یارمەتم داون. کە ئیشتان باش بوو، من دەچومەوە بۆ ماڵیّ خۆم بەڵام کە بیستم تووشی سەختی بوونە، گەڕامەوە تا یارمەتیان بدەم.

---

[1] وەرگێر وشەی attack بەکار دەهێنێت، مەبەستیشی لە رەخنەی توندوتیژە.

سیووتیس وا لێرەیە، کۆمەڵێك نامەی بۆ من نارد و جۆرەها بەڵێنی دا تا لەگەڵی ڕێك بکەون. وەکو دەیزانن، من ئەم نیازەم نەبوو بەڵکو لێوەم بەرەو ئاسیا دەبرد، لینجا ئەریستاخۆس هات ڕێگای گرت. ئەریستاخۆس دەیگوت دەبێ بە خەرسۆنیزدا بڕۆن و سیووتیس هانی دەدان کە لەگەڵی ڕێك بکەون، هەموو گوتتان لەگەڵ سیووتیس دەڕۆین. ئایا تۆبزیم لەکەس کردووە؟ ئەوجار سیووتیس دەستی پێکرد لە مووچەدا فێڵ بکات. مافی ئەوەتان هەیە تاوانبارم بکەن بەمەرجێك ئەگەر ڕەفتاری ویش پەسند بکەن، من کەباشترین برادەری بووم، ئێستا لەهەموویان خراپترم. لای ئێوەم هەڵبژارد نەك لایەنی وی، کەواتە چۆن دەبێ گلەیی لەمن بکەن. من برادەرایەتی ئەوم لەدەست خۆم دا؟ ڕەنگە بڵێن پارەکەم وەرگرتووە و ئێستا دەمەوێ بیشارمەوە! باشە، ئەگەر سیووتیس شتێکی دابێتە من، ئایا بۆ ئەوەی بووە کە مووچەکەتان بەتەوای بدات؟ نەخێر، دیارە بۆ ئەوەی بووە کە شتێکی گەورەتری لەکۆڵ بێتەوە. جا ئەگەر ئەوهایە، ئێستا بە ئاسانی دەتاونن داوای مووچەکەتان بکەن ئیتر هەموو پلانەکەی هەڵدەوەشێننەوە. ئەگەر من پارەی سیووتیسم وەرگرتبێت، ئەوسا داوای دەکاتەوە، چونکە لەبەرانبەر ئەو بەرتیلەدا من لیشەکەم بەباشی جێبەجێ نەکردووە!

لە ڕاستیدا، من پارەم بۆ کەس وەرنەگرتووە، سوێند بە هەموو خواوەندەکان دەخۆم کە تەنانەت بۆ خۆمیش هیچم وەرنەگرتووە. وا لێرە وەستاوە و گوێی لێیە و دەزانێ ئایا خۆم کردۆتە سوێندشکێن؟

بۆ ئەوەی زیاتر سەرتان بسوڕێنم، دەبزانن کەوامن هەندی جەنەراڵەکان دیکە شتم وەرنەگرتووە، سوێندی لەسەر دەخۆم. ئەگەر دەپرسن بۆچی؟ چونکە بیرم کردەوە ئەگەر لە کاتی هەژاریدا بەشدار خەمی بم ئەوسا لەکاتی پایەداریدا دەبێتە برادەرێکی باشتریش. ئێستاش وەك دەبینن ئیشی باش بووە و تێگەیشتم کەسایەتیی ڕاستەقینەی چیە. ڕەنگە بەمن بڵێن چۆن ئەوها تێکەوتی؟ بەڵێ، ئەگەر لەگەڵ دوژمن تێکەوم ئەوە گێلییە، بەڵام لەگەڵ برادەر یەکەوم، باوەڕم وایە هەڵخەڵەتاندن سەرشۆڕیە نەك تێکەوتن. بەهەر حاڵ لام مسۆگەرە کەوا هەموو مشورێکمان خواردووە بای ئەوەی هیچ بیانگەیەك بۆ سیووتیس نەهێڵینەوە. خراپەمان

نەکردووە، بەرژەوەندییەکانی ئەومان پشتگوێ نەخستون و بەشەرمەوە ئەرکەکان سەر شانمکان جێبەجێ نەکردووە.

رەنگە بڵێن "دەبایە لەسەرتاوە گەرنتی لێ وەربگرین تاکو دواتر نەتوانێ فێل بکات" بەلام دەمەوێ بە بیرتان بهێنمەوە ئێوە لە چ حالێك بوون و کە هاتنە لای سیووتیس چۆن رزگارم کردن. لەبیرتانە کە بەرەو پەرینتۆس دەچوون و ئەریستاخۆسی سپارتی دەروازەی لە رووتان داخست و نەیهێشت بچنە ژوور و بە چلەی زستان لەو دەشتە مانەوە؟ لەبیرتانە کە ناچار بوون خۆراکی خۆتان بکڕن و هیچتان نەبوو بیفرۆشن و پارەتان نەبوو؟ ئێوە ناچار کران لە تراکیا بمێنن چونکە کەشتیەکان لەوێ ئەنکەر کران[1] و ڕێگایان بە ئێوە نەدا بپەڕنەوە بۆ ئاسیا. مانەوەتان لە تراکیا ئەوەی دەگەیان کەوا لە ولاتی دەژمندان بەرەورووی سوارە و پەلتاستەکانیان دەبوونەوە. ئێمە هۆپلیتمان هەیە. رەنگ بوو هەندێك گوندمان دۆزیبایەوە بەلام ئەو هێزەمان نەبوو لە سوارە و پەلتاست ئەسیر و گارانەکان بگرێت. ئایا لە حالەتێکی ئەوها بێ ئومێدا خەنی نەبوون کە سیووتیس بوو بە برادەرتان؟ هەرنەبێ سوارە و پەلتاستی هەبوو، بە هاوکاری وانیش دەسکەوتی باشترتان بوو لە یەخسیر و مالات. باشە، گریمان لەکاتی خۆیدا سیووتیس سوارە و پەلتاستی بۆ ئێمە دابین کردبایە بەبێ مووچە، ئایا شتێکی خراپ بوو؟ ئایا ئەمە هۆیە بۆ ئەوی بمکوژن؟

حالی ئێستاتان رەچاو بکەن کەوا زستانێکتان بەتێری بەسەر بردووە، وێڕای مووچەیەکی کە هەندێك لەچاو بەلێنەکان کەمتر بوو. بەلام هەرچی خوراوە و خەرج کراوە هەموو لەمالی دوژمن بوو، لەهەمان کاتیشدا یەك کوژراوتان نەداوە، ناوبانگی خۆتان لەشری ئاسیا بەباشی پاراستوە، سەرباری ئەمەش لە بەری ئەورووپا دژبە تراکیەکان سەربەرزیتان بۆخۆتان تۆمار کردووە. مەبەست ئەوەیە کە لەباتی ئەوەی رقتان بەمن هەلڕێژن، دەبێ سپاسی خواوەندەکان بکەن بۆ ئەو هەموو پیرۆزیەەی کە پێیان بەخشیون.

---

[1] ئەنکەر . پارچە ئاسنێکی قورسە وەکو چەنگالێك لەسەر کەشتی دەیخەن بنی ئاوەکە تا لە زەوی بچەقێت و کەشتیەکە ئاو نەیبات.

ئێوە ئەو هەموو بەختەتان هەبوو، بەڵام تو ئاسمان فەرموون بزانن بەختی من چۆن بوو. کە بەرەو ماڵێ دەرچووم ڕێزێکی گەورەم لاتان هەبوو و جیاوەری سپارتیەکانیش بووم دەنا بۆچی منیان دەنارده لاتان؟ کەچی ئێستا لەلای وانیش سەرزەنشت کراوم و برادەرایەتیم لەگەڵ ئێوەش تێکچووە. من هەمیشە خەریکی چاکەتان بوومە و بەرگەی ئەوهەموو ڕەخنەم گرت، ئێستاش هەڵوێستتان ئەوهای لێ هاتووە؟ جا چ بکەم، خۆ لەبەرتان هەڵنەهاتووم، چم لێ دەکەن؟ لەبیرتان بێت کە ئەوکەسەی دەتانەوێ بیکوژن شەوخوونی بۆ ئاسوودەیی ئێوە کردووە. لەگەڵتاندا ڕەنج و مەترسیی دیتوە، ڕۆڵی خۆی بەزیادەوەش گێڕاوە، یەکێکە کە پشتەستور بە خواوەندەکان دژی بێگانە لەگەتاندا سەرکەوتنی دیتوە و بەرانبەر بە شارە یۆنانیەکانیش نەیهێشتوە توشی هیچ دوژمنایەتیەك بن و ئێستا دەتوانن بۆ هەر لایەکی یۆنان بچن.

ئێستا ئیشتان باش بووە و دەچنەوە ماڵێ کەوا چەند لەمێژە مەراقتانە بچنەوە و ئێستا کەوا بەهێزترین دەوڵەتی یۆنانی داوای خزمەتەکانتان دەکات و مووچەشتان دەداتێ. ئێستا سپارتیەکان کە گوایە باشترین فەرماندەن، هاتوون رابەرایەتیتان بکەن، ئایا ئەمە گوڵجاوترین کاتە کە سزای مەرگ بەمن بگەیێنن؟ بەڕاستی بیرێکی باشتان هەیە، لەکاتی تەنگانەدا بیرتان ئەوها نەبوو چونکە ئەوسا منتان بەباوك دەزانی و بەڵێنتان دەدا چاکەکانم لەیاد نەکەن. بەڵام هەرلەبێ وا سپارتی لێرەن و رای تایبەتی خۆیان دەدن، وابزانم فیکرەیەك دەربارەی ئێوە وەردەگرن.

ئەوها کۆتایی بە گوتارەکە هێنا و خارمینۆسی سپارتی هەستایەوە ئەم قسانەی کرد: سوێند دەخۆم بە جمکەبراکان کە وا پێ ناچێت مافی ئەوەتان هەبێت لەم پیاوە تورە بن. خۆم هەندێك بەڵگەم هەیە لە چاکەی ئەو دان. کە من و پۆلینیکۆس پرسیارمان لە سیووتیس کرد، تاکە ڕەخنەی ئەمە بوو کە زینۆفۆن زۆر لایەنی سارباز ئاساییەکان دەگرێت، بۆیەش بەگوێرەی پێویست بەرز نابێتەوە و بۆیە پێوەندیی لەگەڵ سپارتییەکان و لەگەڵ سیووتیس باش نیە.

ئینجا یوریلۆخۆس، ئەرکادی بوو خەڵکی لوسیا، هەستایەوە و گوتی: ئەی سپارتیەکان، باوەڕم وایە دەبێ پێش هەموو شتێك ئێوە فەرماندەیی بگرنە دەست و ئەگەر بخوازێت یان نەخوازێت، مووچەکان لە سیووتیس وەرگرن و ئێمەش لەگەڵ خۆ بەرن.

ئینجا پۆلیکراتیسی ئەتینی، بە رێنمایی زینۆفۆنەوە، هەستا و گوتی: برادەران، وا هێراکلیدیسیش لێرەیە، ئەو بوو کە تالانەکانی فرۆشت و ئەیتوانی ئەو پارە بۆ سیووتیس و بۆ ئێمەش بهێنێتەوە. لەباتی ئەوە، پارەکەی بۆ خۆی برد و هێشتا هەر لەلایتی. ئەو تراکی نیە، بەڵکو یۆنانیە و ناتوانێ فێڵ لە هاولاتیی خۆی بکات. ئەگەر کەمێک هۆشیار بین دەبێ بیگرین.

لەگەڵ سیووتیس سواری ئەسپەکانیان بوون و بەرەو ئۆردوگا لێیان خوڕی. ئینجا تەرجومانەکەی ناردە لای زینۆفۆن، داوای دەکرد بەخۆ و بە ١٠٠٠ هۆپلیتەوە لەخزمەتیدا بمێنن بەو بەڵێنەی کە ئەو شوێنانەی سەردەریای بداتی وێڕای هەموو پاداشتەکانی کە پێشتر بە بەڵێنی دابوونی. زۆر بە باوەڕیشەوە گوتی کە لە پۆلینکۆسم بیستووە ئەگەر بکەوێتە دەست تیبۆرن ئەوسا یەکسەر دەیکوژێت. کۆمەڵێک نامەی تر بۆ زینۆفۆن هاتن هەموو دەیانگوت دەبێ وریا بێت چونکە کەوتۆتە ژێر گومان، لە ئەنجامدا زینۆفۆن دوو ئاژەڵی کردە قوربانی بۆ زیۆسی پاشا، دەیپرسی ئایا لەگەڵ سیووتیس بمێنێت یاخۆ لەگەڵ لەشکرەکە بڕوات؟ وەڵامی سیووتیس ئەوە بوو کە دەبێ لەگەڵ لەشکر بڕوات.

## چاپتەر -٧-
## زینۆفۆن قسە لەگەڵ سیووتیس دەکات

سیووتیس ئۆردوگاکەی هەندێك دوور خستەوە، یۆنانیەکانیش چوونە گوندەکان تا پێش ئەوەی بگەڕێنەوە لای دەریا هەرچی دەستیان بگاتێ تالانی بکەن. سیووتیس گوندەکانی پێشکەش بە میدۆسادیس کردبوون و زۆر قەلس بوو کە دیتی وا تالان دەکرێن. ٣٠ سوار و پیاوێکی خەڵکی باکووری لەگەڵ خۆ هێنا و زینۆفۆنی بانگ کرد. زینۆفۆن هەندێك کاپتن و چەکداری لەگەڵ خۆ برد و، میدۆسادیس قسەی: زینۆفۆن ئەم تالانکاریە کە دەیکەن شتێکی باش نیە. من لەلایەن سیووتیسەوە هاتووم و ئەم پیاوە لەلایەن میدۆکۆس، پاشای دەشتاییەکان باکوور، هاتووە دەڵێین ئەم ناوە چۆڵ بکەن. ئەگەر چۆڵی نەکەن ئەوسا بە دوژمن دەزانرێن و ناهێڵین لێرە بڕۆن و بەرگری دەکەین دژ بەوانەی زیان بە ولاتمان دەگەیێنن.

زینۆفۆن وەڵامی دایەوە: بەڕاستیە، تۆ کە ئەوها قسە دەکەیت پیاو نازانێ وەڵامێکت بداتەوە. قسەم لە چاکەی ئەم گەنجەدا یە کەوا لێرە وەستاوە تا بزانێت ئێمە کێین و ئێوە کێن. ئێمە پێشتر بە ئارەزووی خۆمان بێرەدا دەهاتین و تالانمان دەنایەوە و ئێوە نەدەوێران بگەنە ئەم ناوانە، کە دەشهاتن لەترسان ولاغەکانتان بە زینکراوی دەهێشتەوە کە ئەمەش نیشانەیەکە کەوا ولاتی دوژمنتان بووە. دواتر کە ئێوە بوونە هاوپەیمان، بە یارمەتی خومەوەنداکان و یارمەتی ئێمە، ئێستا بوونەتە خاوەنی ولاتەکە. جا ئێستا دەتانەوێ لێرە دەرمان بکەن؟ لەباتی چاکە دەتانەوێ ئۆردوگا بارکەین؟ ئەم داواکاریەی تۆ ڕیزی تێدا نیە، تەنانەت بۆ خواوەندەکانیش. ئەم گەنجەی لێرە باشتان دەناسێت کەوا ئێستا گەشانەوەتان بەخۆ دیتوە کەچی جاران هەر بە تالان و گەڕان دەژیان.

هەندێك ڕاوەستا و دەستی پێ کردەوە: بۆچی بەمن دەڵێی، خۆ من سەرلەشکر نیم. لەشکر ئێستا لەدەست سپارتیەکانە کە بە خۆتان پێشکەشتان کردن، و بای هەندەش خالەدان نەبوون داوەتمان بکەن بۆ گفتوگۆکان. دەتانویست ئاشنایان نەبین، بەڵام چۆن لەشکرەکەم بۆ ئێوە هێنا، ئێستا بۆ وانی دەبەم.

کە ئاغا ئۆدیسیەکە ئەم قسانەی بیست گوتی: میدۆکۆس، لەشەرمان خەریکە بە خاکدا بچمە خوارێ. ئەگەر دەمزانی لەگەڵت نەدەهاتم. میدۆکۆس، پاشای من لەگەڵ ئەوەدا نیە خراپەی کەسانێك بکەین کە چاکەیان بۆ ئێمە هەبوبێت.

پاش ئەمە، سوار بوو بۆ دوور لێی خوری. سوارەکانی دیکەش هەمان شتیان کرد تەنیا چوار- پێنجێکیان نەبێت. بەلام میدۆکۆس لەبەر وێرانکردنی لادێکە رقی هەستابوو، داوای لە زینۆفۆن کرد جەنەراڵە سپارتیەکان ببینێت.

ئەوجار زینۆفۆن هەندێك کەسی جیاوەزی لەگەڵ خۆ بردە لای خارمینۆس و پۆلینکۆس و پێیانی گوت کەوا میدۆکۆس داوا دەکا یۆنانییەکان برۆن و گوتی: وابزانم دەبێ مەسەلەی مووچەکەیان چارە بکەن، ئەوسا لەخۆڕا بەدواتان دەکەون.

سپارتیەکان قسەکەیان وەرگرت و گوتیان کە ئەم داخوازیە و هەر داخوازیەکی تر هەبێت، وەری دەگرن. یەکسەر لەگەڵ گەورە ئەفسەران بەرێ کەوتن بۆ لای میدۆکۆس و گوتیان: میدۆکۆس، ئەگەر قسەت هەیە بیکە دەنا ئێمە قسەمان پێیە.

میدۆکۆس بە ملهوڕییەوە گوتی: تەنیا ئەوە دەلێم، کە ئەمە قسەی سیووتیسیشە، با ئەم خەڵکە ئازار نەدەن چونکە خەڵکی خۆمانن.

ئەوجار سپارتیەکان گوتیان: ئەمانەن ئەو کەسانەی کە وایان کردووە خەڵکەکە بین بە هی خۆتان. هەر کاتێك مووچەیان وەرگرت ئەوسا دەڕۆین، دەنا لێرە دەمێنین و پشتی سەربازەکانمان دەگرین دژ بەو کەسانەی فێلیان لێ کردوون، و ئەگەر تۆ لەم کەسانەیت ئەوسا دەبێ مافیان لەتۆش وەربگرنەوە.

لینجا زینۆفۆن قسەی کرد: ئەو خەڵکانەی کە تۆ بەلی خۆتیان دەزانیت ئایا دەفەتیان دەدەن کە دەنگ لەسەر ئەمە بدەن کە کێهەمان لێرە بڕوات، ئێمە یان ئێوە؟

میتۆکۆس پێشنیازەکەی پەسند نەکرد، بەلام گوتی با مەسەلەی مووچەکە لەگەل سیووتیس ساغ بکرێتەوە. ئەگەر دوو سپارتیەکە بچن، ساغ دەکرێتەوە. ئەگەر ناچن، با زینۆفۆن بچێت، بەلێنی دا کە پشتی بگرێت. پاڕایەوەش کە لەم ماوەدا سووتاندنی گوندەکان بوەستێنن.

پاش ئەمە زینۆفۆن و پیاوەکانیان ناردە لای سیووتیس و ئەم قسانەی کرد: من نەهاتووم داوای هیچ شتێك بکەم، هاتووم پێت بڵێم کە تۆ مافت نەبوو لەمن تووڕە بی. مووچەی سەربازەکان چەندە لە چاکەی سەربازەکاندا بووە هەندەش لە چاکەی تۆدا بوە، لەسەرەتادا ئەمانە پاش خواوەندەکان هۆی ئەوە بوون کە تۆ ببیتە پاشا و ئەو هەموو پایەداری و ملکەت پێ ببڕێت تا وات لێ هات خەڵك باسی هەموو کردارەکانت بگێڕنەوە لەگەر کاری سەربەرزکەر بووبن یان کاری سەرشۆڕکەر. ئەمڕۆ بەم پایە گەیشتی جا حەز ناکەم خەڵك بڵێن بەچاکەی ئەو کەسانەت نەزانیوە کە چاکەیان کردووی. هەروەها، بۆ ئەوەی کە لەنێو ئەم ٦٠٠٠ چەکدارەی خۆمان ناوبانگێکی باشت هەبێت، لەهەمووی گرینگتر ئەوەیە کە وات لێ نەیەت خەڵك باوەڕ بە قسەکانت نەکەن. خۆم دیتوومە چۆن کەسانێکی کە باوەڕیان پێ ناکرێت دەسەلاتیان نامێنێت. کەچی خەڵکی باوەڕپێکراو قسەیان لە ئاسوودەکردنی ناوچەیەکدا، کە هەڕەشە دەکەن، قسەکەیان بای هێزێکی چەکدار کار دەکات و کە بەڵێنێك دەدەن، بەڵێنەکەیان لەباتی پارە تێنی دەبێت. بیر لە حاڵەتی خۆت بکەوە، تۆ چەند پارەت دا بۆ ئەوەی کە ببین بە هاوپەیمانی تۆ؟ تۆ هیچ پارەت نەدا، تەنیا ئەوەبوو کە باوەڕمان بە بەڵێنت کرد، بەمەش لەشکرێکت پێك هێنا کە دەوڵەتێکی بۆتۆ دابین کرد ئەمەش نرخەکەی زۆر لەو ٣٠ تالەنتە گەورەترە کە پیاوەکانمان بە مافی خۆیانی دەزانن. بەڵێ نرخەکەی جارەهای جار لەمە گەورەترە. کەواتە باوەڕ و ناوبانگ ئەم ئیمپراتۆریەتی بە تۆ دا، وا ئیستاش بەهۆی ئەوەندە پارە ناوبانگت شکا.

پێم خۆشە بەبیری خۆتی بێنیەوە کە لەکاتی خۆیدا دەسکەوتێکی ئەوهات بە چەند دەنرخاند؟ ئامادەبووی چەندین هەندی ئەم برە پارە بدەیتن واش بزانم هیچ شتێك لەوە ناخۆشتر و سەرشۆڕانەتر نیە کە تۆ نەتوانی ئەم دەسکەوتان بپارێزیت. هەژارێکی ئاسایی زۆر باشترە لە دەوڵەمەندێك کە دواتر پارەی نەماوە، جا باشتر ئەوەیە کە لەسەرەتاوە مرۆڤێکی ئاسایی بی نەك ببیە پاشا و دواتر ببیەوە بە مرۆڤێکی ئاسایی. هەروەها ئەم خەڵکە بەتۆبزی بوونەتە ژێردەستەی تۆ نەك لە خۆشەویستی تۆ، و ئێستاش حەز دەکن ئازاد ببنەوە. دەبێ تێبگەن کە پێوەندیت لەگەڵمان باشە و ئەگەر بتەوێ داوامان دەکەیتەوە، بەڵام گریمان هەستیان کرد کە یۆنانی باوەڕیان بە تۆ نەماوە و تەنانەت ئەم سەربازانەی ئێرەش برادەرت نین؟ لەم دوو ئەگەرە کامەیان

بۆ بەرژەوەندیی خۆت بەباشتر دەزانیت و کامەیان دەبێتە مایەی سەپاندنی دەسەلاتت لەسەر ئەم خاکەدا؟ گومان نیە کە ئەو خەلکانە ژمارەیان کەم نەبوو، بەلام هۆی ژێردەستەبوونیان دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی رابەرایەتی. ئێستا مەترسی هەیە کە رابەرایەتیەك بۆخۆیان دامەزرێنن، هەر لە سەربازانی ئێمە تا دوژمنەکانی خۆت، تا سپارتیەکان، کە بەتواناتریشن. ئەم ئەگەرە نزیکتریشە چونکە ئەگەر سەربازەکانی ئێمەیان دیت وا خزمەتی سپارتیەکان دەکەن و سپارتیەکان مووچەکە لە تۆ دەستێنن، مسۆگەرە ئەوسا تراکیەکان بەگژتدا دێنەوە. مانەوەی دەسەلاتی تۆ، واتە بەخسیری بۆ ئەوان، نەمانیشت واتە ئازادی.

با وابزانین تۆ سەرپەرشتی ئەم ولاتە دەکەیت وەکو ملکی خۆت بێت. کام ریگا بەباشتر دەزانی؟ ئایا سەربازەکانمان پارەی خۆیان وەربگرن و لاتەکە بە ئاسوودەیی بەجێ بهێلن، یان بەجۆرێکی دوژمنانە لێرە بژیێن؟ هەروەها ئەگەر لەشکری خۆت پێك هێنا بۆ ئەوەی کە لەبەرانبەریاندا بوەستی، ئایا ئەوانە پێویست بە تفاق ناکەن و ئایا دوو هەندە پارەیان ناوێت لەچاو پارەکەی ئێمە؟

بەرای هێراکلیدیس، وەکو کە بۆمنی باس کرد، دەلێ پارەکە زۆرە. منیش دەلێم ئێستا ۱۰ هەند توانای پارەدانت زیادترە لەچاو ئەو کاتەی کە بەلێنەکەت دا. زۆریەکەی بەگوێرەی ژمارەکەی نیە بەلکو کە کەسێك دەلێ (ئەمە زۆرە) یان (کەمە) ئەم زۆر و کەمیە بەگوێرەی دەرامەتی ئەو کەسەیە کە پارەکە دەدات.

لەم قسانەمدا بەرژەوەندی تۆم وەکو بەرژەوەندی برادەرێك تەماشا کردووە، دەمەوێ هەست بکەم کە شایستەی ئەم پایەیت کە خواوەندەکان بەتۆیان بەخشیوە و دەمەوێ ناوبانگی منیش نەزرێت. ئێستا کە لەشکر لەم حالەدایە، نە دەتوانم خراپەی تۆی بکەم و نە دەتوانم، ئەگەر داواشی بکەیت، چاکەت بۆ بکەم. هەستی لەشکر لەبەرانبەر مندا ئێستا ئەوهایە واش هەر، خواوەندەکان ئاگادارن، کە من هیچ شتێکم لە تۆ وەرنەگرتووە بۆ وان و گلەم دابێتەوە بۆ خۆم و خۆت لەسەر ئەم قسە شایەدیت. من تەنانەت داوای بەلێنەکانی تۆشم نەکردووە و سوێند دەخۆم کە ئەگەر تۆش کردبات، من وەرم نەدەگرتن، مەگەر مافی سەربازەکانت

بەتەواوی دابایە، ئینجا مەگەرا مایەی شەرمەزاری بوو ئەگەر ئیشی خۆم باش کردبایە و ئەوانم بەم حاڵە هێشتبایە لەکاتێکدا کە رێزیان لەمن دەگرت.

گومان نیە کە هێراکلیدیس وا دەزانێ دەبێ پارە بەهەر شێوەیەك پەیدا بکەین. لە بەرانبەردا من باوەڕم وایە کە هیچ دەسکەوتێك بۆ پیاوان، بەتایبەتیش پیاوی دەسەڵاتدار، ئەو نرخەی نیە وەکو رێز و بەەری و دەستپاکی. پیاوی لەوها دەوڵەمەندیەکەی لەوەدایە کە برادەری زۆرن و ژمارەیەکی زۆرتیش حەز دەکەن برادەرایەتیی بکەن. لەخۆشیدا هاونشینی زۆرن و لەناخۆشیدا خەمخۆری زۆر دەبن.

ئەگەر منت لە رەفتارمەوە نەناسیبێت کە چ برادەرێکی دڵسۆزم و، ئەگەر بەم هەموو قسانەم لە زەمینەی راستی نەگەیشتبی، دەکەواتە راستی لە قسەی سەربازەکان وەربگرە. خۆت لەوێ بویت و دیتت چۆن رەخنەیان لەمن گرت، تۆمەتیان دایە پاڵ من کەوا بەرژەوەندیی تۆم بە پێش بەرژەوەندیی سپارتیەکان خستوە، پەلاماری منیان دا کەوا بەرژەوەندیی تۆم پێش ئەوانیش خستوە گوایە بەرتیلم لەتۆ وەرگرتووە. ئایا ئەگەر هەستیان کردبایە کەوا دژایەتیت دەکەم ئەم تۆمەتە بەخەیاڵیاندا دەهات؟ تۆ لەسەرەتادا پێش ئەوەی خزمەتت بکەم پێشوازییەکی باشت لەمن کرد، قسە و روخسارت خۆش بوون، میواندارییی منت دەکرد و هەمیشە بەڵێنی جۆرەها شتت بۆ من دووبارە دەکردەوە. ئێستاش ئامانجەکانت بەدی هێناوە و بوی بەو پیاوە مەزنەی کە من ویستم، چۆن دەهێڵی لەنێو سەربازەکاندا سووك بکرێم؟ لەلام مسۆگەرە کە تۆ دەگەیتە ئەم بڕیارەی کە پارەکە بدەیت، زەمان فێرت دەکات و وای لێ دێ بەرگەی دیتنی ئەو کەسانە نەگری کە لەخۆڕا خزمەتیان کردی. کەدەڵێم پارەکە بدە، بۆ لەوەمە کە هەمان ناوبانگی پێشوت پەیدا بێتەوە.

کە سیووتیس ئەم قسانەی بیست، لەعنەتی نارد بۆئەو کەسەی کە وای کرد پارەکە نەنێرێت، هەمووش تێگەیشتن کە مەبەستی هێراکلیدیسە، گوتی: یەك لەبارە خۆمەوە هەرگیز حەزم نەکرد پیاوەکانت لە مووچە بێبەش بکەم و هەر ئێستا دەیدەم.

ئینجا زینۆفۆن دیسان قسەی کردەوە: ئێستا کە نیازت هێنا، حەز دەکەم پارەکە لە رێگای منەوە بدرێت و نەهێڵی پاش لەوهەموو خزمەتانە ناوبانگم بزرێت.

سیوروتیس وەڵامی دایەوە: دڵنیا بە کە ناوبانگت نازڕێت و لەگەر خۆت و ١٠٠٠ هۆپلیت لەژێر فەرماندەیی خۆتدا لێرە بمێنن، ئەوسا قەڵاتەکانی سەر دەریا بە تۆ دەبەخشم وێڕای هەموو بەڵێنەکانی پێشو.

زینۆفۆن گوتی: سەبارەت بەم شتە، ئەمە ڕێی ناچێتێ. جارێ با بڕۆین.

سیوروتیس گوتی: بە ئارەزوی خۆت بکە. بەڵام دەشزانم لێرە بۆ تۆ ئاسوودە ترە.

زینۆفۆن گوتی: سپاسی ئەم پەرۆشەت دەکەم، ناتوانم لێرە بمێنم، بەڵام ئەگەر بە هەر پایەیەکی بەرز گەیشتم، دەبێ بزانی کە لە قازانجی خۆتدا یە.

سیوروتیس گوتی: ئێستا زۆر پارەم پێ نیە. بەڵام ئەوەی کە هەمە، یەك تاڵەنتە. هەر وەها ٦٠٠ گا و نزیکەی ٤٠٠٠ مەڕ و ١٢٠ یەخسیر. لەگەڵ خۆتیان بەرە، و هەروەها بارمتە لەو یەخسیرانە بەرە کە لەگەڵ تۆدا بەدرەفتار بوون.

زینۆفۆن پێکەنی و گوتی: گریمان ئەم هەموو شتە بەشی مووچەکانی نەکرد، ئەوسا تاڵەنتەکە بۆ کێ بێت؟ لەم حاڵە ترسناکەی مندا، لەباتی ئەوەی کە بەردباران بکرێم، ئایا باشتر ئەوە نیە کە بگەڕێمەوە ماڵی خۆم؟ خۆ هەڕەشەکانت بیست؟

ئەو ڕۆژە لەوێ مانەوە، ڕۆژی دوەم سیوروتیس ئەو ماڵاتەی بە هەندێك پیاوی خۆیدا نارد. تا ئەم کاتەش سەربازەوکان هەر دەیانگوت زینۆفۆن ڕەگەڵ سیوروتیس کەوتووە. کەچی کە دیتیان، گەشانەوە و بەرەو پیری چوون. هەر کە چاوی بە خارمینۆس و پۆلۆنیکۆس کەوت، زینۆفۆن گوتی: لەسایەی سەری ئێوەدا، ئەم دەسکەتانەمان بۆ لەشکر دابین کرد. من دەیخەمە بەر دەستی ئێوە و داواتان لێ دەکەم کە بەسەر سەربازەکاندا بیبەشنەوە.

بەم پێیە دەستیان بەسەر ماڵاتەکە داگرت و خەڵکیان لەسەر دانان بۆ ئەوەی بیانفرۆشن و وەك هەمیشە لیشەکەیان بە ناڕێکی ئەنجام دەدا. زینۆفۆن خۆی لە مەسەلەکە نەگەیاند و دیاری خست کەوا خۆی بۆگەڕانەوە ساز دەکات. (هێشتا دەنگدان لەسەر مەسەلەی شاربەدەرکردنی زینۆفۆن لە ئەتینا ئەنجام نەدرابوو). بەڵام برادەرەکانی لە ئۆردەگادا هاتنە لای و لێی پاڕانەوە کە لەشکر بەجێ نەهێڵێت تا پێشڕەوییان پێ دەکات بۆ دەرەوەی تراکیا و دەیانگەیێنێ بۆ لای تیبرۆن.

## چاپتەر٨-
## زینۆفۆن لەشکر بەجێ دەهێڵێت

لێرەوە بە دەریادا ڕۆیشتن تا لامپساکۆس، لەوێ فالگر یوکایدیسی فیلیۆم کوڕی کلیۆگۆراس، ئەوەی کە نیگاری فرێسکۆیسی لە لیکیۆم کێشابوو، هات بۆ دیەنی زینۆفۆن. بەخێرهاتنەوەی کرد و لێی پرسی ئایا هیچ زێڕی پێیە؟ زینۆفۆن سویندی بۆ خوارد کە تەنانەت پارەی گەڕانەوەشی نیە، مەگەر ئەسپ و شمەکی خۆی بفرۆشێت. یوکلیدیس باوەڕی نەکرد بەڵام کە خەڵکی لامپساکۆس دیاریان بۆ نارد و ویستی قوربانییەك بۆ ئەپۆلۆ بکات (یوکلیدیس لە پاڵی وەستابوو کە ئاژەڵەکەی سەربڕی) کوشتەکەی پشکنیەوە گوتی ئێستا باوەڕ دەکەم کە پارەت نیە و دەزانم ئەگەر پارەش بۆ بێت تەگەرە پەیدا دەبن، تەنانەت خۆت تەگەرە بۆ خۆت دروست دەکەی. زینۆفۆن دانی پیێ نا و یوکلیدیس بەردەوام بوو: بەڵێ، ئایا قوربانیت بۆ زیۆس کردووە بەو شێوەی کە لەماڵێ بۆ تۆم دەکرد؟

زینۆفۆن وەڵامی دایەوە کە لەوەتی ماڵی بەجێ هێشتوە قوربانیی بۆ زیۆسی نەکردووە. یوکلیدیس ئامۆژگاری کرد کە بیکات چونکە بە قازانجی خۆی دەگەڕێتەوە. ڕۆژی دووەم زینۆفۆن چوو بۆ ئۆفرینیۆن و قوربانیەکەی کرد. بەگوێرەی نەریتی وڵاتەکە بەرازیکی سەرلەبەری سووتاند و نیشانەکان باش بوون. لە هەمان ڕۆژدا بایۆن و نۆسکلیدیس گەیشتنە وێ پارەی لەشکریان دا. لەگەڵ زینۆفۆن بوونە برادەر و ئەو ئەسپەیان بۆ وەرگرتەوە کە لە لامپساکۆس بە ٥٠ داریك فرۆشتبووی. لەمە چونکە بیستبویان ئەسپەکەی خۆش دەویست و ئەگەر ناچار نەبایە نەیدەفرۆشت. پاش ئەمە، ڕێپێوانیان بەنێو ترواد دا کرد و لە چیای ئیدا ئاوا بوون و گەیشتنە ئەنتاندرۆس. ئینجا بەدرێژایی لێوارەکە ڕۆیشتن تا گەیشتنە تیبە. لەوێش گەشتێکیان کرد بەرێگای ئەدرامیتیۆن و سێرتۆنۆن بۆ دەشتی کایکۆس تا گەیشتنە پێرگامۆن لە میسیا.

لێرەدا هێلاس ژنیٚ گۆنگینۆسی ئارتیریا[1] لەگەڵ دایکی گۆنگینۆس پێشوازیەکی گەرمیان لە زینۆفۆن کرد. گوتیان ئەسیداد، پیاوێکی فارسە، لەو دەشتە دەژیێت، لەگەر بە ٣٠٠ پیاوێکەوە بە شەو بۆی بچن، دەتوانن فارسەکە بە ژن و منداڵەوە بگرن، وێرای شمەك و ماڵی کە شتێکی کەم نەبوو. ئامۆزای خۆی لەگەڵ نارد وێرای پیاوێك بەناوی دافناگۆراس کە زۆر خۆشی دەویست. زینۆفۆن قوربانییەکی کرد. باسیاس، فاڵگرێکی ئەلیس بوو، گوتی نیشانەکان بێئەندازە باشن و گومان نیە کە ئەو پیاوانە ژێردەستە دەکرێن ئیتر پاش نانی ئێوارە بەئومێدی سەرکەوتن کاپتنە هەرە دڵسۆز و باشەکانی برد، هەروەها ٦٠٠ کەسێك خۆیان رەگەڵ دا بەلاٚم کاپتنەکان گەڕاندیانەوە بۆ ئەوەی ناچار نەبن بەشیان بدەن، چونکە هەر لەئێستاوە تالاٚنەکانیان بە مسۆگەر دەزانی.

دەوری نیوە شەو گەیشتنە جیٚ و یەکسەر یەخسیر و مالاٚتەکەی کە لە دەریٚ بوون لەبەر دەستیان هەلاٚتن. ئەوان مەبەستیان ئیتر قەلاٚتەکە بوو، وازیان لە هەموویان هێنا چونکە مەراقیان ئەسیداد و ماڵەکەی بوو. هەوڵیان بۆ راماڵینی قەلاٚتەکە سەری نەگرت، بورجێکی بەرز و قایم بوو، سەنگەری لەسەردا هەبوو بە چەکدارێکی زۆرەوە. ئیتر خەریك بە کەلێنێکدا خۆی تێکەن.

دیوارەکە هەشت خشتەقوڕ بەرین بوو بەلاٚم کە رۆژ هەلاٚت کونێکیان تیٚ کرد، یەکێك لە ژوریٚ شیشێکی گەورەی بەدەستەوە بوو کە بۆ برژاندنی کەلەشە گا بەکار دەهات، ئەو شیشەی لە رانی یەکەم کەس راکرد ئەوەی لە کونەکە چووە ژوور. ئینجا رێژنەیەك تیریان هاوشت وای لیٚ هات کەس نەدەوێرا لە زارکی کونەکەش نزیك بێتەوە. بەرگریکارەکان هاواریان دەکرد و بە مەشقەڵە ئاگر ئیشارەتیان بۆ دوور دەنارد، بەوەش ئیتامینیس بە هێزەکەیەوە بە فریایان هات، هەروەها لە کۆمانیاوە هۆپلیتی ئاشووری[2] هاتن سەرباری ٨٠ سواری هیرکانی کە ئەوانەش

---

[1] بۆ زانیاری، (ئاری ئەریا) واتە (ئاڵ دەریا) یاخود (دەریای سوور). هەمان وشەی یۆنانی بە وڵاتی ئەریتریا نراوە لە خۆرهەلاٚتی ئەفریقیا (باشووری دەریای سوور). بەلاٚم لێرەدا زینۆفۆن باسی گۆمە ئاوێك دەکات لە ناوچەی خۆی کە هەمان ناوی هەبووە.

[2] ئەم قسە بۆ برا ئاشوورییەکان گرینگە کە لێی بکۆڵنەوە.

مووچەخۆری شا بوون. ئینجا نزیکەی ٨٠٠ پەلتاست و سوارە پەیدابوون، هەندێك لە پارتنیۆن و هەندێکیش لە ئەپۆلۆنیا و لادێی دەوروبەر.

بێگومان کاتی لەوە هاتبوو یۆنانییەکان بیر لە هەلاتن بکەنەوە. مەڕ و ماڵاتیان کۆکردەوە لەگەڵ یەخسیرەکان بە شێوەی چوارگۆشە لێیان خوڕین، چوارگۆشەکەش هەندە رێك نەبوو چونکە لە یەك کاتدا خەریکی کشانەوە و تالانەکەش بوون.

کە گۆرگیلۆس دیتی وا یۆنانیەکان دەگشێنەوە و ئەوانەی پەلاماریان دەدان هێزێکی گەورەیان هەیە، بەقسەی دایکی نەکرد و بە فریای یۆنانیەکانەوە چوو تا جێ دەستی لەم کارەدا هەبێت. هەروەها پرۆکلیس و تیۆسرایناس، نەوەی دامارتۆس، لە هالیسارنەوە بۆ یارمەتی دەرچوون. لەم کاتەشدا پیاوانی زینۆفۆن لەژێر تەوژمی تیر و بەردبارانیدا بوون و بەشێوەی چوارگۆشە دەکشانەوە، قەڵغانەکانیان دەدایە بەر لەو دەسترێژانە و زۆر بە سەختی توانیان رووباری کارکاسۆس ببڕن. نیوەیان بریندار ببوون، لەم روداوەدا ئاگسیاسی ستیمفالی کە بەدرێژایی ماوەکە فونەشەڕی دەکرد، بریندار بوو. لەکۆتاییدا خۆیان دەرباز کرد بە ٢٠٠ یەخسیر و ماڵاتێکی زۆر بای قوربانی.

رۆژی دوەم زینۆفۆن قوربانیی کرد و بەشەو لەشکرەکەی بەرێگادا برد بەئومێدی ئەوەی کە تا بکرێ بەرەو لیدیا دوور بکەوێتەوە، کەچی لەسیداد وای دەزانی قوربانییەکەی زینۆفۆن بەو نیازەوە بووە تا هێرشی بکاتە سەر، بۆیەش لە جێگای خۆی دەرچوو و ئۆردوگای لە گوندەکانی دەوروبەری شارۆچکەی پارسینیۆس دانا. پیاوەکانی زینۆفۆن لەوێد تووشی بوون و بە هەموو ژن و منداڵ و ماڵەوە گرتیان. بەم پێیەش، نیشانە ئاسمانییەکانی یەکەم فاڵ راست دەرچوون.

ئەوجار گەڕانەوە بۆ پیرگامۆن، لێرە زینۆفۆن کۆمەڵێك دەسکەوتی هەبوو وای لێ بکات کە ستایشی خواوەند بکات. سپارتییەکان و جەنەراڵ و کاپتنەکان وێڕای هەموو سەربازەکان لەسەر ئەوە پێك هاتن کە بەشی گەورەی تالانەکان بدرێنە زینۆفۆن، ولاغ و رەشەولاغ و هەموو شتێك. جا ئێستا زینۆفۆن دەیتوانی کە هەرنەبێ چاکەی خەڵکی دیکە بداتەوە. ئەوجار تیبۆرن هات و رابەرایەتی لەشکرەکەی بەدەستەوە گرت و کردی بە بەشێك لە لەشکرێکی یۆنانیی گەورەتر و جەنگی جارِ دا دژبە تیزافەرنە و فەرناباز.

## ملکی زینۆفۆن لە رۆژانی دره‌نگدا

دواتر زینۆفۆن خەلاتێکی دەست کەوت کە بۆ ئەپۆلۆ تەرخان کرابوو، بەناوی خۆی و پرۆکسینۆسی برادەری کە لەگەڵ کلێرخۆس کوژرا، پێشکەشی کرد بە دارایی ئەتینا لە دەلفی. سەبارەت بە بەشی ئەرتەمیسی لەمنۆس، کە زینۆفۆن لە ئاسیا دەگەڕایەوە بەرەو بۆیۆتیا لەگەڵ ئاگەسیلاوس، بەشەکەی لەگەڵ میگابازۆس، کاهینی پەرستگای ئەرتەمیس، بەجێ هێشت چونکە باوەڕی وابوو گەشتەکە خەتەرە. داوای لە مێگابازۆس کرد کە ئەگەر بە سەلامەتی گەیشتەوە ماڵێ پارەکەی بداتەوە بەلام ئەگەر هەر شتێکی بەسەر هات دەبایە کارێك بکات کە دڵی خواوەندە مێیەکە[1] خۆش بکات و پارەکە بۆ وی تەرخان بکرێت. زینۆفۆن لیدی شاربەدەر کرابوو و سکیلوس لەنزیك ئۆلۆمپیا نیشتەجێ ببوو کەوا سپارتیەکان پێیان بەخشیبوو، مێگبازۆس هاتە ئۆلۆمپیا سەیری گەمەکان بکات، پارەکەشی هێنا.

کە پارەکە گەیشت، زینۆفۆن بەخێری خواوەندەکان ملکێکی کڕی لەجێگەکەیدا کە پێشبینیە ئاسمانیەکان بۆیان دیار خستبوو. رووبارێکی لێ بوو بەناوی سەلینوس بەنێو ملکەکەیدا دەڕۆیشت. لەلایەکی دیکەوە، رووبارێکی دیکە هەبوو بەناوی سەلینۆس بەبەر پەرستگای ئەرتەمیسدا دەڕۆیشت. هەردوك رووبار پڕبوون لە ماسی و قەوغە Shellfhish. لە ملکەکەی سکینوسدا راویش دەکرا وێڕای جۆرەها گەمە. پارەی لە دروستکردنی نوێژگایەك خەرج کرد، تەنانەت ١٠٪ ی دەرامەتی ملکەکەی کردە خێر. خەڵکی ناوچەکە، ژن و پیاوی شاری، وا راهاتبوون کە لە زەماوەندەکەدا بەشدار بن و خواوەندە مێیەکە نانی جۆ و شەرابی داڵێن دەکرد بۆ ئەوانەی کە رەشماڵیان هەڵ دەدا. هەروەها ئاژەڵەکانی قوربانی، تەنانەت ئاژەڵە راوکراوەکانیش، بەش دەکران. راوێکی زۆر دەست دەکەتن و کوڕەکەی زینۆفۆن و کوڕانی ناوچەکە بەزۆری راویان دەکرد بەتایبەتیش بۆ میهرجانەکە. بەراز و ئاژەڵی دیکە زۆر دەگیران و هەندێك لە ناوچە پیرۆزەکاندا هەندێکیش لە چیای فۆلۆی. ملکەکە لەسەر رێگای نێوان سپارتا

---

[1] goddess

و ئۆلۆمپیایە، دوو فەرسەخ لە پەرستگای زیۆس لە ئۆلۆمپیا دوورە، ناوچە پیرۆزەکەی کە بۆ ئەرتەمیس تەرخان کراوە مێرگ و دارستانێکە کە باشترین ژینگەیە بۆ بەراز و بزن ولاغ. هەروەها ئالیکی باشی لێیە بۆ بەشداربوانی میهرەجان، لەدەوری پەرستگاکەدا بێستانی میوە و داری لێیە بای هەموو وەرزەکان. پەرستگاکە نوسخەیەکی بچووکە لە پەرستگا مەزنەکەی ئەفسۆس، نیگارەکەش هەمان نیگاری ئەفسۆسە کەوا پەیکەرێکی زێرینی قوبرسییە.

ئەستونێك لە تەنیشت پەرستگاکە چەقێندراوە ئەمەی لەسەر نوسراوە

**ئەم زەویە بۆ خێری ئەرتەمیس تەرخان کراوە. ئەوی دەیبات دەبێ ساڵانە سەدا دەی پێشکەش بە ئەرتەمیس بکات و دەبێ پەرستگاکە بەباشی رابگرێت**

**هەرکەس کەمتەرخەمی بکات، خواەندەکان دەیبینن**

## کەسایەتیی کۆرووش[1]

مەرگی کۆرووش کۆتایی بە شەڕەکەی کوناکسا هێنا. لەپاش کۆرووشی مەزن، لەم کۆرووشە لە هەموو فارسەکان لێوەشاوەتر و شاسیتەتر بوو بۆ شاهایەتی، ئەمەش بەشایەدی تێکڕای ئەوانەی کە لەنزیکەوە ناسیبویان.

لە قۆناغە سەرەتاییەکانی ژیانیدا کە لەگەڵ برا و منداڵەکانی دیکە پەروەردە دەکرا، لە هەموویان باشتر بووە. منداڵی بنەماڵە فارسەکان هەموو لە سەرای شادا پەروەردە دەکرێن، ناهێڵن گوێ لە قسەی بەد رابگرن. ئەو منداڵانە کە دەیانبیست وا شا یەکێکی پاداشت کردووە یاخود یەکی بەدەر ناوە، لەوەڕا فێر دەبوون چۆن رابەرایەتی بکەن و چۆن پابەندی رابەرایەتیش بن. کۆرووش لەسەرادا بەوە ناسرا کەوا باشترین رەفتاری هەبووە. لەچاو وەلاشەکانی خۆی ئەو پتر گوێڕایەڵی گەورەکان دەبوو. هەروەها بەشێوەکی سەرنجراکیش حەزی لە سوارچاکی بووە و لەم بوارەدا توانایەکی گەورەی دیار خستووە. هەروەها لە هونرە جەنگییەکاندا، رمبازی و تیرەندازی، لەهەمووان پتر حەزی لە فێربوون و بەکارهێنای چەك دەکرد. ئینجا کە گەیشتۆتە تەمەنی راوکردن، لە بەرەنگاریی درندەکاندا لەهەمووان خوێنگەرمتر و بوێرتر بووە. جارێك مێیە ورچێك پەلاماری داوە و ئەویش لە ئەسپەکەی کەوتۆتە خوارێ، لەوساوە شوێنی زامەکان لەسەر لەشی مانەوە بەلام لەکۆتاییدا ورچەکەی کوشتبوو، و لەو کەسەی کە گەیشتە سەر کۆرووش بۆ ئەوەی رزگاری بکات گوتبووی بەڕاستی بەختی هەبووە.

کە بارکی ناردوویەتی بۆ هەرێمی لێوارە دەریاییەکان و بۆتە شارەوانی لیدیا و فریجیای مەزن و کەپەدۆکیا، و کاتێك ناوی جارِ دراوە بە فەرماندەی گشتیی هێزەکانی دەشتی کاستۆلۆس، زۆر پەرۆشی هەبوو کەوا لە هەر رێککەوتنێك و لەهەر کارێکی بەڕێوەبەرایەتیدا گوفتەکانی خۆی بەجێ بگەیێنێت. دەست و پیاوەندەکان و شارەکانی ژێر دەستی هەموو باوەڕیان پێ

---

[1] ئەم چاپتەرە لە ئەسڵدا لە دوای شەڕەکەی کوناکسا تۆمار کرابوو، بەڵام بۆ ئەوەی زینجیرەی بەسەرهاتەکان لە خوێنەر تێك نەچێت من خستمە دواوەی نووسینەکان. شایانی گوتنە کە لێرەدا رای زینۆفۆن بەرانبەر بە کەسایەتی کۆرووش دیار دەبێت.

دەکرد، دوژمنەکانیش کاتێك کە نامەیەکەیان لەگەڵدا مۆر دەکرد ئیتر لایان مسۆگەر دەبوو کەوا مەرجەکان جێبەجێ دەکرێن و زیان بە ناوچەکانیان ناگات. دەرەنجام، کە لەگەڵ تیزافەرنە تووشی شەڕ هات هەموو شارەکان پشتی کۆڕووشیان گرت تەنیا میلەتۆس نەبێت. میلەتۆس دەترسان کە رەنگە کۆڕووش پشتی ئاوارەکانی نێو میلەتۆس بەر نەدات چونکە بیستبوویان کۆڕووش لەو بەڵێنەی بەوان دابوو.

چاکە و خراپەی لەگەڵدا کرابایە ئەو بەلای چاکەدا دەیشکاندەوە، خەڵك قسەکەیان دووبارە دەکردەوە کە هەمیشە دوعای خواستووە بای ئەوە تەمەنی درێژ بێت بتوانێ چاکەی پیاوچاکان و خراپەی بەدەکاران بداتەوە. شتێکی ئاسایی بوو کە لەم زەمانەی خۆماندا[1] تاکە کەسێك بێت کەوا خەڵك و شارەکان حەز بکەن خۆیان و ماڵ و شارەکانیان بخەنە بەر دەستی. واش کەس ناتوانێ بڵێت ئەو هێشتویەتی پیاوکوژ و بەدرەفتارەکان سووکایەتی بەدەسەلاتی بکەن. بەپێچەوانەوە، سزاکانی یەکجار توند بوون، پیاو بەرێگادا دەرۆیشت کەسانێکی دەدیت وا دەستیان براوەتەوە یان کوێر کراون، ئەوە چونکە لەسایەی دەسەلاتی کۆڕووشدا یۆنانی و خەڵکی ناوچەیی وەکو یەك بوون، ئەگەر خراپەت نەکردبایە بۆت هەبوو بە ئازادی گەشتەکانی خۆت بۆ هەموو لایەك بەبێ ترس بکەیت.

بێگومان پێویست ناکا بگوترێت چ رێزێکی بۆ جەنگاوەرەکان دادەنا. لە یەکەم جەنگیدا دژبە پیسیدی و میسیەکاندا بەخۆی هەڵمەتی بردۆتە نێو ناوچەکانیان و ئەوانە شەڕی باشیان بۆ کردووە هەموی کردن بە فەرمانڕەوای ئەو ناوچە داگیرکراوانە، دواتر پاداشتی تری پێ بەخشیون تا بزانرێت کەوا ئازاکان هەمیشە لە ژیانێکی گەشدا دەبن و نامەردەکان مەگەر ببنە بەخسیر.

لەمەیدانی دادپەروەریدا مەبەستی سەرەکی ئەوە بووە وا بکات ئەوانەی پابەندی سیستەمەکە دەبن دەوڵەمەندتر بن لەوانەی کە دەیانەوێ بە شێوازێکی ناپەسندانە قازانج بکەن. بەم پێیە،

---

[1] تووممز ئێستا و پێش هەزاران ساڵ خەڵك هەر ئەم قسەیان دووبارە کردۆتەوە کە دەڵێ (ئەم زەمانەی خۆمان وەکو جاران نەماوە). لە راستیدا ئەمە جۆرێکە لە نۆستالجیا و رابردوو پەرستی و مردوو پەرستی کە دەبینن خەڵکی بێزار و بێئومێد هەمیشە ئەو قسانە دووبارە دەکەنەوە گوایە (جاران) زۆر باش بووە.

کۆرووش نەك هەر راستەو بووە بەلکو بۆی رەخساوە کەوا لەشکرێك خزمەتی بکات کە بەراستی لەشکر بوو. کاپتن و جەنەراڵەکانی کە لە دەریا دەپەڕینەوە بۆ ئەوەی ببنە بەکرێگراوی کۆرووش، دەیانزانی کەوا نەك هەر مووچەیەکی مانگانەیان دەست دەکەوێت و بەس، بەلکو چەندە خزمەتیان کردبایە هەندە پاداشتیان دەبوو. هەرکەس لە هەر جارێکدا ئەرکێکی ئەنجام دابێت، ئیشەکە بەبێ پاداشت بەسەر نەدەچوو. لێرە هەمیشە باشترین ئەفسەری بۆ رەخساوە کە باشترین کاریان بۆ ئەنجام داوە.

کە دەیدیت یەکێك لە بەرێوەبەرایەتیدا توانای هەیە و تەنیا لەسەر یاسا ناڕوات بەلکو رێبازی نەوژەن پێرەو دەکات بۆ ئەوەی بەرهەم و قازانج لە ناوچەکەیدا زیادتر بن، کەسانی ئەوها هەرگیز نەیدەگواستنەوە بۆ جێگەیەکی دیکە، بەلکو ئەرك و تواناکانی ئەو جۆرە کوسالەی زیاد دەکرد. بەمپێیەش بەرێوەبەرەکان بە دڵێکی خۆش و پڕ بە باوەڕەوە ئەرکەکانیان جێبەجێ دەکرد و دەرامەکەیان زۆرتر دەکرد. هیچیشیان لە کۆرووش نەدەشاردەوە تەنانەت لەوانەی بە ئاشکرایی دەوڵەمەند ببوون، سامانەکانیان لە کۆرووش نەدەشاردەوە و نهێنییەکانی دیکەی دەوڵەتیان بۆ کۆرووش ئاشکرا دەکرد دەربارەی ئەوانەی کە سامانەکانیان دەشاردەوە[1].

هەموو لەو باوەڕەدا بوون کەوا بەهانای برادەر و راستگۆیەکان دەهات. کۆرووش هەستی دەکرد کە پێویستی بە برادەری باش هەیە و لەبەرانبەردا هەمان شتی دەنواند، چاکە بە چاکە. باوەڕم وایە کەس هەندی کۆرووش دیاریی بۆ نەهاتووە و لەبەرانبەردا کەس هەندی لەو دەسکەوت و دیارییەکانی نەبەشیوەتەوە و، کەسیش ئەوها نرخی خەڵکی هەڵ نەسەنگاندووە. کە جل و زرێی جوانی بۆ دەهات بە دیاری، دەیگوت ئەوهەموو جلانە بەوی لەبەر ناکرێن، لێرە پێشکەش بە برادەرەکانی دەکردن. چاکە و پیاوەتییەکی زۆری کردووە و برادەرەکانی سەریان

---

[1] بە رای من جیاوازی سەرەکی لەنێوان فارس (فارسی ئەوسا) لەگەڵ تێکرای نەتەوە و دەوڵەتەکانی دیکەدا ئەوەبوو کە فەرقیان بە خەڵکی ئەم ناوچە و ئەو ناوچە نەدەکرد. تەنیا ئەوەیان رەچاو دەکرد کە بە زمانی دەوڵەت قسە بکەیت و پابەندی یاساکان بیت. ئەم رەوشتە لە هیچ نەتەوەیەکی جیهانی کۆندا بەدی نەکراوە تەنیا لە فارس و دواتر لە رۆم. رۆم لە فارسیش توندتر بوون بۆ لەتوێپەتکردنی گرێیە عەشایەرییەکان و پێوەندییە ناوچەییە تەسکەکان.

بەوە سوڕ دەما. ئەم خاڵەی کەمن لە هەموو شتێك بە گرینگتری دەزانم ئەوەیە کە کۆرووش دەیویست دڵی خەڵك شاد بکات. زۆربەی جار کە شەرابێکی باشی بۆ دەهات، گۆزەیەکی نیوە پری دەنارد بە نامەیەکەوە (لەمێژە کۆرووش توشی شەرابێکی ئەوها خۆش نەبوە، وا هەندێکی بۆ خۆت و خۆشەویستەکانتی نارد کە لەمڕۆ بیخۆنەوە) زۆر جاریش قاز و مراوی و نانی چاك بەدیاری دەینارد و بە نۆکەرەکانیشی دەگوت پێیان بڵێن: کۆرووش چێژی لەمانە وەرگرتووە، حەز دەکا کە ئێوەش بیچێژن. هەمان شت سەبارەت بە ئالیکی ولاغان دەکرا. هەندێك جار ئالیك کەم دەبوو، کۆرووش ئالیکی بۆ ولاغی برادەرەکانی دەنارد تاکو لە گەڕاندا برسی نەبن.

کە بەلیشی رەسمی بۆ لایەك دەچوو ، زۆر مەبەستی بوو برادەرەکانی لەگەڵی بچن تاکو بە ئاشکرایی تێکەڵ بە گفتوگۆ و پرس و راکانی ببن و خەڵکە بزانن رێز لە چ جۆرە پیاوێك دەگرێت. بەرای خۆم و بەگوێرەی ئەم قسانەی کە بیستومن، کەس وەکو کۆرووش لە یۆنانی و بێگانەشدا هەندە خۆشەویست نەبوە، بەڵگە بەو بەڵگەی کە کەس پشتی بەر نەدا ئۆرۆنتا نەبێت. ئەمەش بەهۆی ئەوە بوو کە ئۆرۆنتا برادەری شا بوو دەنا ژمارەیەکی زۆرتر رێزەکانی شایان بەجێ هێشتوە و رەگەڵ کۆرووش کەوتون. روداوەکەی مەرگیشی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا نەك هەر ئازا بووە بەڵکو پیاوی دڵسۆز و برادەری جێ باوەڕی هەبوە کە خۆیان بۆ وی تەرخان کردووە چونکە تێکرای برادەر و هاتوونشینەکانی لەگەڵی کوژران تەنیا ئاریا نەبێت کەوا لەسەر باڵی چەپی هێزە سوارەکان بوو، کە بەمەرگی کۆرووشی زالیوە یەکسەر هەڵاتوە.

## تێبینیەکانی وەرگێڕ:

ئەمەی پێشوو دەقی نووسینەکانی زینۆفۆن بوون. تا ئێستا واماندەزانی سوپاسالارێکی مەزن بووە و تەنانەت گۆرانیەکی هونەرمەند زەکەریا هەیە دەڵێ: چ ئەسکەندەر چ زەینەفوون،، هتد. ئەمە دیاری دەخات کە زۆر کورد وا دەزانن زینۆفۆن هاوتای ئەسکەندەر بووە، کەچی لە راستیدا گەنجێکی شارستانی بووە پڕ لە ویست و ئارەزوو. لە لایەکەوە دەیویست لەپڕ ببێتە کوڕ و، لە لایەکی دیکەوە دەیویست گرفتە ناوخۆییەکانی وڵاتەکەی چارە بکات.

ئەم تۆمارە دەستنووسی مرۆڤێکە کەوا پێش ٢٤٠٠ ساڵ هەمان کێشە و مەراقەکانی کوردی ئەمڕۆی هەبووە. تەنانەت هەوڵم داوە بکرێت بە شانۆگەریەکی کوردی (فرە لەهجە). کەسایەتیەکانی سپارتی بە بادینی قسە بکەن، بۆیۆتی بە هەولێری، ئەرکادی بە موکریانی، ئاخەیی بە گەرمیانی و لوڕی، ئینجا خودی زینۆفۆن بە لەهجەی سلێمانی. گەر دەپرسن بۆچی سلێمانی؟ لە وەڵامدا دەڵێم لەگەر تا ئێستا خوێنەر هەستی بەم پێکچوونە نەکردبێت، ئەدی کەی هەستی پێ دەکات؟

ئەگەر ئەم شانۆگەریە بێتە دی، باوەڕم وایە دەروازەیەکی نوێ بۆ شانۆگەریی کوردی دەکرێتەوە و، قوتابخانەیەك بۆ تێگەیشتنی مێژوو واڵا دەبێت کە ڕەنگە ببێتە هۆی ئەوەی خودی ئەورووپایەکان تەفسیری مێژووی خۆیان لە ئێمەوە فێر بن. بیرم لەوە کردەوە کە زینۆفۆن بە دوو جۆر دیار بخرێت، زینۆفۆنێکی پیر کە یادگاریەکانی نووسیوەتەوە و زینۆفۆنێکی گەنج کە تووشی ئەم گەشتە بووە. هەروەها بیرم لە هونەرمەندی مەزن مامۆستا احمد سالار کردەوە (تەنانەت بە خزمەتی گەیشتم و بیرۆکەکەم ئاراستەی جەنابی کرد) بۆ کەسایەتی زینۆفۆن بە پیری. وەك لەوەی زینۆفۆن لە ماڵی خۆی دانیشبێت و بەسەرهاتەکان بگێڕێتەوە. لێرە با مامۆستا احمد سالار بهێنینە بەر چاومان لەگەر بە هەمان شێوازی شانۆگەریەکەی (خولە چەخاخە) دابنیشێت و قسەی (قەبە) بکات گوایە لە گەنجیدا ئەوها و ئەوهای کردووە، کەچی لە دیمەنەکانی دیکەدا زینۆفۆنێکی گەنج بێت و ڕووداوە ڕاستیەکان پیشان بدات! باوەڕم وایە

شانۆگەریەکی زێدە باش دەردەچێت کە نەك هەر دەنگ دەداتەوە، بەڵکو شیرینی و تاڵیەکانی ئەم شانۆگەریە نەقشێك لە یادی هەموو بینەران دەکێشن، بە تایبەتی بینەری کورد.

## من و زینۆفۆن

دەربارەی وەرگێرانی ئەم تۆمارەی زینۆفۆن، دەمەوێ بڵێم وەی چەندە قسەکانی درێژ کردۆتەوە! لەکاتی وەرگێراندا هەر کە دەیگوت "زینۆفۆن ئەم قسانەی کرد" یەکسەر هەناسەم سوار دەبوو چونکە دەمزانی ئێستا دەست بە گوتارێك دەکات دە هەندی پێویست و گومان نەبوو کە زۆری پێوە دەنێت. بۆیەش وا دەڵێم چونکە زینۆفۆن لە شوێنی ئەوهادا گوتاری داوە عەقڵ نایبڕێت. بۆنموونە قسەی دوور و درێژی بۆ کۆمەڵە جەنەراڵێك کردووە یان بۆ ئاغایەکی وەکو سیووتیس، ئەوانە کوا خولقیان هەیە گوێ لەو هەموو قسانە بگرن لە سەربازێکی گەنج کە مێوانی پرۆکسینۆس بوو، پرۆکسینۆسیش مردبوو! بۆیە باوەڕم وایە دواتر کە زینۆفۆن لە ماڵی خۆی دانیشتووە بۆ تۆمارکردنی بەسەرهاتەکان، جڵەوی بۆ قەڵەمەکەی شل کردووە. زۆر جار وا لە بەرانبەر دوژمن وەستاون و ئێستا نا ئێستا شەڕ دەست پێدەکات، کەچی ئەو وای تۆمار کردووە گوایە گوتارێکی دووردرێژی بۆ سەرباز و جەنەراڵەکان خوێندۆتەوە. یان کە دەیگوت (پێویستە هەر ئێستا ئەوها و ئەوها بکەین و با جەنەراڵەکان ئەوها و ئەوها بکەن و ئەوەی بەم قسە رازیە با دەستی بڵند بکات) جا گوایە هەموویان دەستیان بڵند دەکرد، ئەمەش بەمەرجێك کەوا زینۆفۆن لەتینی بوو و زۆربەی سەربازەکان پیلۆپۆنیزی و بۆیۆتی بوون. ئەوانە لە کاتی خۆیدا زۆر هەستیار بوون بەرانبەر بە قسە و پەڵلار و زێدەڕۆیی گەنجی لەتینی. کەواتە ئایا ئەمە راستە؟

ڕەنگە لێرەدا خوێنەر بڵێت: کەواتە تۆمارەکەی زینۆفۆن بێ کەڵکە چونکە پڕە لە درۆ. من دەڵێم نەخێر، یەك لەبارەی خۆمەوە کەڵك و سوودێکی گەورەم لێ وەرگرت، هەم بۆ تێگەیشتنی مێژوو، هەم بۆ شیتەڵکردنی کێشەکانی ناوەخۆی کورد. تۆمارەکە وەکو بوخچەیەکی نەکراوە بوو وەردە وردە شتی سەیرم دەدۆزیەوە و قۆناغ بە قۆناغ لەدەرووونی

زینۆفۆن و هاوڕێکانی دەگەیشتم وەك بڵێی لەگەڵیان دەژیام. بۆ نموونە کە دەیگوت: فلان عاشقی ئافرەتێك بوو، ئەوەی دیکە عاشقی کوڕێك بوو. هۆێکم دەگرت و دەمگوت: هەی! خۆ ئەوانە مێبازی و نێربازییان بە یەك شت زانیوە. یان کە زینۆفۆن دەڵێت: مەڕ و مانگا و بەخسیرەکانمان ئەوها لێ کرد. دەمکوت دیارە ئەوانە بەخسیر و مانگایەکیان وەکو یەك سەیر کردووە؟! بەلام لە هەمووی گرینگتر مەسەلەی شار و ناوچەکانیان بوو. ئەی هاوار ئەوانە چ شارپەرستێك بوونە و چ تێکە و لێکەیەکیان لەدڵدا حەشار دابوو! ئەم قسە تەنیا هی من نین بەلکو ڕێکس وانەریش، ئەوەی کە تۆمارەکەی وەرگێڕاوە بۆ ئینگلیزی، ئەویش هەستێکی تەواوی بەم ڕاستیانە کردبوو. خوێنەران دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ پێشەکیەکەی وەرگێڕ لە سەرەتای کتێبەکەدا.

شیتەڵکردنی قسەکانی زینۆفۆن وەك ئەوەیە گریمان تۆ بە گەشتیاری بچی بۆ شارێکی بێگانە و تووشی منداڵێکی زۆرگۆ بی، منداڵەکەش بە ساکاری دەست بە قسە بکات وبڵێت: دوێنێ چووین بۆ سەیران. دایکم ئایسکرمی بۆ من نەکڕی، گوتی ئایسکریم گرانە. دواتر پیاوێك لە ئاوەکەدا خنکا و بوو بە هەرا و پۆلیس هاتن. دایکم لە باوکم تووڕە بوو گوتی نەدەبوو لە نزیك ئاوەکە دابنیشن.

لە قسەی منداڵێکی ئەوهاوە دەتوانین کۆمەڵێك ڕاستیی هەڵێنجین، وەکو:

- بەگوێرەی قسەکان دیار دەبێت کە لەو شارەدا ژن باڵادەستن چونکە دایکەکە لە باوکەکە تووڕە بووە و هەر خۆی بڕیاری کڕین و نەکڕینی ئایسکرم دەدات.
- دیارە ڕووبارێك یان گۆمە ئاوێك لەو شارە هەیە کە بەکەڵکی سەیران دێت،،، هتد.

قسەکانی زینۆفۆنیش بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوو خەریکە بڵێم هەمان شتن چونکە زینۆفۆن، ماشەڵڵا، هەتا پێی کراوە قسە و هەست و وەسفی تۆمار کردووە. پاشان زینۆفۆن منداڵێکی ساکار نەبووە، بەڵکو یەکێك بووە لە خوێندکارەکانی سۆکراتی فەیلەسووف. پیاوێکی خاوەن باوەڕی ئەخلاقی و فەلسەفی بووە و دیاریشە کە لەگەڵ مەراق و حەز و ئارەزووەکانی خۆیدا کەوتۆتە گرفت بەهۆی ئەوەی کە ڕەنگە هەندێك نموونەپەرست (مثالي- Perfectionist) بووبێت. وە ئەگەر بەهۆی ساکارییەوە بووبێت یان بەهۆی ڕاستگۆیی، زینۆفۆن نەیشاردۆتەوە کە

حەزی لە پایە و دەسەلات بووە و ئینجا هەر وەکو ریکس وارنەر گوتی (لە ناخدا ئەتینیەکی تۆخ بووە) چونکە داخی ئەوە بوو بیسەلمێنێت (ئەتینا) رابەرایەتیان لێ دەوەشێتەوە نەك سپارتا.

## زینۆفۆن و کاردۆخیەکان:

زینۆفۆن هەندێك تیشکی خستۆتە سەر رابردووی نەزانراوی ولاتەکەمان. بەلام بەداخەوە راستیەکە بەو جۆرە نەبوون کە بیستبوومان. وەك چۆن بە درۆ دەگوترا (هەولێری هۆلاکۆی بەزێن)، ناوی کاردۆخیەکانیش بەهەمان شێوەی (فوو دراو) باس دەکران.

سەبارەت بە رەچەلەکمان، گەنجەکان وادەزانن کورد (نەوەی میدیا و کاردۆخیەکانە) و باپیرەکانمان (زەردەشتی و ئیزدی بوون) وەك بلێی زەردەشتیانی و ئیزدیاتی یەك شت بوونە. بەلام لێرە دیار دەبێت کە میدی و کاردۆخی دوو نەتەوەی جودا (تەنانەت دوژمنیش بوون) هەم وەکو دین هەم وەکو رەگەز. میدیەکان بەهەمووی ٢٠٠ سالێك بوو هاتبوونە کوردستان و هاوپەیمانی فارس بوون و لەسەر دینێکی تەوحیدی بوون (زەردەشتی). هەروەها لە دەشتاییەکان دەژیان و تێکەل بە سوپا و یاسا و دەولەت و شارستانەتی ببوون. کەچی کاردۆخییەکان خۆیان لە چیاکان حەشار دابوو دوور لە چەرخی مێژوو و پێشکەوتن. هەروەها دیارە دژایەتی هەموو بێگانەیەکیان کردووە (دۆست و دوژمن، وێرای دوژمنی دوژمن). و لە مەیدانی سیاسیدا هیچ جۆرێك زانایی و شارەزاییان دەر نەخستووە. من بە دووری نازانم کاردۆخی تەوتەمی بووبن یان تیرەپەرست (واتە هەر عەشیرەت و بنەمالەیەك باپیرەگەورەی خۆیان کردووە بە لایکۆزێك و پەرستوویانە). راستە کە ئەوان دڕندە نەبوون چونکە زینۆفۆن باسی کووپە شەراب و قەنەفە و شمەکی نێومالیان دەکات دەلێ شتێکی پێشکەوتوو بوون، بەلام هەلسوکەوتیان بێئەندازە داخراو و کەمتێکەل بوو.

لینجا مەسەلەی ئەو لەسیرە دێت کە تا مردن یەك قسەی نەکرد. حەز دەکەم خۆمان تووشی مازۆکیزم Masochism و خەمپەرستی نەکەین و سنوورێك بۆ رەوشتی گریئۆکی و لووردلورر دابنێین چونکە من باوەڕێکی تەواوم بەم شیعرەی بێکەس هەیە کە دەلێت:

## کاکە خوا ئیشی نابەجێ ناکا — تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا

هەر خودا دەیزانێت کادۆخی بەرانبەر یەکتر چۆن بوونە. ئێمە یۆنانیەکانمان دیت چۆن کە بێگانە نەدەمان یەکسەر خۆبەخۆیی پەیدا دەبۆوە، چ جا کاردۆخیەکان؟. ئەم بێدەنگیەی لەو ئەسیرەی کە تا مردن یەك نوقڵەی نەهات، ئەمە نیشانەی ئەوەیە کەوا کاردۆخیەکان کێشەیەکی دەروونی و کۆمەڵایەتیی قووڵیان هەبووە. ئەمە گومانێك لای من دروست دەکات کە وێڕای نەبوونی توانا بۆ دانوستان و تێکەڵاوی، ڕەنگە کاردۆخی یەکجار خۆبەخۆ بووبن و لە زمانی یەکتر ترسابن. واتە کولتوورێکی داخراویان هەبووە و هەرکامیان هەر پێوەندیەکی هەبایە لەگەڵ هەر بێگانەیەك یەکسەر بە (خائن) لەقەڵەم دەدرا. بەڵگە بە بەڵگەی کەوا ئێستاش تەخوینی بە هەق و ناهەق لەنێو کورددا باوە و باوەڕ ناکەم یەك ناوداری کورد (ئەدیب، سیاسی، شاعیر، سەرکردە، هونەرمەند،،، هتد) تووشی نەبووبێت.

ئەگەر مەسەلە توانای دەستوەشاندنە، خۆ لەم تۆمارەدا خەڵکی شەرکەر و دەستوەشێنتر هەبوون. بۆغوونە، سوارچاکە خالیبەکانی کە سەری یۆنانیەکانیان دەپەڕاند و سەرەکانیان لەسەر ڕمبەکان هەڵدەواسی و بەپێش یۆنانیەکاندا دەهاتن سروودی جەنگیان دەخوێند. مەبەستم لەم قسانە ئەوەیە کە (نیسك نەکرێت بە گیسك) و دەبێ دان بەمە ڕاستیە بنێین کە کاردۆخیەکان هەڵوێستێکی زۆر دواکەوتوویان نواند. لەوان ئەگەرچی دوژمنی فارس بوون و یۆنانیەکان پێیان گوتن کە لەوانیش دوژمنی فارسن، واش بەهیچ شێوە گفتوگۆیان نەکرد و هەر لێدە و لێدە.

ئەم ڕەوشتە بە ڕای من دەدرێتەوە پاڵ نەخۆشیەکی کۆمەڵایەتی پێی دەگوترێت (زینۆفۆبیا) واتە (ترسی بێگانە- نەفرەتکردن لە هەموو بێگانەیەك) تا ئێستاش بەزەقی لە ڕەوشتماندا ماوە. باشترین بەڵگە ئەوەیە ئەگەر سەیری خۆمان بکەین لە سەدەی بیست و یەکدا، ئەمڕۆ شارێکی وەك هەولێر هەندە گەورە بووە و گەشاوەتەوە و بەرەو ئەوە دەڕوات کە ببێتە میترۆپۆلیسێکی گرینگ بۆ عیراق و تێکڕای خاوەرمیانە. میترۆپۆلیسیش واتە شاری فرە ڕەگەز و ئاواڵە کە بۆ بازرگانی و بۆ ژیان ژنهێنان و بۆ تێکەڵاوی هەموو کەسێك دەست بدات، واش هەر جۆرێك دوورەپەرێزی و کەمتێکەڵی و شەرمێکمان تێدایە وەك بڵێی هێشتا لە ئەشکەوت و دۆڵە دابڕاوەکانی کاردۆخیەکان پەروەردە کراوین!

من ئێستا لە گەڕەکێکی نوێی هەولێردا دەژیم و هەندێك مەرحەبام لەگەڵ هاوسێکانم هەیە (تەنیا پیاوەکان). بەڵام خاڵی سەرەکی ئافرەتە، ئەوانە خەریکە بڵێم کەس هاموشۆی کەس ناکات، تەنانەت بەحاڵ مەرحەبای یەکتر دەکەن، تەنیا خزمی خۆیان و بەس. وانەبێ بڵێی ژنە دارتاشێك لەگەڵ ژنەدارتاشێکی دیکە هاونشین بن. نەخێر، ئەمڕۆ سەکۆی تێکەڵاویان بە رادەی سەرەکی لەگەڵ خزمی نزیکە، ئینجا خزمی دوور و ناسیار. ئەم راستیە بای هەندەیە بیسەلمێنێت کە ئێمەی کورد هێشتا نەگەیشتووینە ئاستێکی شارستانی، چ جا ئاستێکی نیشتمانی یاخود (ئوممەی وەکو مارکسیەکان دەیڕازێننەوە)؟

باشە ئایا ئەم جۆرە ئافرەتە کە دەبێتە فەرمانبەر یان پەرلەمانتار و وەزیر، ئایا چ جۆرێك واستەکاری و خزمخزمێنە دەنوێنێت؟ مەگەر بڵێم (یا سەتتار). یان ئەگەر مێردەکەی بوو بە بەڕێوەبەر، ئەوسا چۆن جەرگی دەکۆڵێت بۆ پارە و زێڕ و بۆ دامەزراندنی هەموو خزمەکانی خۆی، و یا رەبێی هەموو کوردستان کاول دەبوو. سەیرم پێ دێت کە لایەنگرانی مافی ئافرەت باسی هەموو شتێك دەکەن تەنیا باسی ئەوە ناکەن کە ژن و بەتایبەتی (ژنە مەنسوول؟!) چ رۆڵێکیان هەیە لە گەندەڵیدا؟ ئێستا لە وڵاتە عەرەبیەکاندا هەرایە لەسەر سەرۆك و بەرپرسە کۆنەکان، بەڵام کەم کەس باسی ژنەکانیان دەکات کە چ گەندەڵیەکیان ناوەتەوە. جا سەبارەت بە کورد و کوردستان، ئەگەر لە بنج و بناوانی گەندەڵی بکۆڵینەوە دەبینین (زینۆفۆبیا) و (خزمپەرستی) لە بنەوپاڵ زۆربەی دەردەکانی کوردی ئەمڕۆ و کاردۆخیەکانی ئەوسا بوون، لەم دوو دەردەش بە رادەی سەرەکی لەنێو ئافرەتاندا تەشەنە دەکات.

لە کۆمەڵناسیدا یاسایەکی زۆر ئاشکرا هەیە دەڵێ نەتەوەکانی دارستانە چڕەکان (وەکو ناوچەکانی ئەمەزۆن و غینیا و دارستانەکانی ئەفریقیا) ئەوانە لە هەموو کەسێك دابڕاوتر و کەمتێکەڵاوترن، ئینجا خەڵکی شاخ دێن کە لەچاو دارستانە چڕەکان باشترن، ئەوجار خەڵکی دەشت لە خەڵکی شاخ باشترن، لە کۆتاییدا خەڵکی بەندەر و سەردەریاکان دێن کە بە رواڵەت لە هەموان کراوەترن. جا ئێمەی کورد وەکو نەتەوەیەکی کە بە رەچەڵەك شاخاوین، تەنیا یەك هەنگاو لەپێش کۆمەڵگا داخراوەکانی دارستانە چڕەکان داێین. ئاگامان لەخۆ نیە کە ترس و نەفرەت و بێگانەبەدەری تێکەڵ بە خوێنمان بووە، کەچی وادەزانین (جیهان خۆی وایە). نەخێر

برام، خوشکم، جیهان وا نیە و لەباتی ئەوەی رۆڵەکانمان لەم خاڵانە وریا بکەینەوە دەچین پتر (شەحنیان دەکەین) بە بیردۆزی موئامەرات و (ئای هەیش، بەس ئێمە بەختمان نیە) و (کاردۆخیەکان هەموو پاڵەوان بوون بەڵام بەختمان نیە). برام، بەختی چی و پاڵەوانی چی و ئەو کاردۆخیانە بۆچی یەك قسەیان لەگەڵ یۆنانیەکان نەکرد؟ بۆچی دوژمنایەتیان لەگەڵ هەموو دەوروبەر هەبوو؟ لەگەڵ میدیەکانی ئەو دەشتە و لەگەڵ شای فارس و لەگەڵ ئەرمەنەکانی باکوور و لەگەڵ کەون کائینات.

هەندێك نەتەوە هەبوون سەدا سەد بە پێچەوانەی کاردۆخیەکان رەفتاریان لەگەڵ یۆنانیەکان کرد. بۆغوونە لە میدیا (باکووری ناوچەی بەغدا) خەڵك بەغار بۆیان هاتن، پەنیر و گەغیان بە یۆنانیەکان فرۆشت و کەسیش بەشەڕ نەهات. یاخود گوندەکەی ئەرمەنستانی خۆرئاوا. ئافرەتەکان لەوێدا بەبێ هات و هاوار قسەیان لەگەڵ خیریسۆفۆس کرد. هەروەها لە هەندێك ناوچەی دیکەدا خەڵکەکە شارەزای سیاسەت بوون و یۆنانییەکانیان بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەکار هێنا، خۆراکیان پێشکەش کردن و لەبەرانبەردا شەڕیان پێ کردن و دوژمنی خۆیان پێ بەزاندن. کەواتە بۆچی کاردۆخی ئەوهایان نەکرد؟

مەبەستم لەم قسانە ئەوەیە کە گەنج کورد ئەمڕۆ دادەنیشن ئاخ و ئۆف هەڵدەکێشن گوایە (ئاخ ئەگەر شیخ محمود تۆقەی لەگەڵ کابرای ئینگلیز کردبایە) و (ئاخ ئەگەر پەیمانی سیڤەر بەردوام بایە) و (ئاخ ئەگەر کوردیش کتێبێکی هەبایە وەکو قورئان) وهتد. برام، ئەم قسانە هەموو درۆن و ئیتر بەسە و دەبێ دان بنێین کە تاوانەکە هی خۆمانە. ئێمە دەردە شاخمان هەیە، زینۆفۆبیا و خزمپەرستی، ئینجا کە تۆزێك پێشدەکوین و دەبین بە شارستانی ئەوسا پیسترین دەرد لەنێومان هەڵدەداتەوە، دەردی شارپەرستی، ئەو دەردەی کە زینۆفۆن و هەموو هاورێکانی تووشی بوون.

## شارپەرستی

لەم تۆمارەدا دیتمان چۆن هەزاران گەنجی یۆنانیی هەر جارە تاقمێك دژی تاقمێك دەوەستان. لە قسە و بیانگەیان کەم نەبوو، بەلاّم لەناخدا بەردی مەحەك بریتی بوو لە (شارەکەم). واتە شار گرینگتر بوو لە ولاّت. بۆ نموونە سپارتیەکان، کە ئەوسا بالاّدەست بوون، دەبینین لە دەسەلاّتی سپارتا بەولاوە بەحاڵ بیریان لە یۆنانیەکانی دیکە دەکردەوە. بەوەش نیە کەوا لە نووسینەکانی زینۆفۆندا ئەتینی بە دڵسۆزتر دیار خراون بۆ یۆنان چونکە پێش لەم قۆناغە مێژوویە بە چەند ساڵێك ئەتینییەکان بالاّدەست بوون. جا ئەو نەفرەت و سووکایەتی و لووتبەرزیەی کە ئەتینی نواندیان بەرانبەر شارەکانی دیکە شتێك بێوێنە بوو، هەر ئەمەش بوو پشتی شکاندن و وای کرد زۆربەی شارەکانی یۆنان (کۆرەنت و تیبە و سیراکۆزا وهتد) بەگژ ئەتینادا بچنەوە. واتە کەس لەکەس باشتر نەبووە.

بەڕای من کوردی ئەمڕۆ و یۆنانیانیەکانی سەردەمی زینۆفۆن لە ناوەڕۆکدا یەك حالەتی سۆسیۆپۆلیتیکیان هەیە، تەنانەت ئەو جەنگەی نێوان ئەتینا و سپارتا و دووبەرەکیەکە بەگشتی نوسخەیەك بووە لەم دووبەرەکیەی کوردستانی عێراق. کۆمێنتەرەکانی کورد کێشەی ناوەخۆمان دەدەنەوە پاڵ (چینایەتی) و (رابەرەکان) و ئەو قسانە. باشە برام، ئەوەتا سەرکردەکان وەك شەمێ و روون لەگەڵ یەك تەبان کەچی هەر رۆژە کۆمەڵە گەنجێك (لە شارێك) قیت دەبنەوە دژ بە مەرکەزییەت و دژبە یەکریزی.

گرینگیی یەکریزی لەم تۆمارەدا زۆر بە زەقی پێشان درا. وەك دیتمان ئەو خەڵکەی کە پابەندی یەك رابەرایەتی دەبوون ئەوانە سەردەکەوتن (فارس پێش هەموو کەسێك). بەداخەوە ئەمڕۆ تێگەشتنمان لەم بوارەدا شتێکی زۆر زۆر نەگونجاو و نا بەجێ یە. زار بەشدەکەینەوە دەڵێین (حوکمەتەکانی ئەورووپا ئەوها دەکەن) بەلاّم کەس نالێت (هاوولاّتیەکانی ئەورووپا چ دەکەن و بۆ ولاّتی خۆیان). وادەزانین رابەرەکان دەبێ وەك خودایەکی بێ هەڵە و بێ هەست و نەست بن، جا بەبۆنەی ئەوەی کەوا ئەم شتە تەنیا لە مەلایکەتاندا دێتە دی، ئیتر بەکەس رازی نین و بووینەتە نەتەوەیەکی مردوو پەرست. سەرگوزەشتی ئەم بەکرێگیراوە یۆنانیانە دیاری

خست کە رابەرایەتی شتێکە من و تۆ دروستی دەکەین و نەتەوەی سەرکەوتوو ئەو نەتەوە نیە کە هەموو پاشا و فەیلەسووف بن (وەکو یۆنانیەکان) بەڵکو ئەو نەتەوانەن کە خۆ بە سەرباز دەزانن (وەکو فارسەکان).

## شەڕ و مەیدان

زینۆفۆن توانایەکی سەیری هەبووە لە وەسفی ڕووداوەکان و لە شیتەڵکردنی کەسایەتی خەڵك و تۆمارکردنی شەڕەکاندا. جا بە وەسفی شەڕەکەی کوناکسا دەتوانین تێبگەین چۆن ئەسکەندەری گەورە (پاش هەفتا ساڵێك لەم بەسەرهاتە) فارسی بەزاند و جیهانی داگیر کرد؟

وادیارە هێزەکانی هۆپلیت کاتێك کە ریز دەبوون و سروودی پایانیان دەخوێند و نەعرەت و هاواری شەڕیان بەرز دەکردەوە و، کاتێك بە یەك هەنگاو پێشڕەوییان دەکرد، ئەوانە بەچەشنی بولدۆزەر بوون کە هیچ هێزێك لە ڕوویاندا خۆی ڕانەدەگرت. بە هەسپایی دەڕۆیشتن بەڵام بەبێ ڕاوەستان. ئەو سیستەمە جەنگیە لە سپارتا گەلاڵە کرابوو بەڵام دواتر فیلیپی مەکەدۆنی، باوکی ئەسکەندەر، پەرەی بەو سیستەمە دا و تیپی پیادەی مەکەدۆنی پێك هێنا. ئەمانەش لە مێژوودا بەوە ناسران کە هەمان سیستەمی سپارتایان پێڕەو دەکرد بەڵام بە ڕمبی درێژتر و ڕیزی چڕتر. ئیتر ئەو سیستەمە هەرگیز شکستی نەدیت تا ٢٧٧پ.ز کە سیستەمی تازە پێگەیشتووی ڕۆمانی بەسەریدا زاڵ بوو. ڕۆم پشتیان بە ڕمبی درێژ نەبەست بەڵکو پشتیان بە ڕاددەی پابەندی سەربازەکانیان دەبەست (دواتر باسیان دەکەین).

خاڵی دووەم دەرباری سیستەمی مەیدان، وادیارە شەڕی ئەوسا وەکو فیلمەکان نەبوون گوایە لەشکرەکان پێك وەردەبوون بە قەسابخانە یەکتریان لەت و پەت دەکرد. نەخێر، بردنەوەی شەڕ بەگوێرەی تێکگەیشتن و هەماهەنگی سەربازەکان بوو. ئیتر کام لا زووتر ورەی بەردابایە یان ڕیزەکانی بەجێ هێشتبایە بەدوا دەستکەوتێکدا، ئەم لایەنە زووتر تووشی پەرتبوون دەبوون و دەشکان. ئەوسا لایەنی (ڕێکتر) ڕاویان دەنان و یەك بەیەك قەلاچۆیان دەکردن. جا نازانم ئایا ئێمەی کورد لە بەرەنگارییەکی ئەوها لە دەشتێکی ئاوالەدا تا چەند خولەك خۆمان ڕادەگرین؟

ئێمە ئەگەر شەڕمان پێ کرابێت، بە چەشنی کاردۆخییەکان، تەنیا بە (لێدە و هەڵێ) کردوومانە و زوو گوتوومانە (هەڵێ هات). ئەم قسە دەکەم تا بزانن کە (سوپاپەروەری) شتێکە هێشتا ئەو رەگەی نیە لە کوردەواریدا. پاشان خاڵی هەرەگرینگ لە هەر سیستەمی سەربازیدا ئەوەیە کە سەرباز (سەر بە سوپا بێت) نەك سەر بە (خزم و ئامۆزا، یان هاوشار، یان هاو ئایدیۆلۆجیا) بێت. هەر ئەمشە هێڵی جوداکار دروست دەکات لەنێوان (سوپا) و (میلیشیا) دا. نیز ئەو کەسەی کە لەوە دەکۆڵێتەوە ئایا کورد چەکداری نیزامیی هەیە یان میلیشیا؟ پێی دەڵێم (ئەمە عەرز و ئەمە گەز).

## شار و هۆز

زینۆفۆن زۆر باسی سیوروتیسی کرد. جا خوێنەرێکی وردبین دەتوانێ هەست جیاوازی لەنێوان دوو مرۆڤدا بکات. یەکەم، دەماری هۆز و خزمپەرستی کە لە سیوروتیسدا بەرجەستە ببوو لەچاو زینۆفۆنێکی کە دانی بە خزمایەتی نەدەنا بەڵکو (شارەکەی) پێش هەموو شتێك دەهات. شایانی گوتنە کە کەسایەتی فیلیپی مەکەدۆنی (باوکی ئەسکەندەر) بە سیوروتیس دەچوو چونکە هەردووکیان ئاغا بوون و هەردووکیان لەو عەشایەرانە بوون کە یۆنانی بە چاوێکی نزم سەیریان دەکردن، بەڵام هەردووکیان تێکەڵاویەکی توندیان لەگەڵ یۆنانیەکان هەبوو و هەردووکیان داخدار بوون. سیوروتیس داخداری عەشایەرەکانی دیکەی نەتەوەکەی خۆی بوو کەوا لەکاتی خۆیدا باوکیان کوشتبوو، کەچی فیلیپی مەکەدۆنی، وێڕای تۆڵەی عەشایەری، داخداری خودی یۆنانیەکان بوو کەوا لە سەردەمی منداڵیدا ۱۰ ساڵی رەبەق ئەسیری یۆنانیەکان ببوو. جا دیارە فیلیپ لە تاکتیك و فێڵەکانی یۆنانیەکان گەیشتبوو، هەروەها شارەزای دەمارەکانیان ببوو کە چەند رقیان لە یەکتر دەبێوە و هەرکەس بە شارەکەی خۆی دەنازی. لە سەرەتادا توانی عەشایەر مەکەدۆنیەکان یەك بخات (وەك ئەوەی کە سیوروتیس کردی) ئینجا دەستی بە داگیرکردنی شارە یۆنانیەکان کرد.

شایانی گوتنە کە چەند ساڵێك پاش ئەم ڕووداوەی زینۆفۆن سپارتا بەدەست تیبە (پایتەختی بۆیۆتیا) بەزی. ئیتر کە سەردەمی فیلیپ داهات سپارتا ئەو سامە گەورەی نەمابوو بەڵکو تیبە باڵادەست ببوو، تیبەش لە ئەتینا و سپارتا باشتر نەبوو. ئیتر یۆنان بوو بە پارویکی ئاسان بۆ عەشایەرە مەکەدۆنیەکان. گەنجی یۆنانیش یان ئەوەتا دەبوون بە چەکداری بەکرێگراوی (وەکو هاوڕێکانی زینۆفۆن) و یان ئەوەتا خەریکی دەمەقاڵێ و تەفسیری فەلسەفی دەبوون (بە چەشنی زینۆفۆن). گەنجانی گریك بەشێوەیەکی گشتی هەست وبیریان خستبووە سەر یەك لایەنی فیکری:

- ئایا حاکم دەبێ چۆن بێت؟
- ئایا ئەتینای (دیمۆکرات) باشترە یان سپارتای (ئۆلیگارکی)؟
- بۆچی حاکمێکی باشمان نەبوو رزگارمان بکات؟
- بۆچی فارس سەرکردەکانیان باشن کەچی سەرکردەکانی ئێمە هەموو خۆفرۆشن؟

جۆرەها تەفسیر و پینەیان دەدۆزیەوە بەڵام کەسیان باسی ئەوەی نەدەکرد کەوا دەردی ڕاستەقینەیان نەبوونی هەستی نەتەوایەتی بوو. بەڵێ لە بەرانبەر بێگانەدا (بۆنموونە فارس) نەتەوایەتیان بەبیر دەهاتەوە و تا ماوەیەك یەکگرتوو دەبوون، بەڵام هەر هەندە بێگانە نەدەما یەکسەر شارچەتی و ناوچەگەری و لەهجەبازی هەڵیان دەدایەوە تا لە ٣٦٩پ.ز (واتە ٤٠ ساڵێك پاش ڕووداوەکەی زینۆفۆن) کەوتنە دەست مەکەدۆنیەکان. ئیتر لەوساوە تا ساڵی ١٨٢٠ی (ساڵی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی یۆنان کە بە یارمەتی بەریتانیا و فەرەنسا هاتە دی) زاینی گریك هەر بە داگیرکراوی ژیاون، واتە بۆ ماوەی ٢٢ سەدە ملکەچ کران!

شایانی گوتنە کە ڕەوشتی مەکەدۆنیەکان زۆر لە یۆنانیەکان باشتر نەبوون و هەر کە لەسکەندەر مرد، یەکسەر کوڕەکەیان کوشت و تێك بەربوون و میراتە گەورەکەیان کرد بە سێ پارچە. پاش ماوەیەك هێزێکی نوێ لە خۆرئاوا پەیدابوو (ڕۆم). ئەوسا زۆربەی شارە یۆنانیەکان لە ڕۆم پاڕانەوە بۆ وەدەرنانی مەکەدۆنیەکان. باشە، ئەمەش ڕووی دا و مەکەدۆنی بەرپەرچ درانەوە کەچی هەندەی نەبرد کەوتنە نێو یەك و لە یۆناندا دوو بەرە پەیدابوو (بەرەی ئیتۆلی و بەرەی ئاخایی) کەوا هەرکەس بەلایەك ڕایدەکێشا. تەنانەت زۆر جار ڕۆم دەهاتن ناوبژی

لەنێوان خودی یۆنانیەکاندا بکەن. ئیدی رۆم بوونە زلهێز کەچی یۆنانی رۆژ بەرۆژ بەرەو لەنێوبوون مالئاوێرانی رۆیشتن.

## فارس و رۆم

ئەم سەرگوزەشتەی پێشوو دیاری دەخات کە جیاوازیەکی بنەرەتی هەبووە لەنێوان یۆنانی و فارس، هەروەها لەنێوان یۆنانی و رۆم. وەك دیتمان، یۆنانی هەمیشە خەریکی خۆبەخۆیی فیتنەبازی دەبوون، کەچی فارس (و دواتر رۆم) هەمیشە یەکگرتوو بوون. بۆیە دواتر رۆم بوون بە گەورەترین زلهێزی جیهان و هەر ئەوان بەرانبەر فارس وەستان تا جیهانی کۆنیان دابەش کرد. ئێمەی کوردیش هەمیشە لەنێوان زلهێزەکانی فارس و رۆم ژیاوین و ئەم راستیەمان کردۆتە بیانگەیەك بۆ چاوپۆشی کردن لە کەموکوریەکانی ناوەخۆ. بەلام دەبێ بزانین کە زلهێز لە هیچەوە پەیدا نابن. خۆ یۆنانی سەدان سال پێش فارس و رۆم شار و شارستانەتیان هەبوو واش هەر نەبوون بە زلهێز. بۆیە دەبێ بپرسین ئایا بۆچی تەنیا فارس و رۆم بوون بە زلهێز؟

وەلامەکە بە رای من ئەوەیە کە فارس و رۆم خەلکێکی نەتەوەیی بوون، خەلکێك بوون رقیان لە ناوچەگەری دەبۆوە. بەداخەوە کورد ئەم بیرۆکەیە بە ئاسانی هەزم ناکات هەروەکو کە یۆنانیەکانیش ئەم بیرۆکەیان هەزم نەکرد. خۆ ئەگەر لە کاتی خۆیدا، بۆنموونە کە زینۆفۆن و هاورێکانی لە بیزەنتیۆم دەرکران، ئەگەر بە زینۆفۆن و بە ئەفسەرە سپارتیەکانت گوتبایە: برام، واز لە شار و لەهجە و ئەم قسانە بێنن و دەست پێبکەن ئەم شارۆچکەی بیزەنتیۆم (ئەستەنبول) بکەن بە پایتەختی هەمووتان و هەول بدەن زمانێکی گشتی تێدا پێرەو بکەن دەنا تا ٢٠٠٠ سال داگیر دەکرێن. ئەگەر ئەوهات گوتبایە گومانم نیە کە ئەو شارپەرستانە یان ئەوەتا دەیانکوشتی، یان هیچ نەبێ تەهمیش دەکرایت، تەهمیشێکی هەرێمانەی کوردانە.

محمد مسعود محمد
هەولێر
بەهاری ٢٠١٢

# پێڕست


| | | |
|---|---|---|
| | پێشەکیەکەی رێکس وارنەر | ٥ |
| بابەتی یەکەم | | ١٣ |
| چاپتەر ١ | هەوڵەکەی کۆڕووش | ١٥ |
| چاپتەر ٢ | لە ساردیس بۆ تەرسووس | ١٩ |
| چاپتەر ٣ | کلێرخۆس هەڵگەڕانەوەیەك دادەمرکێنێتەوە | ٢٤ |
| چاپتەر ٤ | لە دەروازەی سووریا بە درێژایی فورات | ٢٨ |
| چاپتەر ٥ | بیابانی عەرەبی، شەڕێك لەنێوان مێنۆن و کلیرخۆس | ٣٢ |
| چاپتەر ٦ | کۆڕووش خائینێك دەگرێت | ٣٦ |
| چاپتەر ٧ | کۆڕووش بۆ شەڕ ساز دەبێ بەڵام شا دەکشێتەوە | ٣٨ |
| چاپتەر ٨ | شەڕەکەی کوناکسا و مەرگی کۆڕووش | ٤١ |
| چاپتەر ٩ | پاش شەڕەکە | ٤٦ |
| بابەتی دووەم | یۆنانییەکان دادەبڕێن | ٤٩ |
| چاپتەر ١ | نامەبەری شا | ٥١ |
| چاپتەر ٢ | یۆنانی بە ئاریا رادەگەنەوە. | ٥٥ |
| چاپتەر ٣ | یۆنانی رێککەوتننامە لەگەڵ تیزافەرنە مۆر دەکەن | ٥٨ |
| چاپتەر ٤ | رێپێوانێکی گوماناوی | ٦٢ |
| چاپتەر ٥ | خیانەتی ت [illegible] | ٦٦ |
| چاپتەر ٦ | کەسایەتیی پێنج بەنەراڵەکە | ٧١ |
| بابەتی سێیەم | رێپێوان بەرەو کوردستان | ٧٧ |
| چاپتەر ١ | زینۆفۆن دەستپێشخەری دەکات | ٧٩ |
| چاپتەر ٢ | ئەنجومەنی جەنگ | ٨٧ |
| چاپتەر ٣ | لە ژێر تیربارانذا | ٩٤ |
| چاپتەر ٤ | تیزافەرنە راویان دەنێت | ٩٧ |
| چاپتەر ٤ | لەنێوان دیجلە و چیاکاندا | ١٠٣ |
| بابەتی چوارەم | رێپێوان بەرەو دەریا | ١٠٧ |

| چاپتەر ١ | بەرەو کوردستان | ١٠٩ |
|---|---|---|
| چاپتەر ٢ | شەڕ لە چیادا | ١١٣ |
| چاپتەر ٣ | پەڕینەوە بۆ ئەرمینیا | ١١٧ |
| چاپتەر ٤ | ئۆردوگای ئیرباز گەمارۆ دەدەن | ١٢١ |
| چاپتەر ٥ | گەشتی نێو بەفر | ١٢٤ |
| چاپتەر ٦ | بە مانۆڕێك ڕێگایەك دەگرن | ١٢٨ |
| چاپتەر ٧ | چاویان بە دەریا کەت | ١٣٢ |
| بابەتی پێنجەم | بەرەو پافلاگۆنیا | ١٣٨ |
| چاپتەر ١ | خیریسۆفۆس کەشتیی پەیدا دەکات | ١٤١ |
| چاپتەر ٢ | هەڵمەتێك بۆ راوەڕوت | ١٤٣ |
| چاپتەر ٣ | یۆنانییەکان گەیشتنە ترابەزۆس | ١٤٦ |
| چاپتەر ٤ | مۆسینۆیکییە دڕندەکان | ١٥٠ |
| چاپتەر ٥ | زینۆفۆن لەبری لەشکرەکە دەدوێت | ١٥١ |
| چاپتەر ٦ | زینۆفۆن شارێك دەدۆزێتەوە | ١٥٥ |
| چاپتەر ٧ | زینۆفۆن بەرگری لەخۆی دەکات | ١٥٨ |
| چاپتەر ٨ | لە تەنگانەدا دەبێ هەموو پابەند بین | ١٦٤ |
| بابەتی شەشەم | ڕێپێوان بەرەو بۆسفۆر | ١٦٩ |
| چاپتەر ١ | زینۆفۆن پایەی سەرلەشکر ڕەت دەکاتەوە | ١٧٣ |
| چاپتەر ٢ | لەشکر دەبێتە سێ بەش | ١٧٥ |
| چاپتەر ٣ | زینۆفۆن ئەرکادیەکان ڕزگار دەکات لەشکر دەبێتەوە یەك | ١٨٠ |
| چاپتەر ٤ | ئاڵۆزی لە پەیداکردنی خۆراکدا | ١٨٣ |
| چاپتەر ٥ | سەرکەوتنێك بۆ یۆنانیەکان | ١٨٦ |
| چاپتەر ٦ | هەندێك ئاڵۆزی لەگەڵ سپارتیەکان | ١٩٠ |
| بابەتی هەفتەم | بیزەنتیۆم تراکیا ئاسیای بچووك | ١٩٤ |
| چاپتەر ١ | ئاڵۆزی لە بیزەنتیۆم | ١٩٩ |
| چاپتەر ٢ | گفتوگۆ لەگەڵ سیووتیس | ٢٠١ |
| چاپتەر ٣ | هەڵمەتێك لەگەڵ سیووتیس | ٢٠٦ |
| چاپتەر ٤ | هەڵمەتێك لەگەڵ سیووتیس | ٢١١ |

| چاپتەر ٥ | کێشە لەسەر مووچە | ٢١٨ |
| --- | --- | --- |
| چاپتەر ٦ | زینۆفۆن پەلامار دەدرێت و لەسەر خۆی دەکاتەوە | ٢٢١ |
| چاپتەر ٧ | زینۆفۆن قسە لەگەڵ سیووتیس دەکات | ٢٢٣ |
| چاپتەر ٨ | زینۆفۆن لەشکر بەجێ دەهێڵێت | ٢٢٩ |
| | ملکی زینۆفۆن لە رۆژانی درەنگدا | ٢٣٥ |
| | کەسایەتیی کۆرووش | ٢٣٨ |
| بەشی کۆتایی | | ٢٤٠ |
| | تێبینییەکانی وەرگێڕ | ٢٤٥ |
| | من و زینۆفۆن | ٢٤٧ |
| | زینۆفۆن و کاردۆخیەکان | ٢٤٧ |
| | شارپەرستی | ٢٤٩ |
| | شەڕ و مەیدان | ٢٥٣ |
| | شار و هۆز | ٢٥٤ |
| | فارس و رۆم | ٢٥٧ |

زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی ٢٠١٢ی وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان

بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | بابەت | نرخ | لاپەڕە |
|---|---|---|---|---|---|
| ٦٦٨ | گەڵای پاییز | عەبدولقادر عەلی مەردان | بیرەوەری | ٥٠٠٠ | ٤٠٠ |
| ٦٦٩ | گەنج گۆمی سیاسەت دەشڵەقێنێ | ئومێد خۆشناو | گشتی | ٣٠٠٠ | ١٤٤ |
| ٦٧٠ | دوران های زبان کردی و مجموعە زبان های ایرانی | و. مستەفا ئیلخانی زادە | زمان | ٣٠٠٠ | ١٤٤ |
| ٦٧١ | خلاصە تاریخ کردستان | احمد قاضي | مێژوو | ٥٠٠٠ | ٤٤٨ |
| ٦٧٢ | بزەی شۆڕش (دیوانی شیعری مامۆستا ڕاوچی) | کۆکردنەوەی کاوەی کوڕی مامۆستا ڕاوچی | شیعر | ٣٠٠٠ | ٢٨٠ |
| ٦٧٣ | کاتێك ئەزموونەکان دەدوێن | و.کەریم سۆفی | ئەدەب | ١٥٠٠ | ١٢٨ |
| ٦٧٤ | سیڤییەکان٢ | شێرزاد هەینی | گشتی | ٢٠٠٠ | ٢٥٦ |
| ٦٧٥ | مەرگی وەنەوشە | یاسین قادر بەرزنجی | چیرۆکە هەواڵ | ٤٠٠٠ | ٤٣٢ |
| ٦٧٦ | گەمەی مێشك | ئا: رەمزی مەلا مارف | زانیاری | ٧٠٠٠ | ٣٤٤ |
| ٦٧٧ | پیاوی ئەشکەوت دڵێکی هەبوو | شێرکۆ هەورامی | شیعر | ٣٠٠٠ | ٣٣٢ |
| ٦٧٨ | گەردوون ناسی لەبەر سێبەری قورئان و زانست | غەریب عەلی عەزیز | زانستی | ٣٠٠٠ | ١٧٦ |
| ٦٧٩ | گەشتەکەی زینۆفۆن | محمد مسعود محمد | مێژوو | ٣٠٠٠ | ٢٦٤ |

